# دەستەی ڕاوێژکاران

پ. د. کەمال مەزهەر

پ. د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

د. فاروق عومەر سدیق

د. سوهەیلە حەمید مەجید

سەرنووسەر

پ. د. محەمەد مەعرووف

جێگری سەرنووسەر

پ. د. جەبار قادر

بەڕێوەبەری نووسین

کەمال غەمبار

دەستەی نووسەران

د. ئازاد ئەحمەد مەحموود

د. سەباح ڕەشید

د. ڤیان سلێمان حاجی

د. هۆشەنگ فاروق

# فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان

لێژنەی مێژوو

**پێشەکی :**

دوای بڵاوکردنەوەی بەشی یەکەمی زاراوە مێژووییەکان لە ژمارەی پێشووی گۆڤاری ئەکادیمی، وا بەشی دووەمی ئەو زاراوانە بڵاودەکەینەوە. ئەم زاراوانە بەرهەمی کاری لێژنەی مێژووە لە ئەکادیمیای کوردی.

بەشی دووەم ئەو زاراوە مێژووییانە دەگرێتە خۆ کە بە پیتەکانی ت، ج، چ، ح و خ دەستپێدەکەن. لە ژمارەکانی داهاتووشدا بەردەوام دەبین لە بڵاوکردنەوەی زاراوەکانی تر بە گوێرەی ریزبەندیی پیتەکان .

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە زاراوەکان لێرەدا هەر بەو شێوازە نووسراونەتەوە کە لە سەردەمە مێژووییەکاندا بەکارهێنراون، کردنیان بە کوردیی ئەورۆ مەبەستەکەمان لە دانانی ئەم فەرهەنگە ناپێکێ، کە یارمەتیدانی خوێنەران و شارەزایانی بواری مێژووە لە تێگەیشتنی دەقە مێژووییەکان بە تایبەتی ئەوانەی سەدەکانی نێوەڕاست و سەردەمی عوسمانی.

لێرەشدا ئەوە دووبارە دەکەینەوە، کە پێشوازی لە هەموو تێبینی و بۆچوون و رەخنەیەك دەکەین لە بارەی ئەم کارەوە بۆ باشترکردن و راستکردنەوەی هەر هەڵەیەك کە بە سەرماندا تێپەڕیبێ .

**سەرۆکی لێژنەی مێژوو**
**لە ئەکادیمیای کوردی**
**پ. د. جەبار قادر**

## بەشی دووەم

### پیتی – ت -

**تاسومە (تورکی):**

جۆرە پێڵاوێك بوو لە پێستە دروست دەکرا و بە ڕەنگی سوور بۆیە دەکرا.

**تافتە (فارسی):**

بە جۆرێك قوماشی بریقەدار دەگوترا کە لە ئاوریشم چنرابوو.

**تبان (فارسی):**

جلوبەرگی لە پێستە دروستکراو ، هەروەها بە جلوبەرگی دەریاوانەکان دەوترا (بۆ پاراستنیان لە ئاو).

**تبلیغ نامە (عەرەبی – فارسی):**

بە بڵاوکراوە یان ڕاگەیاندنی فەرمی سەردەمی عوسمانی دەگوترا.

**تتار (مەغۆلی):**

ناوی هەندێك هۆزی مەغۆلی بوو کە لە ئاسیای ناوەڕاست دەژیان و عوسمانییەکان ئەم زاراوەیان بۆ نامەبەرەکانیان بەکاردەهێنا .

**تتار آغاسی (مەغۆلی - تورکی):**

عوسمانییەکان بە سەرۆکی نامەبەرەکانیان دەوت.

**تتریك (عەرەبی) :**

بە تورك کردن، سیاسەتێك بوو لەلایەن ئیتیحادییەکان دژ بە نەتەوە ناتورکەکان پەیڕەو کرا لەسەردەمی عوسمانی، هەروەها لە تورکیای هاوچەرخیشدا لەلایەن حکومەتی تورکیای کەمالی پیادە کرا.

**تتریە :**

جۆرەکەوایەك بوو بە گومەز دەچوو لە سەر شێوازی تەتەری دوورابوو.

**التجريدة (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بە تیپێکی سوارە دەگوترا کە بێ پیادە بوون بەو پەڕی خێرایی ئامادە دەکرا بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی هێرشێك یان دامرکاندنەوەی ئاشووبێك.

**التجريس (عەرەبی):**

بەوە دەگوترا کە تاوانبار بەناو شار یان شارۆچکەدا بگێڕێندرێ و زەنگوڵی بە ملەوە بکرێ بۆ ئەوەی خەڵك لێی کۆ ببنەوە ئینجا لە کۆتاییدا بە قامچی لێی بدرێ یان هەر سزایەك بدرێ.

**تجريم (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەوە بەکاردەهات کە بڕێك پارە وەك پێ بژاردن لە کەسێك وەرگیرابا لەبری تاوان یان پێشێلکارییەك کە ئەنجامی دابوو.

**التحكيم (عەرەبی):**

ناوبژیوانی

**تحصيلدار (عەرەبی - فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە باج کۆکەرەوە دەوترا هەروەها بە بنەماڵەیەکی شام دەگوترا.

**تحفظ خانه (عەرەبی - فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەکارهات بۆ هێشتنەوەی کەسێك و پاراستنی لە تێکەڵاوبوونی خەڵکی لەبەر هۆکاری تەندروستی.

**تخت (فارسی):**

تەخت، کورسی شا، ئەو شوێنەیە کە شا لە کەژاوەکان لەسەری دادەنیشت بەمەش لە سەرووی هەموو ئەوانەی تر بەدیار دەکەوت.

**تخت المملكة (فارسی - عەرەبی):**

لە ڕووی زاراوەییەوە بە پایتەختی دەوڵەت دەوترا.

**تختروان (فارسی):**

تەختی گەڕۆك، بریتی بوو لە کورسیەك لە سەر تەختێکی چوار دەسك قایم کرابوو، کەسێکی دەوڵەمەند یان پایە بەرز لەسەری دادەنیشت و بە چوارکەس هەڵدەگیرا .

**التخفیفة (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بە مێزەرێکی سووك دەوترا کە بە خێرایی دەبەسترا.

**التذکرة (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوکی بەکاردەهات وەکو گوزارشت لە نووسراوێك کە لەلایەن سوڵتان دەردەچوو بۆ نوێنەرەکانی لە هەرێمەکان بۆ بە بیرهێنانەوەیان بەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە. هەرچی لە سەردەمی عوسمانی بوو ئەوا گوزارشت بوو لە نووسراوێك لە لایەن پاشاوە دەنێردرا بۆ پایتەخت تیایدا کەسێکی دەپاڵاوت بۆوەی تیمارێکی لە لایەن سوڵتانەوە پێ بدرێ.

**تذکرةجی (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەو کەسە دەوترا کە نووسینی "تذکرة"ی پێ سپێردرا بوو.

**تذکرة سز (عەرەبی - تورکی):**

بەبێ، زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەو تیمارە دەوترا کە پێویستی بە تەزکەرە نەبوو.

**تربەدار (عەرەبی – فارسی):**

بە مجێوری مەرقەد دەوترا.

**ترتیبات قلیوسی (عەرەبی . تورکی):**

زاراوەیەکی عوسمانی بەو کۆمەڵە ڕێوشوێنە پێویستانەی پێش شەڕ دەوترا.

**ترجُمان باشی (فارسی - تورکی):**

سەرۆکی وەرگێڕان لە دیوانی دەوڵەتی عوسمانی ناسراو بە دیوان همایون.

**ترسانە (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە خانەی دروستکردنی کەشتی و جێگای بەڕێوەبردنی کاروباری دەریایی دەوترا.

**ترسانە أمینی (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە فەرمانبەرێك دەوترا کە ئەرکی بریتی بوو لە سەرپەرشتی کردنی دروستکردن و چاککردنەوە و چەکدارکردنی کەشتییەکان.

**تراث (عەرەبی):**

کەلەپوور، ئەو شتانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ باب و باپیران.

**ترسانە بوغازی (عەرەبی - تورکی):**

ڕێڕەوێکی ئاوی بەرتەسك بوو کە خانەی دروستکردنی کەشتی عوسمانی لە خۆ دەگرت.

**التراتیل (عەرەبی):**

سروودی ئاینی.

**ترسانە رئیسی (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە فەرمانبەرێك دەگوترا کە لەڕووی ئیدارییەوە ئەرکەکەی بریتی بوو لە پاراستنی تۆمارەکان لە دەریاوانی عوسمانی.

**الترابی (عەرەبی):**

بەو منداڵانە دەگوترا کە بەدیل گیرابوون و دواتر پێگەیەنرابوون.

**الترسیم (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك باو بوو گوزارشت بوو لە هێشتنەوەی زۆرەملێی کەسێك لە شوێنێکی دیاریکراو.

**ترکبولی (تورکی - لاتینی):**

لە سەردەمی ئەیووبی بەجۆرێك لە سەربازان دەوترا کە لە خزمەتی فەرەنگییەکان بوون، باوکەکانیان تورك یان عارەب بوون و دایکەکانیان فەرەنگی بوون.

**تزك (مەغۆلی):**

فەرمان، یاسا، مەبەست لێی دەستوور و فەرمانەکانی سوڵتانییە.

**التسمير (عەرەبی):**

شێوازێك لە شێوازەکانی لەسێدارەدانە لە سەردەمی مەملوکی، ئەویش ئەوەیە کە فەرمان بەسەردراوەکە لەسەر دار لەخاچ بدرێ و بە بزمار چوارپەلی لەسەر دارەکە بکوترێ، بەم شێوەیە بمێنێتەوە تا دەمرێ.

**تشريح خانه (عەرەبی - فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بە نەخۆشخانەی نەشتەرگەری دەوترا.

**تشريف (عەرەبی):**

ئەو جلوبەرگانەیە کە لە سوڵتانی مەملوکییەوە دەکرا بە دیاری بۆ میرەکان لە بۆنە تایبەتییەکاندا.

**تصديق (عەرەبی):**

پەسندکردن.

**تشريف خليقتى (عەرەبی):**

جلوبەرگێکە خەلیفە لەبەر ئەو کەسەی دەکا لە رەعیەتەکانی کە خۆی دەیەوێت، یان بۆ ئەوکەسەی کارێکی پێ دەسپێرێت.

**تشريفاتجى (عەرەبی - تورکی):**

ئەم وەزیفەیە بەشێك لە ئیدارەی دارایی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، ئینجا لە دواییدا چووە سەر باب العالی.

**- التصقيع (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك باو بوو بۆ کردەوەی ئامادەکردنی خانوو بیناکان بەکاردەهات بە مەبەستی سەپاندنی باج بەسەریان.

**تضخم (عەرەبی):**

هەڵاوسانی دراوی ، دابەزینی بەها و نرخی دراو لەبازاڕدا.

**التطغير (بە عارەبی کراوە):**

مۆرکردن بەمۆری شا یان سوڵتان.

**التعايش السلمي الفعال (عەرەبی):**

پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی کاریگەر، ئاڕاستەیەکی سیاسەتی نێودەوڵەتی بوو (تیتۆ)ی سەرۆکی یوگسلاڤیا دوای هاتنە دەرەوەی لە گڵۆتی ڕۆژهەلات لەساڵی ١٩٤٨ ڕایگەیاند. ئەمەش سیاسەتێکی بێ لایەنخوازانە بوو کە ناوبراو لەهەمبەر جەنگی سارد لەنێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا پەیڕەوی کرد. بۆیە ناوبراو دواتر بوو بەیەکێك لە بناغە دانەرانی بزاڤی بێ لایەنخوازی.

**تعتيب الجدران (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەکار دەهات بۆ ڕووخاندنی دیوارەکانی قەلاکان بەمەبەستی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی.

**تعليم خانه (عەرەبی - فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات بۆ قوتابخانە یان سەنتەری مەشق پێکردنی هەر ئۆرتەیەك.

**تفەنگەچی (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ دروستکەر و چاککەرەوەی تفەنگ بەکاردەهات. هەروەها بەیەکێك لە سەربازەکانی تیپی تفەنگ هەڵگرەکانیش دەوترا.

**تفنگەجی باشی (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات بۆ سەرکردەی تیپی تفەنگ هەڵگرەکان، لە ئەرکەکانیش سەرکردایەتی کردنی پۆلیس بوو لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستانبول )دا.

**التقادم (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات بۆ شەش ئەسپ بە تەواوی زین کرابوون، میری فەرمانڕەوا لە جبل الدروز بۆ والی عوسمانی دەناردن، ئەمەش لەکاتی نوێکردنەوەی ئیلتیزامدا.

**التقاليد (عەرەبی):**

ئـەو مەرسـومە بـوو کـە خەلیفـە یـان پاشـاو سـوڵتانەکان دەریانـدەکرد بـۆ دامەزرانـدنی گـەورە فەرمانبـەرانی دەوڵـەتی وەکـو قـازی و نوێنـەرەکان لـە هەرێمەکاندا، هەروەها لەزمانی عەرەبی بۆ داب و نەریتیش بەکاردێت.

**التقاوي المخلدة (عەرەبی):**

ئـەو بەروبوومـە پارێزراوەیـە بـۆ چـاندنی زەوی کـە لـە وەرزی داهـاتوودا بەکاردەهێنرێت.

**الثقنيه (عەرەبی):**

جێگایەکی بانگدانی بچووك بوو لە دار دروسـتکرابوو جێگاکـەی لـە مزگـەوت لـە نزیك قیبلە بـوو، لـە تەنیـشت جێگـای بانگـدانی گـەورەبوو، لـە جێگـای بانگـدانی یەکەمـدا بانگـدەر بـۆ کـارێکی ئاسـایی خـەڵکی بـانگ دەکـرد، هەرچـی بانگـدانی نوێژکردن بوو ئەوە لە جێگای بانگدانی گەورە ئەنجام دەدرا.

**التقويم (عەرەبی):**

ئەم زاراوەیە لە سەردەمی مەملوکی بەکاردەهات بۆ کاری ئامارکردن. ئێـستاش لەزمانی عەرەبی بۆ ساڵنامە و هەروەها هەڵسەنگاندنیش بەکاردێت.

**التقويم الرومي او المالي (عەرەبی):**

ئەو تەقویمە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٧٩٠ز)ـەوە پـەیڕەوی کـرد، کاتێ تەقویمی کۆچی کردە تەقویمی خۆری (شمسي) بۆ ئـەوەی باجـەکان هـەموو ساڵێك لەکاتێکی دیاریکراودا وەربگیرێـن. جیـاوازی لـەنێوان سـاڵی ڕۆمـی و زایـنی (٥٨٤) ساڵە.

**تكايا (عەرەبی):**

لە تەکیە هاتووە، جێگای کۆبوونـەوەی سـۆفییەکان بـۆ زیکـر کـردن، هـەروەها شوێنی دابەشکردنی خـواردن بـوو بەسـەر هەژارانـدا، و مانـەوەی ڕێبـواران تیایـدا بەشێوەیەکی کاتی.

**تکحیل (عەرەبی):**

لە جۆرەکانی ئەشکەنجەدان بوو لە سەردەمی مەملوکیدا، بریتی بوو لەوەی شیشێکی سوورکراوە بە ئاگر لە چاوی ئەو کەسە ڕادەکرا کە دەویسترا کوێر بکرێ.

**تلخیص (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە نووسراوێك دەوترا کە گرنگترین ئەو مەسەلانەی لەسەر کورت کرابووەوە کە دەخرایە بەردەم سوڵتان و سەدری ئەعزەم و شێخ الاسلام.

**تلخیصجی (عەرەبی - تورکی):**

بە فەرمانبەرێك دەوترا کە ئەرکی بریتی بوو لە ئامادەکردنی کورتکراوەکان و بردنی بۆ کۆشك بۆ ئەوەی بدرێتە دەست گەورەی غولامان، لە گەورە فەرمانبەرانی دیوانی سەدری ئەعزەم بوو پایەیەکی گرنگی لە نێوەندە فەرمییەکاندا هەبوو.

**تمَسُك (عەرەبی):**

لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی بە قەواڵەیەك دەوترا کە موڵکداری یان قەرزارێك یان بارمتەکردنێك یان شتێکی لەم جۆرە بسەلمێنێ.

**تمغة (مەغۆلی):**

واژوو، مۆر ، هەروەها زاراوەکە بۆ جۆرێك لە باجیش بەکاردەهات .

**تنظیمات (عەرەبی):**

مەبەست لێی ئەو چاکسازییانەیە کە لە کاروباری بەڕێوەبردن و دەزگاکانی فەرمانڕەوایی عوسمانی ئەنجام درا، لە سەرەتای سەردەمی سوڵتان عبدالمجید (١٨٣٩ – ١٨٦١) ڕا ئەم زاراوەیە بۆ چاکسازییەکان بەکارهێنرا لە هەموو سەرچاوە مێژووییەکان هەمان زاراوە واتا (تنظیمات ) وەکو خۆی بەکارهێنراوە.

**تنكز: تنكيز (توركی):**

دەریا ، ناوی هەندێك لە میرەکانی مەمالیك بوو.

**التوزيعية (عەرەبی):**

بەو شمەکانە دەوترا کە والی بە سەر ڕەعیەتەکانی ویلایەتەکەی دابەش دەکرد و بەسەری دەسەپاند کە بە نرخێکی دیاریکراو بیکڕن، زۆر جار ئەو نرخە لە نرخی بازاڕ گرانتر بوو هەروەها شمەکەکان زۆر جار خراپ بوون.

**التوسط، التوسيط (عەرەبی):**

لەتکردن، جۆرێك لە جۆرەکانی لەناوبردن بوو لە سەردەمی مەملوکی، بریتی بوو لەوەی فرمان لەسەر دراو لەسەر تەختە دارێك درێژ دەکرا و بە شمشێر بەجۆرێك لە خوار ناوکی دەدرا کە جەستەکەی بکا بە دوو لەت.

**توقماق (توركی):**

چەکوچ، ناوی چەندین میری مەمالیك بوو.

**التوقيع (عەرەبی):**

واژوو یان نیشانەیەکی هاوتای واژووی فەرمانڕەوایانی سولّتان بوو بە شێوەیەکی گشتی بە مانای فەرمان دێت.

**التوقيعی (عەرەبی):**

واژۆچی ، پلەوپایەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی و هەندێ لە سەردەمانی پێشوو بەتایبەتی (ئاق قوینلو ) کە ئەرکەکەی بریتی بوو لەدانانی مۆری تایبەتی سولّتان لەسەر نووسراوە فەرمییە سولّتانییەکان ، وەك سکرتێری تایبەت یان بەرپرسی ئوفیسی ئێستا وابوو ، لە هەندێك سەردەمەکانی دواتردا (نیشانچی ) و (میهردار) ی پێدەگوترا .

**تومان (مەغۆلی):**

دە هەزار.

**تیرکش (فارسی)**

جۆرێك یان توورەکەی تیری سەرباز.

**تیسیق (بە عەرەبی کراو):**

دەست بەسەر داگرتنی موڵك و ماڵ.

**تیغدار (فارسی):**

لە زاراوەکانی سەردەمی مەمالیکە بە مانای شمشێر بەدەست.

**تیمار (فارسی):**

بچووکترین یەکەی دەرەبەگایەتی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی کە پێکهاتبوو لە پارچە زەوییەك کە داهاتی ساڵانەی ٣–١٩,٩٩٩هەزار ئاقچە واتە کەمتر لە ٢٠,٠٠٠ ئاقچە بوو .

**تیول (تورکی):**

موڵکداری، جۆرێك بوو لە زەوی دەرەبەگی لەدەوڵەتی سەفەوی.

## پیتی - ج ، چ-

**جاثلیق:**

سەرکردەی مەسیحیان لە جیهانی ئیسلامی.

**جاجرت، چاکرت (فارسی – کوردی):**

شاگرد.

**چاذر (فارسی):**

چادر، خیوەت، لەوانەیە بەشێوەی شادر بێت.

**چاذر میهتری باشی (فارسی - تورکی):**

واتە سەرۆکی بەرپرسانی دامەزراندنی خیوەت و گرنگی پێدانیان.

**چاروخ (تورکی):**

بە جۆرێك لە پێڵاوی جوتیاران دەگوترا .

**چاشنگیر (فارسی):**

تام کەر، ئەو کەسە بوو پێش سوڵتان خواردن و خواردنەوەی تام دەکرد لەترسی ئەوەی نەبادا ژەهری تێکرابێت.

**چاقیرباشی (فارسی- تورکی):**

بە گەورەی بازەوانان و مەشق پێکەرانی دەوترێت. هەروەها یەکێك لە ئەفسەرانی خزمەتی دەرەکی بوو لەلای سوڵتانەکانی عوسمانی.

**چالیش:**

سەرەتای سوپا.

**جامکی، جامکیە (فارسی):**

مەبەست لێی مووچەی سەربازان و ئەو خواردن و جلوبەرگەی لە کاتی دیاریکراو پێیان دەدرا.

**جانباز (فارسی):**

گیان فیداکار، تیپێکی چاونەترسی گیان فیداکار بوو لە سەربازە عوسمانییەکان.

**جانبلاط (جان بولاد) (فارسی):**

گیان پۆلا، نازناوی بنەماڵەیەکی سیاسی گەورەیە لە لوبنان، کەلە ڕەچەڵەکدا کوردن و بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی فەرمانڕەوایانی (کلیس) کە لە شەرەفنامەو سەرچاوە ڕەسەنەکانی مێژووی نوێدا ناویان هاتووە و بەناوبانگترینیان میر (عەلی کوڕی جانپولا )یە کە لەسەرەتای سەدەی حەڤدەیەم ڕاپەڕینێکی دژی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکانی باکوری حەڵەب بەرپا کرد .

**جانبیە (فارسی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی وەکو نازناوێکی ڕێزلێنان بەکارهاتووە بەمانای جەنابی بەگ.

**جاندار (فارسی):**

لە سەردەمی مەمالیك بە پاسەوانانی سوڵتان دەوترا، میرێك سەرکردایەتی دەکردن پێی دەوترا (میر جاندار).

**جاه (فارسی):**

پایە ، خاوەن پایەیەکی بەرز و بەڕێز، خودان پێگە.

**چاو (مەغۆلی):**

ئەو دراوانە بوو لەسەر پێستە لێدەدران بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لە سەردەمی مەغۆلدا باو بوو.

**چاوش (تورکی) :**

نێردراوی دەربار بوو بۆ ویلایەتەکان بۆ گواستنەوە و جێبەجێکردنی فەرمانەکان لەسەردەمی عوسمانی.

**چاوش باشی (تورکی):**

سەرۆکی چاوشەکانی دەربار بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**چاویش (تورکی):**

لە سەردەمی ئەیووبی بەو کۆمەڵە سەربازە دەوترا کە ئەرکیان کۆکردنەوە و هاندانی سەربازان بوو لە کاتی شەڕدا. لە سەردەمی مەمالیك و عوسمانیدا ئەرکی جیاوازیان هەبووە.

**چاویش باشی (تورکی):**

سەرۆك و سەرکردەی چاویشەکان و سەرۆکی گشتی مەشقە سەربازییەکان بوو. یەکێك لە ئەفسەرانی خزمەت لە لای سوڵتان بوو، و فەرمانبەرێکی ئیداری بوو لە دیوانی دەوڵەت، لە ڕووی پایەوە لە دوای وەزیر دەهات.

**چاویش العلماء (تورکی - عەرەبی):**

زانایەك بوو لە شەریعەتی ئیسلامی ئەڵقەی پەیوەندیکردن بوو لە نێوان قازی و زانا تایبەتییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

**چیلاق (تورکی):**

دەستەیەك سەرباز بوون لـە سـەردەمی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە لایـەن (حـسێن پاشا جبلاق) دامەزرابوو، سەر بە دەریاوانی بوون.

**جبلجی (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە بەرد شکێنی چیاکان دەگـوترا کـە لـەویَ بـەردیان هەڵدەکەند.

**جبەچی (مەغۆلی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە دروستکەری چەك و تەقەمەنی دەوترا.

**جبەچی باشی (تورکی):**

سەرۆکی گروپی چەکسازان بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**جبەخانە (مەغۆلی - فارسی):**

کۆگای چەك و تەقەمەنی.

**جَتەلی (مەغۆلی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەو سەربازە چەکدارە دەوترا کە لە گۆڕەپانەکانی شەڕ و خەندەقـەکان خزمـەتی دەکـرد و ئـەو خۆڵـەی دەگوازتـەوە کـە ئینکـشارییەکان هەڵیان دەکەند.

**چتال قلفت (تورکی):**

کڵاوێکی درێژ بوو عەسعەس باشـی لـە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـەری دەکـرد، ڕەنگی سەوز بوو.

**جَدِك (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە جیاوکێك دەگـوترا بـە دەرەبـەگ یـان بازرگـان یـان پیـــشەکارێك دەدرا بـــۆ پـــاوانکردنی زەوییـــەك یـــان کاڵایـــەکی دیـــاریکراو یـــان دروستکردنی شمەکێکی دیاریکراو. دواتر بە مۆڵەتی بازاڕگە یان کارگە گوترا.

**چراغ، چراغية (فارسی):**

چرا، تیپێکی سەربازی بوو لە میسر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانی دامەزرا.

**الجَراوة (عەرەبی):**

پارچە قوماشێکە شمەکی تیادا دادەنرێت.

**الجرائحية (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیك بە پزیشکە نەشتەرکارەکان دەگوترا.

**جرخية (فارسی):**

گالیسکە، زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بە نەوت هاوێژان دەوترا، لەوانەیە ئەمەش لەوەوە هاتبێ کە نەوت لەسەر گالیسکە دادەنرا.

**جَردة (عەرەبی):**

زاراوەیەکی عوسمانی بوو بەکاروانی ئازووقەی یارمەتیدەری کاروانی حاجیان دەگوترا لەکاتی گەڕانەوەیان لە حیجاز.

**جردەجی (عەرەبی - تورکی):**

سەربازێك بوو لە سەربازە ڕەبەنەکان چەکەکەی ڕم بوو، ئەرکەکەی بریتی بوو لە پاراستنی حاجییەکان لە سەردەمی عوسمانی.

**جَرْم (فارسی):**

گەرم، لە سەردەمی ئەیووبی باو بوو بۆ گوزارشتکردن لە شوێنە گەرمەکان (گەرمیان).

**جریب (عەرەبی):**

پێوانەیەکی ڕووبەر بوو لە سەردەمی ئیسلامی دەیکردە (١٠) هەزار مەتری چوارگۆشە.

**الجَريدة (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو بە تۆماری ئـەو پارەیـە دەوتـرا کـە سـەربازان لـە دیـوانی سـوپا وەریان دەگرت.

**جزايرلی (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە دانیشتوانی جەزائیر دەوترا.

**جزمه (تورکی):**

پۆسـتاڵ پـێلاوی لاق درێـژ کـە پـێلاوی ئەفـسەرانی سـوپا بـوو لـە سـەردەمی عوسمانی.

**جزية محاسبەسی (عەرەبی - تورکی):**

ژمێریاری سەرانە، دەزگایەکی دارایی بوو لە سـەردەمی عوسمـانی تایبـەت بـوو بەتۆمارەکانی باجی سەرانە کە لەغەیرە موسوڵمانەکان وەردەگیرا .

**جشار (تورکی):**

زاراوەیەکی عوسمانی بوو بۆ گوزارشت لەو ئەسپ و مانگایانەی لەگـەڵ سـوپادا ڕاپێچ دەکرا.

**چفت (فارسی):**

لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای جووت دێت.

**لە ڕووی زاراوەییشەوە بۆ چەند مانایەك بەکارهاتووە:**

١ـ جووتێك گا یەك گاسن ڕادەکێشن.

٢ـ پارچە زەوییەکی کشتوکاڵی کە ڕووبەرەکەی لەنێوان ٦٠–١٥٠ دۆنم دابوو .

٣ـ تفەنگێکی ڕاوکردنی دوو لوولە.

**چفت آقجەسی (فارسی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە جۆرێك لە باجی زەوی کشتوکاڵی دەوترا.

**چفت رسم (فارسی – عەرەبی):**

ئەو باجە دراوییە بوو کە موسڵمانان لە بەرامبەر زەوی دەیاندایە دەوڵەت لە سەردەمی عوسمانی

**جفتلك (تورکی):**

بەمانای زەوی چێندراو دێت. ئەم جۆرە زەوییە لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی دەدرایە گەورە دەرەبەگەکان بەرامبەر بە بڕە پارەی دیاریکراو بە گوێرەی قەبارە و داهاتەکەی.

**جُفتة (فارسی):**

واتا جووتە ، زاراوەیەکی مەملوکی بوو بە دوو لە یاوەرانی تایبەتی سوڵتان دەوترا، ئەرکیان گرنگیدان بوو بە ئەسپەکانی سوڵتان، لە تەمەن و شێوەی لەیەکتر نزیکبوون، و جلوبەرگی لە یەکچوویان لە ئاوریشم لەبەر دەکرد، لە کەژاوەکان یاوەری سوڵتان بوون.

**جقشیر (تورکی):**

جۆرێك پێڵاو بوو ئەفسەرانی سوپای عوسمانی لەپێیان دەکرد.

**جلاسە (؟):**

جۆرێك لە کەشتی جەنگی گەورەی تایبەت کراو بوو بە دەریاوانی لە دەریای ناوەڕاست.

**جَلالی، جلالیة (تورکی):**

بزووتنەوەیەکی بەرفراوان بوو لە سەدەی شازدەهەمدا لە ئەنادۆڵ دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپا بوو.

**الجُلبان (عەرەبی - فارسی):**

ئەو مەملوکانە بوون کە تازە هێنرابوون. ئەوە بوو هەر سوڵتانێك لە سوڵتانەکانی مەمالیك لە کاتی فەرمانڕەوایی کردنیدا کۆمەڵێك مەمالیکی دەهێنا بۆ بەهێزکردنی پایەی خۆی و بۆ ئەوەی بەرامبەر بە مەمالیکە کۆنەکان بن.

**چلبی ،شلبی (تورکی):**

لەلای عوسمانییەکان نازناوێکی ڕێزلێنان بوو بـۆ ئەوانـەی لەپایـەی میرەکـان یـان گەورە پیاوانی ئاینی دەولـەت بـوون، هـەروەها بـۆ گـەورە نووسـەران، و نازنـاوی هەندێك بنەماڵەیە لە شام و میسر و عێراق.

**چله ، شله (فارسی):**

چلەگرتن ، ڕۆژوو گرتن بۆ ماوەی چل ڕۆژ کە دەروێشەکان لـە خەلۆوەتـدا پێـی هەڵدەستان.

**جلواز (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی خەلیفە ئومەوییەکان بەکار هاتووە بۆ پۆلیس.

**جماعات الضبطية (عەرەبی):**

ئەو سەربازانە بوون، کە ئەرکیان بـریتی بـوو لـە چـاودێری کردنـی ڕێگاکـان لـە کاتی تێپەڕینی سـوپاکان بـۆ پارێزگـاری کردنیـان هـەروەها گـرتنی هـەڵاتووان لـە سوپادا.

**جمباز (فارسی - بە عەرەبی کراو):**

گیان فیداکەر، بەو یارییە مەترسیدارانە دەوترێت وەکو پازدان و بەسـەر قاڵدرمـە کەوتن و هاتنە خوارەوە.

**جمدار (فارسی):**

لە سەردەمی مەمالیك باو بوو بەو کەسە دەوترا کە بـەرپرس بـوو لـە جلوبـەرگ لەبەر کردنی سوڵتان، هـەروەها بـە تیپێـك لـە پاسـەوانی سـوڵتانی لـە سـەردەمی مەمالیك دەوترا.

**جمقدار (تورکی - فارسی):**

ئەو کەسە بوو لە کەژاوە سوڵتانییەکاندا لە دەسـتە ڕاسـتی سـوڵتان دەڕۆیـشت ئەرکی سەرەکی پاراستنی سوڵتان بوو گۆپاڵێکی سەرگەورەی زێڕینی بەدەستەوە بوو.

**جەمكدار (فارسی):**

بــە فەرمانبــەرێكی تایبــەتی لــە دیــوانی ســولْتان دەگــوترا، ڕاســپاردرابوو بــە دابەشكردنی مووچە بەسەر مەمالیكە سولْتانییەكاندا.

**جەملون (عەرەبی):**

گومبەتی كووڕ بووەوە.

**جُملیان (توركی - فارسی):**

لــە ســەردەمی عوسمــانی بــەو خۆبەخــشانە دەوتــرا كــە لــەكاتی شــەڕدا لەگــەڵ ئینكشارییەكاندا دەچوونە شەڕ.

**الجناب (عەرەبی):**

نازناوێـك بـوو لـە سـەردەمی مـەمالیك و عوسمانییـەكان بـۆ بـانگكردنی گـەورە فەرمانبەران و میرەكان ، لە سەردەمی عوسمانلی میرە كوردەكانیش لە نووسراوە فەرمییەكاندا هەر بەم نازناوە بانگ دەكران .

**الجنایب (عەرەبی):**

بەو ئەسپە یەدەگانــە دەوتــرا كــە لــەكاتی ســەفەردا لەگــەڵ ســولْتاندا دەبــوون، هەروەها بەمانای پاسەوانی یاوەریش دێت.

**جنتمكان (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەو دوعایە دەوترا كــە بـۆ مـردوو دەكـرا، واتــە شــوێنی بەهەشت بێت.

**جَندرمە (ئیتا):**

جەندرمە، پۆلیس.

**جنزرلی (فارسی - توركی):**

بەو كەسە دەوترا كە خەڵكی بە زنجیر دەبەستەوە هەروەها بە جۆرە دراوێكیش دەوترا.

**جَتك (فارسی):**

ئامرازێکی مۆسیقی بوو بەعوود دەچوو لە سەردەمی مەمالیك باو بوو و تاکو سەردەمی عوسمانی بەردەوام بوو.

**جنود الطبقة الخامسة (عەرەبی):**

تیپێك سەرباز بوون سوڵتانی مەملوکی قانصوه الغوری (١٥٠١ – ١٥١٦ز) دایمەزراند و چەکی ئاگرینی سووکی پێدان و ئەرکیان بریتی بوو لە کارکردن لە دەریاوانی مەملوکی بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی پورتوگالییەکان و دوژمنەکانی تری دەوڵەت.

**جهادی (عەرەبی):**

بەجۆرێك لە دراوی زێڕی سەردەمی عوسمانی دەوترا.

**جهامتلی (عەرەبی – تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە سەربازی مڕ و مۆچ دەوترا.

**الجهة (عەرەبی):**

لە سەردەمی سەلجووقی بە ژنی خەلیفە دەگوترا، هەندێ جار بە ئافرەتی بەمێرد و هەروەها بە ئافرەتی پایەبەرز یش دەگوترا.

**الجواری الجنكیات (عەرەبی - فارسی):**

ئەو کەنیزانە بوون کە جنك (ئامێرێکی مۆسیقی تەلدار)یان لێدەدا.

**الجواری الغلامیات (عەرەبی):**

ئەو کەنیزانە بوون کە جلوبەرگی کوڕانیان لەبەر دەکرد بۆ خزمەتکردن لە کۆشکەکاندا.

**الجوالی (عەرەبی):**

ئەو پارە بوو کە لە زمییەکان واتا غەیرە موسوڵمانان وەردەگیرا بەرامبەر بە پاراستنیان یان مانەوەیان لە وڵاتی موسوڵمانان و لە ژێر دەسەڵاتیان، ئەم

دەربڕینە لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی بەکار هات و لە سەردەمی مەمالیك هەر بەکارهاتووە و لە سەردەمی عوسمانیش لە ئیدارەی میسریدا بەکارهاتووە.

**الجوامك (فارسی):**

مووچەی سەربازان و ئەو خواردن و جلوبەرگەی لەکاتی دیاریکراو پێیان دەدرێت.

**جوخدار (فارسی):**

ئەمینداری پۆشاکی سوڵتانی بوو لە دەوڵەتی عوسمانی. بەو کەسە دەوترێت کە لە کەژاوەکاندا سواری ئەسپێك دەبوو و لە دوای سوڵتان دەڕۆیشت و قاپووتی بارانی تایبەت بە سوڵتان هەڵدەگرت.

**چورباچی (تورکی):**

شورباچی، نازناوێك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ میر ئالای تیپی ئینکشاری (ئورتە) بەکار دەهات. هەروەها بە پیاو ماقووڵانی شارە بچووکەکان دەوترا. هەروەها لە سەردەمەکانی دواتردا بە پیاو ماقووڵانی مەسیحی لە گوندەکان دەوترا.

**الجوسقی (فارسی):**

بە هەموو کەسێك دەگوترێت کە بەشداری لێدانی مۆسیقا لە جۆقەیەکدا دەکات، لە سەردەمی عوسمانیدا لە شارە جۆر بە جۆرەکانی عوسمانیدا جۆقەی زۆر دامەزرا.

**الجَوشن (فارسی):**

جۆرێکە لە زرێ لە سەردەمی ئیسلامی باو بوو، لەسەر سینگ لەبەر دەکرا بۆ پاراستنی جەستە لە شمشێر و ڕم.

**چوکاندار:**

چۆکان، کە بریتی بوو لە دارێکی چەماوە ئامادە کرابوو بۆ یارییەکی تۆپێنی تایبەت کە تیایدا یاریزانەکان لەسەر پشتی ئەسپەوە گەمەیان بەتۆپێکی تایبەت

دەکرد لەسەر زەوی . (چوکاندار) بە مانای هەڵگری جوکانی سوڵتانی مەملوکی دێت لەکاتی یاریکردن.

**الجونة (عەرەبی):**

لە ئامرازەکانی نووسینە، بریتییە لە کیسێك کە مەرەکەبی تیادا دەکرێت.

**جیوەلك (فارسی - تورکی):**

زاراوەیەکی عوسمانی بوو بەو سەربازە دەوترا کە خوێنی گەرم و زۆر بزێو و بە جووڵە بووایە.

## پیتی - ح -

**الحاجب (عەرەبی):**

پەردەدار، پایەیەکی فەرمی گرنگ بوو، بەو کەسە دەگوترا کە نێوەند بوو لەنێوان خەڵکی ئاسایی و دەسەڵاتدار، وەك سکرتێری تایبەتی وابوو بە زاراوەی ئێستا. لە سەردەمی فاتمییەکان لە میسر پێی دەگوترا (خاوەن دەرگا /یان دەرگاوان). لە سەردەمی مەمالیکیش لەلای سوڵتان دەوەستا بۆ ئەوەی داواکارییەکانی خەڵك پێشکەشی سوڵتان بکات.

**الحاشیة (عەرەبی):**

پەراوێز، لەڕووی زمانەوە دەکاتە لێوارەکانی لاپەڕەی نووسین، دواتر بەم نووسین و سەرنجانە گوترا کە لەم لێوارانە دەنووسرا. ئەم سەرنجانەش بریتی بوون لە شرۆڤەکردنی نووسینەکانی ناوەڕۆکی لاپەڕەکە. ئەم شێوازە لە سەدەی پازدە بەدواوە لای نووسەران باو بوو. بەڵام (الحاشیة) لەڕووی زاراوەی سیاسی بریتییە لەو کۆمەڵە کەسانەی کە لەدەوری سوڵتان و میر و دەسەڵاتداران بوون بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان.

**حاصلات بین المال (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە پارەو سامانی ئەو کەسە دەگوترا کە دوای مردنی میراتگری نەبوو. لە سەردەمی مەمالیك پێی دەگوترا (المواریث الحشریة).

**حبس الجیوش (عەرەبی):**

بریتییە لەم زەوی و ئاژەڵانەی کە بۆ لەشکر و دابینکردنی پێداویستییەکانی تەرخان دەکرێ.

**حبس خانە (عەرەبی - فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە بەندینخانە دەگوترا، لە زمانی کوردیش (حەپس خانە) بۆ هەمان مەبەست بەکاردێ.

**الحراقة (عەرەبی):**

جۆرە کەشتییەکی جەنگی گەورە بوو ، کە شوێنی تۆپ هاوێشتنی هەبوو بۆ زەمین و دەریا.

**حرب الاستنزاف (عەرەبی):**

ئەو بەیەکدادانە سەربازییە پچڕپچڕ و بچووکانە بوو کە لەنێوان هێزە عەرەب و ئیسرائیلییەکاندا لە هێڵەکانی سنوور ڕووی دا لەماوەی نێوان (١٩٦٩/٣/٨) تا (١٩٧٠/٨/٧).

**الحرب الاهلیة (عەرەبی):**

شەڕی نێوەخۆیی، براکوژی، ئەو شەڕەیە کە لەنێوان هێز و لایەنە نێوخۆییەکانی وڵاتێکدا ڕوودەدات.

**الحرب الباردة (عەرەبی):**

جەنگی سارد، ئەو ململانێیە هەمەلایەنە بوو کە لەماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەنێوان بلۆکی سۆشیالیستی ڕۆژهەڵات بەسەرکردایەتی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی سەرمایەداری ڕۆژئاوا بەسەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپابوو. ئەم ململانێیە کە لە ئەنجامی جیاوازی ئایدیۆلوجی پەیدابوو، بێجگە لەبەیەکدادانی سەربازی ڕاستەوخۆ هەموو بوارەکانی تری دەگرتەوە، بەتایبەتی لە بواری خۆپڕچەك کردن و بەدەستهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو هەروەها سیاسەتی دەرەوە و هەژموونی ئابووری و ڕاگەیاندن.

**حربَجي (عەرەبی - تورکی):**

حەربەچی، ناوی ئۆرتەی شێست و یەکەمین بوو لەدەوڵەتی عوسمانی، کە یاوەریی ئاغای ئینکشاری و سەدری ئەعزەم و وەزیرەکانیان دەکرد.

**الحرس القومي (عەرەبی):**

میلیشیایەك بوو بەعسییەکان دوای کودەتای ١٩٦٣ لە عیراق دایانمەزراند، کرداری زۆر دڕندانەی ئەنجامدا بەتایبەتی لە کوردستاندا.

**حرفوش، حرافیش (عەرەبی):**

ئەم کەسەیە کە خاوەنی هیچ پیشەیەك نییە، مەبەشت خەڵکی ڕەشۆکییە، بەڵام هەندێك لەمانە پیاوماقووڵانی وڵاتی شام بوون.

**الحركة التحررية الوطنية (عەرەبی):**

بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی نەتەوە ژێردەستەکانە لەپێناو سەربەخۆیی نیشتیمانی و پەرەسەندنی سەربەخۆی میللەتان، ئەمەش بەشێکە لە بزاڤی نەتەوەیی کە کرۆك و ئامانجەکانی بەپێی قۆناغە مێژووییەکان دەگۆڕێت. چونکە بۆ میللەتێکی داگیرکراو و ژێردەستە سەربەخۆ بوون و پێکهێنانی قەوارەیەکی نەتەوەیی ئامانجێکی سەرەکی ئەم بزووتنەوەیە، بەڵام دوای ئەم قۆناغە خەبات لەپێناو ڕزگاربوون لە پاشکۆیەتی و بەرقەرارکردنی ئازادی و دیموکراتی و پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەست پێدەکات.

**الحركة الدستورية (عەرەبی):**

بزاڤی دەستوری، ئەو بزاڤەیە کە کەسایەتی و ڕێکخراوە نیشتیمانییەکان پێی هەڵدەستن بۆ داواکردنی حوکمی دەستوری لەوڵاتێکدا کە تیایدا دەسەڵاتی تاکڕەوی شا یان سوڵتان یان هەر دەسەڵاتدارێکی تر بەرقەرارە. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بزاڤێکی لەم جۆرە لە هەریەکە لە دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری بەرپا بوو.

**حركة عدم الانحياز (عەرەبی):**

بزاڤی بێ لایەنخوازی، ئاراستەیەکی سیاسەتی نێودەوڵەتی بوو لـەماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەلایەن سەرانی هەندێ لەوڵاتان لە هەمبەر هەردوو بلۆکی ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوا پـەیڕەو کـرا ، ئـەم سـەرکردانە کـە بـریتی بـوون لـە: ئەحمـەد سـۆکارنۆ لـە ئەندەنوسـیا، جـەواهیر لال نـەهرۆ لـە هیندسـتان، جۆزیـف تیتـۆ لـە یوگسلاڤیا، جەمال عبدالناصر لە میسر، ئامانجیان ئـەوە بـوو کـە خۆیـان بـەدوور بگرن لە جەنگی سارد و کاریگەرییەکانی. دواتـر لـە کـۆنگرەی (بانـدۆنگ)ی سـاڵی ١٩٥٥ ئەم ئاراستەیە ڕێکخرا و بوو بەڕێبازێکی سیاسی کە زۆربەی ولأتانی جیهانی سـێیەم پـەیڕەوییان لـێ کـرد و لەئـە نجامـدا (ڕێکخـراوی ولأتـانی بـێ لایـەن) هاتەکایەوە.

**حَرَملِك (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەم بەشەی کۆشکی سوڵتانی یان هـەر مـاڵێکی ئاسـایی دەگوترا کە بۆ ئافرەتان تەرخان کرابوو.

**الحرمين الشريفين (عەرەبی):**

هەردوو حەرەمی پیرۆز، کەعبە و مزگەوتی پێغەمبەر (د. خ) لە مەدینە.

**حَريم (عەرەبی):**

ئەو بەشەی کە تایبەت بوو بە ئافرەتان لە ماڵی موسڵمانان. بـەلأم بەتایبـەتی لە ماڵی خانەدان و دەسەلأتداران.

**حَريم همايون (عەرەبی - فارسی):**

ئەو لایەی کە تایبەت بوو بە ئافرەتان لە کۆشکی سوڵتانی عوسمانی.

**الحزان (عیبری):**

لە پیاوانی ئاینی جوولەکە بوو، وەکو وتاربێژ وابوو.

**الحسبة (عەرەبی):**

بەشێك بوو لە ڕژێمی کارگێڕی ئیسلامی کە تایبەت بوو بە پارێزگاریکردن لە ڕیکخستنی گشتی و چاودێریکردنی کڕین و فرۆشتن و بازاڕەکان، بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان بەخێرایی. لەم ڕژێمەدا کەسێك هەبوو کە پێی دەگوترا (المحتسب/ یان: صاحب الحسبة) لە بازاڕەکان دەسووڕایەوە و چاودێری نرخەکان و پێوانە و کێشانی کالاکانی دەکرد و فەرمانی بەچاکە دەکرد.

**الحشاشون (عەرەبی):**

حەشیشە خۆرەکان یان تلیاکچییەکان، ئەمە یەکێك لە ناوەکانی ئیسماعیلییەکان بوو کە سەرەتا گرووپێك بوون باوەڕیان بە ئیمامەتی (ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق) هەبوو، بەلام دواتر بەشێکیان بە سەرکردایەتی (حەسەن کوڕی سەباح) جیابوونەوە و دوای شکست هێنانی شۆڕشێکیان لە میسر پەنایان بۆ قەلای (ئالەمۆت) برد لە ئێران. ئیتر لە سەدەی دوازدەی زایینی بەدواوە وەك تائیفەیەکی گومڕا ناویان لە سەرچاوە مێژووییەکان دێت.

**الحقوق السلطانية (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەم باجانە دەگوترا کە سوڵتان بۆ خۆی دەیسەپاند.

**حکمدار (عەرەبی - فارسی):**

واتە دەسەڵاتدار، بە والی و میر و سەرداری ناوچەکان دەگوترا.

**حکومت سنجقي (عەرەبی - تورکی):**

سنجەقێکی خاوەن حوکمی خۆماڵی و پشتاوپشت بوو، ئەم ناوە بۆ ئەو میرنشینە کوردییانە بەکاردەهات کە بایەخێکی تایبەتییان هەبوو لەنێو ئەوانیتر، و دەوڵەتی عوسمانی دانی پێدا نابوون و بەفەرمی ئەم ناوەی بەسەردا بڕیبوون.

**حکیم باشي (عەرەبی - تورکی):**

گەورە پزیشکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو، لە هەمان کاتدا پزیشکی تایبەتی سوڵتان و کۆشکی سوڵتانی بوو.

**حكيم الطبائعي (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بە پزیشکانی هەناو دەگوترا.

**حلف بغداد (عەرەبی):**

پەیمانی بەغدا، ئەم پەیمانە بوو کە لە ساڵی ١٩٥٥ لە بەغدا لەنێوان عیراق و تورکیا و بریتانیا و ئێران و پاکستان مۆرکرا. ئەم پەیمانە کە لەلایەن ئەمریکا پشتیوانی لێ دەکرا و سروشتێکی سەربازی ئیستعماریانەی هەبوو، ئامانجی ئەوەبوو گلۆتێك لەولاتانی ناوچەکە دروست بکات بۆ ئەوەی ببێتە لەمپەرێك لەبەردەم هەژموونی یەکێتی سۆڤیەت.

**الحلف المركزي (عەرەبی):**

بڕوانە ماددەی (سنتۆ).

**حلف شمال الاطلسي (عەرەبی):**

پەیمانی باکووری ئەتڵەسی یان (ناتۆ)، پەیمانێکی سیاسی– سەربازییە لە ساڵی ١٩٤٩ لە واشنتۆن دامەزرا، لەلایەن کۆمەڵێك ولاتی ئەمریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا کە دەکەونە سەر کەناری ئۆقیانوسی ئەتلەسی. ئەوانیش بریتی بوون لە: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، ئایسلەندا، نەرویج، بریتانیا، هۆڵەندا، بەلجیکا، دانیمارك، فەرەنسا، ئیسپانیا، پورتوگال. دواتر چەند ولاتێکی تر بوونە ئەندام تیایدا کە لەسەر کەناری ئەتڵەسی نەبوون کە ئەمانە بوون: ئیتالیا، یۆنان، تورکیا، ئنجا ئەڵمانیای ڕۆژئاوا. ئەمەش هەوڵێك بوو لە چوارچێوەی جەنگی سارد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەژموونی سیاسی و سەربازی یەکێتی سۆڤیەت و ئەم ولاتانەی پاشکۆی ئەو بوون.

**حلف وارشو (عەرەبی):**

پەیمانی وارسۆ، ڕێکخراوێکی سەربازی بوو ساڵی ١٩٥٥ لە (وارسۆ)ی پایتەختی پۆڵەندا لەسەر بنەمای بەرگری هاوبەش دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە لەلایەن ولاتانی سۆشیالیستی ئەوروپا بەسەرکردایەتی یەکێتی سۆڤیەت لەدژی پەیمانی (ناتۆ) پێکهێنرا. ئەندامەکانی بریتی بوون لە: یەکێتی سۆڤیەت، بولگاریا،

هـــەنگاریا، ئـــەلبانیا، ئـــەڵمانیای ڕۆژهـــەڵات، چیکۆســـلۆفاکیا، پۆڵەنـــدا، ڕۆمانیـــا، یوگسلاڤیا، بەڵام ئەمەی دوایی دواتر هاتە دەرەوە لە پەیمانەکە.

**الحماية (عەرەبی):**

جـۆرە باجێـك بـوو لـە سـەردەمی مـەمالیك کـە کەسـێکی دەسـەڵاتدار بەسـەر هەرێمێکی دەسەپاند بۆخۆی. لە سەردەمی عوسمانیش بەم خاوەیە دەگـوترا کـە خـاوەن پلـە باڵاکـانی لەشـکری ئینکشاری بەسـەر بازرگـان و پیـشەگەرەکانیان دەســەپاند، بــەبیانووی پاراســتنیان. لــە زاراوەی هاوچەرخیــشدا شــێوازێکە لــە دەسەڵاتی ئیستعماری کە سووکتر بوو لە داگیرکردنی ڕاستەوخۆ ، چونکە دەوڵەتە ئیستعمارییەکە تەنیا هەژموونی خۆی بەسەر وڵاتەکە دادەسەپاند.

**الحمزوية (عەرەبی) :**

تەریقەتێك بوو کە لەلایەن (حمزە بالي البوسنوي / ١٥٦١ز مردووە) دامەزرا.

**حمايلي (عەرەبی):**

ئەم نووشتەیە بوو کە کەسێك لە ملی دەکرد بۆ پاراستنی لە ترس و جنۆکە.

**حواندار (عەرەبی - فارسی):**

بەرپرسی بەخێوکردنی باڵندەکانی ڕاوکردنی سوڵتانەکانی مەمالیك بوو.

**الحَوطة (عەرەبی):**

لــە ســەردەمی مــەمالیك بــەکاردەهات بــۆ ئامــاری مــاڵ و ســامان بەمەبەســتی خەملاندنی باج.

**الحياد الايجابي (عەرەبی):**

بڕوانە ماددەی (حركة عدم الانحياز).

**الحياصة (عەرەبی):**

ئەم پشتێنە بوو کە بـۆ تونـدکردنی زیـن لـە ناوەنـدی لاشـەی وڵاغ دەبەسـترا. هـەروەها بـە کەمەربەسـتی مـرۆڤیش دەگـوترا بەتایبـەتی هـی ئافرەتـان، کـە بـە کوردیش پێی دەگوترا (هەیاسە) یان کەمەرە.

**الحيل (عەرەبی):**

تاکەکەی (حیلە) یە واتە فێڵ، بۆ داهێنانە میکانیکییەکان بەکاردەهات لە سەردەمانی ئیسلامدا.

**حیلەجی (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە فێڵباز دەگوترا.

## پیتی - خ -

**خاتوون (تورکی):**

نازناوی خێزانەکانی مەغۆل و شازادەکانیان بوو، هەروەها نازناوی خانمەکانی چینی خانەدانان بوو. زۆر جار بەواتای خانم بەکاردێ. وشەی (قادن) و (قادین)ی عوسمانیش هەر لەو وەرگیراوە، لەکاتێکدا لە سەردەمی ئەیووبی و مەمالیکیش هەر (خاتوون) بەکاردەهات.

**خادم (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەو پیاوە خەسێنراوانە دەگوترا کە لە کۆشکی سوڵتان یان وەزیر و پیاوانی دەوڵەت خزمەتیان دەکرد.

**خاشوقچی (تورکی):**

دروستکەر یان فرۆشیاری کەوچك، چونکە (خاشوق) واتە (کەوچك).

**خاص، خاصة (عەرەبی):**

زەوی دەرەبەگایەتی لە دەوڵەتی عوسمانی سێ جۆر بوو کە لە هەموویان گرنگتر پێی دەگوترا (خاصە) یان (خاص)، ئەم جۆرە بەزۆری بۆ توێژی باڵادەست و دەسەڵاتدار و بنەماڵەی سوڵتان بوو. هەروەها بەخزمەتکارانی تایبەتی سوڵتانیش دەگوترا (خاصە).

**خاص أوده (عەرەبی - تورکی):**

هۆدەی تایبەت، زاراوەیەکی عوسمانی بوو واتای ژووری تایبەتی سوڵتانی دەگەیاند، هەروەها بەکارکەران و خزمەتچییانی تایبەتی سوڵتان دەگوترا لەنێو کۆشکدا.

**خاصكي، خاصكية (عەرەبی – تورکی - فارسی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەکۆمەڵی بژاردەی کۆیلەکانی سوڵتان دەگوترا، کە ئەمانە ئەرکی تایبەتی و گرنگیان بۆ سوڵتان ئەنجام دەدا و جیاوك و ماف زۆریشیان هەبوو. لە سەردەمی عوسمانیشدا بەهەرشتێ دەگوترا کە پەیوەندی بەموڵکەکانی حکومەت یان خزمەتی حکومەت یان کۆشکی سوڵتان هەبوو. هەندێ کەنیزە و هەروەها فەرمانبەر و سەربازی تایبەتی سوڵتانیش پێیان دەگوترا (خاصکی).

**خافيه ، خفيه (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەو کەسانە دەگوترا کە سیخوڕییان دەکرد، یان لەپیاوانی هەواڵگری بوون. لە کوردیشدا ئەم وشەیە بۆ هەمان مەبەست بەکاردێ.

**خاقان (مەغۆلی):**

لە وشەی (قائان) یان (قاغان)ـەوە هاتووە و بەواتای خانی خانان بەکاردەهات، وە بەسەرۆکی مەغۆلەکان یان میرەکانیان دەگوترا، هەردوو وشەی (خان) و (قان)یش هەر کورتکراوەی ئەون.

**خان (تورکی):**

نازناوێکی تورکی بوو کورتکراوەی (خاقان)ـە، لە سەدەی چوارەم تا دەیەمی کۆچی (١٠–١٦ز) بەرەبەرە گۆڕانکاری بەسەردا هات، تا بووە ناوێك بۆ سەرداری هەرێمێك یان ناوچەیەك. لە سەردەمی مەغۆل و هەروەها لە دەوڵەتی عوسمانیش تایبەت بوو بە (شا) و سوڵتانەکان، بەڵام لە دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠١–١٧٣٦ز) بە سەرداری ویلایەتێك یان سەرۆك هۆزەکان دەگوترا.

**خان (فارسی):**

خان یان کاروانسەرا کە وەك هوتێل بوو کە گەشتیار و گەڕیدە و بازرگانانی بیانی تێیدا دەمانەوە، لە سەردەمی سەفەوی و عوسمانی لە زۆربەی شارەکاندا هەبوو.

**خانچی (فارسی - تورکی):**

خاوەنی (خان) یان ئەو کەسەی کاری تێدا دەکرد.

**خانقا (فارسی):**

خانەقا و (تەکیە)شی پێ دەگوترێ، شوێن و بارەگای دەروێش و سۆفییەکانە. بەلاّم زیاتر (خانەقا) بۆ سۆفی نەقشبەندییان و (تەکیە)ش بۆ دەروێشی قادرییان بەکاردەهات.

**خانم (تورکی):**

نازناوێکی ڕێزدانان بوو بۆ ئافرەتان، کوردو فارسیش بەکاری دەهێنن. بەلاّم لای تورکەکان و هەندێ ولاّتی عەرەبی (وەك: میسر) بۆتە (هانم).

**خانە (فارسی):**

ماڵ ، خانوو، زۆر جار وەك پاشگر بەکاردێت کە واتای شوێنی شتەکەی دەبەخشی وەك (کتێبخانە، تۆپخانە).

**الختم الهمایونی ، مهری همایون (فارسی):**

مۆری هومایۆن، ئەمە مۆری تایبەتی سوڵتانی عوسمانی بوو کەناوی خۆی و باوکی تێدا نووسرابوو. سوڵتان چوار مۆری هەبوو: کە یەکێکیان لەشێوەی ئەنگوستیلە بوو لە پەنجەی خۆی بوو، ئەوانی تریش لای سەدری ئەعزەم و سەرۆکی ژووری تایبەت (خاص اودە) و ئەمینداری خەزێنەی تایبەت بوون.

**خداوندکار (فارسی):**

خاوەن، گەورە، میر ، لە سەردەمی عوسمانیدا وەك نازناوێك بۆ سوڵتان بەکاردەهات.

**خديو، خديوى (فارسی):**

گەورە، یان خاوەن، لە ساڵی ١٨٦٧ز. بەدواوە لە میسر باو بوو دوای ئـەوەی سوڵتانی عوسمانی وەك نازناوێك بەخشییە (ئیسماعیل پاشا)ی سەرداری میسر کە لە نەوەی (محەمەد عەلی پاشا) بوو.

**الخراج (عەرەبی):**

خـەراج، موڵکانـەی زەوی بـوو کـە لـە زەوی ناموسـڵمانانی نێـو قەڵـەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامی وەردەگیرا، بەدەوڵەتی عوسمانیشەوە.

**خراجي مقاسمة (عەرەبی):**

جـۆرێکی خـەراج بـوو کـە لـە بـەروبوومی زەوییەکـە چـەندیەکی لـێ وەردەگـیرا.بـەڵام لـە دەوڵـەتی عوسمـانی زیـاتر بـەو داهاتـە دەگـوترا کـە لـە زەوییەکانی تایبەتی سوڵتان دەست دەکەوت.

**خراج المساحة (عەرەبی):**

جۆرێکی تری خەراج بوو کە بەپێی پانتایی زەوییەکە ساڵانە دەدرا.

**خرافة (عەرەبی):**

ئەفسانە،بۆ گوتـەی پڕوپـووچ و دوور لـە ژیـری ، هـەروەها بـۆ بـیرو بـاوەڕی دواکەوتوو بەکاردێ.

**خردە (فارسی):**

خوردە واتە شتێکی بچووکی کەم بایەخ، یان ورد، تورکەکان لـە فارسـەکانیان وەرگرتووە و بەئامێرە کانزاییە کۆنەکانیان دەگوت.

**الخرطاط (عەرەبی):**

چادری گەورە.

**خرقە شريف (عەرەبی):**

مەبەست عەبا (بوردە)ی پێغەمبەر (د.خ) بوو کە لە ئەستانبۆڵ پارێزراوە، کە لـە سـەردەمی عوسمـانی پێـی دەگـوترا (خرقـەی شـەریف) و هـەروەها (خرقـەی سەعادەت).

**خزمتچی (عەرەبی - فارسی):**

خزمەتکار.

**خزینەدار اسطة (عەرەبی -.فارسی):**

لە دەوڵەتی عوسمانیدا ئافرەتێکی بەرپرسی دارایی بوو لە بەشی خانمانی کۆشکی سوڵتان.

**خزینەدار باشی (عەرەبی -.فارسی - تورکی):**

پایەیەك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، واتە گەورەی خەزنەدارەکان یان گرنگترینیان.

**خزینە دفترداری (عەرەبی -.فارسی) :**

بەرپرسێك بوو لە کارگێڕی ویلایەت لە دەوڵەتی عوسمانی، تایبەت بوو بەو باجانەی کە هی خەزێنە بوو.

**خزینە کتخداسی (عەرەبی - تورکی):**

زاراوەیەکی عوسمانی بوو بە ئەمینداری گەنجینەکانی سوڵتان دەگوترا.

**خستەخانە (فارسی):**

خەستە واتە نەخۆش، خانە واتە شوێن یان ماڵ، کەواتە خەستەخانە واتە نەخۆشخانە، لە سەردەمی عوسمانی زیاتر بەکاردەهات، ئێستاش لە هەندێ ناوچەی کوردستان بەکاردێ.

**خِشت (فارسی):**

ڕم

**خُشداش :**

لە سەردەمی مەمالیك بەکار دەهات و بەو کۆمەڵە کۆیلەیە دەگوترا کە لای یەك خاوەن پێگەیشتبوون.

**خطا، خطاي :**

لە سەردەمانی پێشوو بەم ولاَتە دەگوترا کە ئێستا تورکستانی ڕۆژهەلاَت و مەنگۆلیا و بەشێکی مەنشوریاو سیبیریا دەگرێتەوە. لەبەرئەوەی هۆزێك بەم ناوە بۆ ماوەی دوو سەدە حوکمی ئەم ولاَتەی گێڕا.

**خط التعليق العثماني (عەرەبی):**

جۆرە خەتێکی نووسین بوو کە پێی دەگوترا (نەستەعلیق) ی عوسمانی واتە نوسخ و موعەللەق. عوسمانییەکان وەك لاساییکردنەوەی نەستەعلیقی فارسی بەکاریان دەهێنا.

**خط شريف (عەرەبی):**

بەو فەرمانە دەگوترا کە لەلایەن سولَتانەوە دەردەچوو، ئەگەر بەدەستی خۆی بینووسیبایە ، یان بەدەستی خۆی مۆری بکردبایە. هەروەها بەو پەیماننامانەو بڕیارنامانەش دەگوترا کە سولَتان لە سەرەتاکەی چەند دێڕێکی دەنووسی.

**خط شريف گلخانه (عەرەبی - .فارسی):**

ئەو بڕیارنامە بوو کە لەسالَی ١٨٣٩ز. لە دەولَەتی عوسمانی دەرچوو لە چوارچێوەی زنجیرە چاکسازییەکانی عوسمانی.

**خط شکسته (عەرەبی - فارسی):**

جۆرە خەتێکی نووسین بوو کە ئێرانییەکان بەکاریان دەهێنا، وە هەردوو شێوازی نوسخ و تەعلیقی تێکەلّ کردبوو.

**خط النستعليق (عەرەبی):**

جۆرە خەتێکی نووسین بوو کە هەردوو خەتی نوسخ و تەعلیقی تێدا کۆ کرابۆوە. لەسەردەمی سەفەوی و هەروەها عوسمانیش بەکار دەهات.

**خط شريف همايون (عەرەبی -.فارسی):**

بڕیارنامەیەکی چاکسازی بوو کە لە سالَی ١٨٥٦ز. لە سەردەمی سولَتان عەبدولمەجید دا دەرچوو. ئەمەش هەولَێکی تری نوێکردنەوەی دەولَەت بوو.

**خفتان (فارسی):**

جۆرە پۆشاکێکی سەربازی بوو کە لە سەردەمی مەمالیکدا هەبوو.

**خلعة (عەرەبی):**

پۆشاکی میرانە، خەلاتی میرانە، بەرگێکی گرانبەها بوو کە لەلایەن سولتان و دەسەلاتدارانەوە بەدیاری دەدرایە سەردار و گەورە فەرمانبەران، وەك نیشانەی لێ ڕازیبوون و پەسندکردنی ئەرکەکانیان. وشەی (خەلات)ی کوردیش هەر لەوەوە هاتووە کە دەکاتە (دیاری).

**خلوتية (عەرەبی) :**

خەڵوەتی، تەریقەتێکی سۆفیگەری بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**الخلوة (عەرەبی):**

زاراوەیەکی سۆفیگەرانەیە کە واتای گۆشەگیری دەروێشان دەگەیەنێ بۆ مەبەستی خوداپەرستی، لە کوردیش هەر خەڵوەتگرتنی پێدەگوترێ.

**الخليفه (عەرەبی):**

جێنشین، بەزۆری بۆ جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەکاردەهات. ببووە نازناوێك بۆ سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلام لەدوای پێغەمبەرەوە تا کۆتایی سەردەمی عەباسی. تەنانەت دواتریش لێرەو لەوێ بەکاردەهات بەتایبەتی لەلای مەمالیکەکانی میسر و لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

**خمبره (فارسی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی و هەروەها لای ئێرانییەکانیش بەکاردەهات بۆ جۆرە تۆپێکی بچووك کە وەك هاوەن وابوو. لە کوردیشدا پێی دەگوترا خومپارە.

**خمبرەچی (فارسی - تورکی):**

لە دەوڵەتی عوسمانی بەو سەربازانە دەگوترا کە تایبەت بوون بەم جۆرە تۆپە.

**خنجر:**

خەنجەر.

**خندق (فارسی):**

لە (کەندە)ی فارسی و (کەند)ی کوردییەوە هاتووە کە واتای چاڵێکی گەورە دەگەیەنێ، زۆرجار بەدەوری ئەو شارانە هەڵیان دەکەند کە شوورەی نەبوو بۆ بەرگریکردن. وەك شەڕی خەندەقی بەناوبانگ لە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ).

**خنکار (فارسی):**

یەکێك بوو لە نازناوەکانی سوڵتانی عوسمانی، بەکوردی (خونکار)ی پێ دەگوترێ.

**خواجە، خوجە (فارسی):**

نازناوێك بوو لە سەردەمی مەمالیك و هەروەها عوسمانیشدا بۆ چەند کەسایەتییەك بەکاردەهات، وەك: زاناو پیاوانی ئاینی، وەزیر، مامۆستا، دەوڵەمەند، بازرگانی بیانی.

**خوارج (عەرەبی):**

خەواریج، واتە لەڕێ دەرچوو، ئەمانە گرووپێك بوون لە ئەنجامی ململانێی نێوان خەلیفەی راشدی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) و (مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) لەسەر دەسەڵات پەیدا بوون. کە بۆچوونی تایبەتی خۆیان هەبوو. ئەوان بەخۆیان دەگوت (شورات) واتە کڕیاری بەو واتایەی ئەوان بەهەشتیان لە خودا کڕیوە. ئەمانە دیارترین و بەهێزترین گرووپی نەیاری دەوڵەتی ئومەوی و عەباسی بوون. خەواریجەکان کە جەربەزەو سەرەڕۆ و ئاکار توند بوون، چەندان دەستەو تاقمی جۆراوجۆریان هەبوو وەکو : ئەزاریقە، سەفرییە، ئەبازییە.

**خواصی همایون (تورکی):**

زەوییە تایبەتییەکانی سوڵتانی عوسمانی بوو.

**خوان سالار (فارسی):**

لە دەوڵەتی مەمالیکدا بە سەرپەرشتیاری سفرەی کۆشکی سوڵتانی دەگوترا.

# پۆلینکردنی ڕستەی کوردی

## توێژینەوەیەکی ڕستەسازییە

پرۆفیسۆری یاریدەدەر
دکتۆر عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ
ڕاگری کۆلێژی زمان - زانکۆی سۆران
٢٠١٠ز

### پێشەکی

لەگەڵ کورتیی مێژووی ڕێزمانی کوردی، بە بەراوردکردن لەگەڵ مێژووی ڕێزمانی زمانە ڕاژەکراوەکان، زمانەوانانی کاروانی ڕێزمانی کوردی چالاکانە هەنگاوی درشتیان ناوە و خەرمانەیەکی بڕشتیان کۆکردووەتەوە، بە تایبەتی لە ئاستی ڕستەسازیدا، کەم زمانەوانی ڕێزمانی کوردی هەیە، باسی ڕستەی نەکردبێ.

لە ڕێزمانی سەرەتا بەر لە باسە ئەکادیمییەکان زمانەوانان تیشکیان دەخستە سەر هەموو ئاستەکانی زمان، بەڵام پتر بایەخ بە ئاستی ڕستەسازی دراوە. ئەگەرچی بۆچوونەکانیان لە یەك نزیکن، بەڵام هەریەکەیان بە جیاوازییەکی هەستپێکراو پێناسە و پۆلینی ڕستەی کوردییان کردووە. ئێمەش لەم هەنگاوەدا بە پێی توانا و بە سوود وەرگرتن لە سەرجەم هەنگاوەکانی ئەم کاروانە دەمانەوێ خشتێکی تر بخەینە سەر کۆشکی ڕاژەی زمانەکەمان.

بۆ پێکانی مەبەست، لە سەرەتا وەك زەمینە خۆشکردنێك پۆلینی ڕستەمان لە ڕووی دارشتنەوە بە پۆلینێکی درەختی (محمد معروف-ل١٥٤) خستووەتە ڕوو. لە بەشی یەکەمدا ڕستەی سادەمان تاوتوێ کردووە، کە پێکهاتووە لە سێ بەند: بەندی یەکەم سادەترین ڕستەی کوردی و بەندی دووەم ڕستەی سادەی ئاسایی و بەندی سێیەم ڕستەی سادەی فراوانکراوە. لە بەشی

دووەمدا ڕستەی ناسادە خراوەتە ڕوو، كە لە بەندی یەكەمدا باسی ڕستەی لێكدراو و لە بەندی دووەمدا باسی ڕستەی ئاوێتە (تێكەڵ) دەكا. لە بەشی سێیەمدا پۆلینی ڕستەمان لە ڕووی گەیاندنی واتا (ئەركە زمانەوانییەكانی ڕستە) گەڵاڵە كردووە.

لە كۆتاییدا ئەنجامەكان و كورتەی باسەكە بە عەرەبی و ئینگلیزی و پەراوێزی هەرسێ بەشەكانی یەكەم و دووەم و سێیەم و لیستی سەرچاوەكان پێشكەش كراون.

## ســـەرەتا

باوترین پۆلینەكانی ڕستە، پۆلینكردنی ڕستەیە لە ڕووی داڕشتنەوە (ڕۆنان)، كە تیایدا بە پێی ڕادە و چۆنیەتی كەرەسە پێكهێنەرەكانیان، ڕستەكان پۆلین و دابەش دەكرێن. لەم ڕووەوە زمانەوانان تا ڕادەیەكی زۆر كۆكن، چ لە ڕووی چۆنیەتی پۆلینكردنی ڕستەوە بێ، یان لە ڕووی زاراوەكارییەوە بێ. لەم باسەدا هەوڵی ئەوە دراوە، سەرجەم پۆلین و بۆچوونەكان كۆبكرێنەوە و یەكبخرێن و بەشە سەرەكی و لاوەكییەكان گەڵاڵە بكرێن، وەك لەم خشتەیەدا دیارە:

<table>
<tr><th colspan="9">ڕستە</th></tr>
<tr><th colspan="3">(١) ڕستەی سادە</th><th colspan="6">(٢) ڕستەی ناسادە</th></tr>
<tr><td rowspan="2">(أ) سادەترین ڕستە</td><td rowspan="2">(ب) ڕستەی سادەی ئاسایی</td><td rowspan="2">(ج) ڕستەی سادەی فراوانكراو</td><td colspan="4">(أ) ڕستەی لێكدراو</td><td colspan="2">(ب) ڕستەی ئاوێتە (تێكەڵ)</td></tr>
<tr><td>هاوڕێك</td><td>پێچەوانە</td><td>هەڵبژاردە</td><td>لەڕێ</td><td>دیارخەری ناو</td><td>دیارخەری كار</td></tr>
</table>

خشتەی ژمارە (١)

## ((بەشی یەکەم))

### ڕستەی سادە

ڕستەی سادە ئەو ڕستەیەیە، کە تەنیا کارێك و پێویستییەکانی ئەو کارەی تێدایە(١). جۆری کارەکە ژمارە و ئەرکی توخمەکان(٢) دەستنیشان دەکا. واتە" ئەگەر کارەکە تێپەڕ بوو، دوو توخم وەردەگرێ: بکەر و بەرکار. ئەگەر کارەکە تێنەپەڕ بوو، یەك توخم وەردەگرێ، کە نیهادە، بەلاّم بە پێی جۆری تێنەپەڕەکە ئەرکی توخمەکە (نیهادەکە) دەگۆڕێ (عەبدوللا) ب(–١٣٢): لە تێنەپەڕی بکەریدا توخمەکە بە ئارەزووی خۆی کارەکە ئەنجام دەدا و دەتوانێ بیکا یا نەیکا، یا هەر نەبێ پێش و دوای بخا، لێرەدا توخمەکە دەبێتە بکەر. لە تێنەپەڕی بەرکاریدا توخمەکە بە ئارەزووی خۆی کارەکە ئەنجام نادا و بەسەریدا دەسەپێ و نە دەتوانێ خۆی لێ لادا و نە دەتوانێ پێش و دوای بخا، لێرەدا توخمەکە دەبێتە بەرکار. جیاوازی نێوان تێپەڕ و تێنەپەڕ ئەوەیە، تێنەپەڕ بکەر نادیاری لێ دروست ناکرێ. جیاوازی نێوان تێنەپەڕی بکەری و بەرکاریش ئەوەیە، تێنەپەڕی بەرکاری (بە هەمان واتای ڕەگەکە) فەرماندانی لێ دروست ناکرێ(٣).

لە ڕستەی سادەدا دەشێ، پتر لە ناوێك، ڕاناوێك، ئاوەڵناوێك، ئاوەڵکارێك ...هتد هەبێ، بەلاّم ناشێ پتر لە کارێك هەبێ. بۆیە ڕەگی کار بە کۆڵەکەی سەرەکی ڕستە دادەنێین و ڕستە بەوە پێناسە دەکەین، کە بریتییە لە ڕەگی کار و پێویستییەکانی.

هەڵبەتە ڕەگی کار مۆرفیمێکی بەندی(٤) تەوەرییە (سەرە)، خۆی پێویستییەکانی خۆی هەڵدەبژێرێ. بۆ نموونە: ئەو توخمانەی(*) ڕەگی چاوگی (شکان) هەڵیاندەبژێرێ، جیاوازن لەگەڵ ئەو توخمانەی ڕەگی چاوگی (دڕان) هەڵیاندەبژێرێ. وەك: (شووشە و دار و بەرد و پەنجەرە و پێنووس و ...

(*) مەبەست لە توخم (ڕەگەز–جێندەر–جنس) نییە، بەڵکو مەبەستمان (عنصر)ـە، بەلاّم بۆیە (کەس)مان بەکارنەهێنا، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە، توخمەکە مرۆڤ نەبێ و کەرەسەی بێ گیان یان گیانەوەر بێ، هەروەها (کەرەسە)مان بەکارنەهێنا، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە، توخمەکە مرۆڤ بێ و کەرەسە نەبێ.

دەشکێن.)، بەڵام (پەڕۆ و جل و کاغەز و نایلۆن و ... دەدڕێن). کەواتە، کەرەسەی (شکان) دەبێ، سیمای ڕەقی و ورد و خاشبوون و دەنگی شکانی هەبێ، بەڵام کەرەسەی (دڕان) دەبێ، سیمای تەنکی و نەرمی و دوو لەت بوون و دەنگی دڕانی هەبێ. بۆیە ناتوانین، بڵێین: پەڕۆ شکا و شووشە دڕا.

پێویستییەکانی ڕەگی کاریش دوو جۆرن:

١ــ پێویستییە سەرەکییەکان: ئەو پێویستییانەن، کە زۆرەکین (إجباري – Obligatory) و ناتوانرێ، لابدرێن. ڕەگی کار تەنیا دوو پێویستیی سەرەکی هەیە: ( مۆرفیمە بەندەکانی کات ) کە بە درشتی کاتی ڕوودانی کارەکە دەردەخەن. ( ڕاناوە لکاوەکان ) تەنیا ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ بکەر و بەرکاری ڕستەکە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە سەرجەم پێویستییە سەرەکییەکان دەگرێتە خۆی:

| پێویستییە سەرەکییەکانی ڕستە | | | | |
|---|---|---|---|---|
| تەنیا ڕاناوە لکاوەکانی توخمی بکەر، بەرکار | | مۆرفیمەکانی کات | | |
| دەستەی یەکەم ((ڕێککەوتن)) | دەستەی دووەم ((خاوەنی)) | مۆرفیمەکانی کاتی ڕابوردوو | کاتی ڕانەبوردوو | |
| | | | ئێستا | داهاتوو |
| م، ی، Ø ، ین، ن، ن | م،ت،ی، مان، تان، یان | ا، د، ت، ی، و | ە / Ø | ێ / Ø |

خشتەی ژمارە (٢)

٢ــ پێویستییە لاوەکییەکان: ئەو پێویستییانەن، کە خۆشەکین (إختياري – Optional) و دەتوانرێ، لابدرێن. جگە لە پێویستییە سەرەکییەکان، هەموو بەشەکانی ئاخاوتن (ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، ڕاناو، ...هتد)ی ناو ڕستە دەگرنەوە. بۆ نموونە، ئەگەر ڕستەی ژمارە (١)ی خوارەوە کورت بکەینەوە بۆ ڕستەی ژمارە (٢)، سیمای ڕستەی هەر دەمێنێ و لە ڕێزمانیی ڕستە دەرناچێ:

(١) تۆ دوێنێ بەم گەرمایە و لەو شوێنە قەڵەباڵغەدا منت لە چاوەڕوانیدا کوشت.

(٢) کوشتمت.

ڕستەی دووەم بەم شێوەیە شی دەکرێتەوە، کە بە پێی یاساکانی گوێزانەوە فرێزی کارییەکە پێش فرێزە ناوییەکە کەوتووە:

| فرێزی کاری | | فرێزی ناوی | |
|---|---|---|---|
| ڕەگی کار | مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاوی بەرکار | ڕاناوی لکاوی بکەر |
| کوش | ت | م | ت |

خشتەی ژمارە (٣)

جۆرەکانی ڕستەی سادە:

وەك لە خشتەی ژمارە (١)دا خراوەتە ڕوو، دەتوانرێ، ڕستەی سادە دابەشی ئەم سێ جۆرەی خوارەوە بکرێ:

**یەکەم – سادەترین ڕستە:**

سادەترین ڕستەی کوردی ئەو ڕستەیەیە، کە لە تاکە وشەیەك پێك هاتبێ. ئەو تاکە وشەیە لە ئاستی وشەسازیدا وشەیە، بەڵام لە ئاستی ڕستەسازیدا دەبێتە ڕستە، چونکە هەموو پێویستییەکانی ڕستەی تێدایە، وەك: ڕەگی کار و هەردوو پێویستییە سەرەکییەکەی، کە مۆرفیمی کات و مۆرفیمی توخمن (ڕاناوی لکاوی بکەر، بەرکار)، مۆرفیمەکانی کات و توخمیش دەشێن، هەریەکەیان مۆرفیمێك بن یان پتر(*). دەتوانرێ، یاسای دارشتنی سادەترین ڕستە کوردییەکان بە پێی جۆری ڕەگی کار و دەمکاتەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان بکرێ:

*لە کاری تێنەپەڕدا:*

ئەگەرچی دوو جۆر کاری تێنەپەڕمان هەیە: بکەری و بەرکاری، بەڵام یاسای دارشتنی ڕستەیان(کوردستان{ب}–٥١) وەکو یەکە، تەنیا جیاوازییان

(*) ئەم پێناسەیە ڕاستەوخۆ باسی ئەو وشانە ناکا، کە وەڵامی ڕستەی پرسیارین، وەك: بەڵێ، نەخێر، ........، چونکە ئەم ڕستە سادە یەك وشەییانە پێویستییان بە شیکردنەوەی ئاستی سەرەوە و ناوەوەی پرسیار و وەڵامەکە هەیە، بە ڕەچاوکردنی تیۆری بەرهەمهێنان و گوێزانەوە. بڕوانە لاپەڕە (١٢).

لەوەدایە، فرێزی ناوی (نیهاد) لە ڕستەی تێنەپەڕی بکەری دەبێتە بکەر و لە ڕستەی تێنەپەڕی بەرکاری دەبێتە بەرکار. لە کاری تێنەپەڕیشدا هەرگیز ڕستەی بکەر نادیار دروست ناکرێ.

بە پێی دەمکاتەکان یاسای داڕشتنی سادەترین ڕستە تێنەپەڕەکان بەم شێوەیەی خوارەوەن:

١- کاتی ڕابوردوو: بە پێی ژمارە و جۆری مۆڕفیمەکانی کات چەند جۆرێکی هەیە:

ڕابوردووی سادە: تەنیا یەك مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی تیادایە(وریا-١٢٧).

یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆڕفیمی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بکەری | یەکەمی تاك | گەڕام | گـەڕ | ا | م | بکەر |
| | دووەمی تاك | هاتی | هـا | ت | ی | |
| | سێیەمی تاك | فڕی | فـڕ | ی | Ø | |

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆڕفیمی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بەرکاری | یەکەمی کۆ | خزیین | خـز | ی | ین | بەرکار |
| | دووەمی کۆ | مردن | مـر | د | ن | |
| | سێیەمی کۆ | بوون | بـ | وو | ن | |

<u>ڕابوردووی بەردەوام</u>: جگە لە مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو مۆرفیمێکی کاتی ئێستای وەکو پێشگر تیادایە. ئەوەی شایانی باسە، تەنیا مۆرفیمی کاتی ئێستا لە مۆرفیمەکانی کات دەتوانێ، ببێتە پێشگر (ـە)، کە ڕەنگە دەنگی (د)ی وەك دیاردەیەکی دەنگسازی کوردی بکەوێتە پێش و ئەگەر ئەو دەنگە نەبوو وەك هەر دەنگە بزوێنێکی سەرەتا دەنگی هەمزە (ئـ)ی لە پێش دروست دەبێ. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ئێستا | ڕەگی کار | ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بکەری | یەکەمی تاک | دەسووڕاین | (د)ە | ســووڕ | ا | ین | بکەر |
| | دووەمی تاک | دەفڕیی | (د)ە | فــڕ | یـ | ی | |
| | سێیەمی تاک | دەچوو | (د)ە | چـ | وو | Ø | |

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ئێستا | ڕەگی کار | ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بەرکاری | یەکەمی کۆ | دەخنکاین | (د)ە | خنک | ا | ین | بەرکار |
| | دووەمی کۆ | دەکەوتن | (د)ە | کـەو | تـ | ن | |
| | سێیەمی کۆ | دەتۆپین | (د)ە | تـۆپ | یـ | ن | |

رابوردووی تەواو: لە ڕابوردووی تەواودا ئەگەرچی مۆڕفیمی کاتی ڕابوردوو و ئێستا وەکو پاشگر بە دوای یەکدا دێن، بەڵام (و)ی مۆڕفیمی ئاوەڵناوی کراو(٥) دەکەوێتە نێوانیان. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆڕفیمی ڕابوردوو | مۆڕفیمی ئاوەڵناو | مۆڕفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بکەری | (١) تاك | وەستاوم | وەست | ا | و | Ø | م | بکەر |
| | (٢) تاك | هاتووی | هـا | ت | و | Ø | ی | |
| | (٣) تاك | دانیشتووە | فـڕ | ی | وو | ە | Ø | |

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆڕفیمی ڕابوردوو | مۆڕفیمی ئاوەڵناو | مۆڕفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بەرکاری | (١) کۆ | ماوین | مـ | ا | و | Ø | ین | بەرکار |
| | (٢) کۆ | گۆڕاون | گۆڕ | ا | و | Ø | ن | |
| | (٣) کۆ | مردوون | مر | د | وو | Ø | ن | |

بەردەوام تێبینی ئەوە دەکرێ، (ە)ی مۆڕفیمی کاتی ئێستا لە بەر ئەوەی بزوێنێکی کورت و ناسکە و دەرنەکەوتنی نابێتە هۆی واتا گۆڕین، ئەگەر ڕاناوی بە دوادا هات دەسوێ، بەڵام لە کەسی سێیەمی تاکدا لەبەر ئەوەی ڕاناو دەرناکەوێ، (ە)ی مۆڕفیمی کاتی ئێستا دەردەکەوێ. ئەم دیاردەیە بە هەمان شێوە لە ڕستەی کاتی ئێستا، فەرماندان، ... هەیە.

ڕابوردووی دوور: لە ڕابوردووی دووردا دوو مۆڕفیمی کاتی ڕابوردوو لە دوای ڕەگی کار دێن و (بـ)ی ڕەگی کاری (بوو)ی یاریدەدەر دەکەوێتە نێوانیان.

مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کاری سەرەکی و یەکێکە لەمانە: (ا/د/ت/ی/و)، بەڵام مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی دووەم (وو)ە و دەگەڕێتەوە بۆ کاری (بوو)ی یاریدەدەر. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیە:

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕەگی (بوون) | (وو)ی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بکەری | (١) تاك | هەستابووم | هەست | ا | بـ | وو | م | بکەر |
| | (٢) تاك | نوستبووی | نووس | ت | بـ | وو | ی | |
| | (٣) تاك | سووڕابوو | سووڕ | ا | بـ | وو | Ø | |

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕەگی (بوون) | (وو)ی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بەرکاری | (١) کۆ | شکابووین | شک | ا | بـ | وو | ین | بەرکار |
| | (٢) کۆ | کەوتبوون | کەو | تـ | بـ | وو | ن | |
| | (٣) کۆ | بووبوون | بـ | وو | بـ | وو | ن | |

لێرەدا ئەگەرچی دوو ڕەگی کار هەن، بەڵام لەبەر ئەوەی هەردووکیان یەك توخمیان (ڕاناوی لکاو) هەیە بە یەك ڕستەی سادە دادەنرێ:

بووبووم (یەك ڕستەی سادەیە).

نەبووبووم (یەك ڕستەی سادەیە).

بووم و نەبووم (دوو ڕستەی سادەن).

لە یەکەم و دووەمدا تەنیا یەك (م)ی ڕاناوی لکاویان هەیە، بەڵام لە سێیەمدا، دوو (م)ی ڕاناو هەن.

<u>ڕابوردووی خۆزگەیی</u>: لە ڕابوردووی خۆزگەییدا دوو مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو لە دوای ڕەگی کار دێن و (ب)ی ڕەگی کاری (بوو)ی یاریدەدەر دەکەوێتە نێوانیان. مۆرفیمی کاتی ڕابوردووی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کاری سەرەکی و یەکێکە لەمانە: (ا/د/ت/ی/و)، بەڵام مۆرفیمی کاتی ڕابوردووی دووەم هەردەم (ا)یە و لە بری ئەوەی وەکو ڕابوردووی دوور بواری ڕوودانی کارەکە دوور بخاتەوە، چەمکی ڕوونەدانی (خۆزگەیی) پێ دەبەخشێ. یاسای دارشتنی بەم شێوەیەیە:

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕەگی (بوون) | (ا)ی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بکەری | (١) تاک | خەوتبام | خەو | ت | بـ | ا | م | بکەر |
| | (٢) تاک | هەستابای | هەستـ | ا | بـ | ا | ی | |
| | (٣) تاک | فڕیبا | فڕ | ی | بـ | ا | Ø | |

| جۆر | ژمارەی کەس | ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕەگی (بوون) | (ا)ی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕی بەرکاری | (١) کۆ | گریاباین | گریـ | ا | بـ | ا | ین | بەرکار |
| | (٢) کۆ | هەبووبان | هەبـ | وو | بـ | ا | ن | |
| | (٣) کۆ | پسابان | پسـ | ا | بـ | ا | ن | |

له ڕابوردووی خۆزگەییدا دەتوانرێ، بە پێی پترکردنی مۆرفیمـەکانی کـات چەند جۆرێکی دیکە دروست بکرێن:

١– دووبارەکردنەوەی مۆرفیمی (ا)ی کـاتی ڕابـوردوو و پترکردنـی مـۆرفیمی (ە)ی کاتی ئێستا، کە ڕابوردووی نزیکی خۆزگەیی دروست دەکا و بـواری چـالاکی کارەکە لە ڕابوردووی سادە درێژ دەکاتەوە تا ئێستا. لەم بـارەدا پێویـستیمان بـە (یـ) نـاوبڕ دەکـا لـە نـێوان دوو بزوێـنی (ا)ی مـۆرفیمی کـاتی ڕابـوردوو و (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستا.

٢– کـاتێ مـۆرفیمی (وو)ی کـاتی ڕابـوردوو بخرێـتە دوای (بـ)ی ڕەگـی (هە)بوون، واتە" فۆرمی خاڵی یەکەم لە ڕابوردووی نزیکـی خۆزگـەیی دەگـۆڕێ بـۆ ڕابوردووی دوور و بواری چالاکی کارەکـە لـە ڕابـوردووی دوور درێـژ دەکاتـەوە تـا ئێستا. لەم بارەشدا پێویستیمان بە ناوبڕەکەی سەرەوە هەیە. ئـەم جۆرەیـان لـە ڕووی کارەکییەوە کەمتر بەکاردێ و ڕێژەی بەکارهـێنانی هـەر جۆرێـکیان بـە پـێی ناوچە و شێوەزارەکان دەگۆڕێ و ڕەنگە لە هەنـدێ ناوچـەدا جگـە لەمانـە هەنـدێ هاوشێوەی تر بەکاربێن.

| ڕابوردووی ئاسایی خۆزگەیی | ڕابوردووی نزیکی خۆزگەیی | ڕابوردووی دووری خۆزگەیی |
|---|---|---|
| خەوتبام | (بـ)خەوتبامایە | خەوتبوو(ا)مایە |
| هەستابای | (بـ)هەستابایتایە | هەستابوو(ا)یتایە |
| فڕیباØ | (بـ)فڕیباØیە | فڕیبوواØیە |
| گریابایـن | (بـ)گریابایـنایە | گریابووایـنایە |
| هەبووبان | (بـ)هەبووبانایە | هەبووبووانایە |
| پسابان | (بـ)پسابانایە | پسابووانایە |

لە ڕستەی تێکەڵدا، ئەم جۆرەیان ڕۆڵی ڕستەی مـەرجی دەگـێڕێ (بڕوانـە بەشی چوارەم ڕستەی ئاوێتە).

٢- کاتی ئێستا: مەبەست لە کاتی ئێستا ئەو ڕستانەن، کە تەنیا مۆرفیمی کاتی ئێستایان تیادایە. بواری ڕوودانی ئەم جۆرە کارانە دەمی ئاخاوتنە(**سعید-٣٩**)، واتە" لە دەمی ئاخاوتندا ڕوودانی کارەکە لە ئارادایە و ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ، کە پێشتر کارەکە ڕووی نەداوە یان دواتر ڕوونادا، چونکە مەبەستی ڕستەکە تەنیا کاتی ئێستایە. ئەم جۆرە ڕستانە تەنیا لەگەڵ ڕەگی {هە(بوون)} دروست دەبن. لەم بارەدا توخم (ڕاناو) دەبێتە بەرکار، چونکە ڕەگی {هە(بوون)} تێنەپەڕێکی بەرکارییە. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| ڕستە | فرێزی ناوی | ڕەگی (هە)بوون | مۆرفیمی ئێستا | ڕاناو |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| کوردم | کورد | Ø | Ø | م |
| پیاوی | پیاو | Ø | Ø | ی |
| زیرەکە | زیرەك | Ø | ە | Ø |
| هەین | Ø | +(هە)ی ئەرێ Ø | Ø | ین |
| ئێوەن | ئێوە | Ø | Ø | ن |

لەم جۆرە ڕستانەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، کە ڕەگی (هە)بوون دەرناکەوێ، چونکە ئەگەر دەرکەوێ، ڕستەکە لە ڕستەی هەواڵدان دەگۆڕێ بۆ ڕستەی داخوازی، یان لە کەسی سێیەمی تاکدا ڕستەکە دەبێتە ڕستەی فەرماندان(٣) بۆ کەسی دووەمی تاك.

دەشێ، لە (هەبوون)دا ڕاناوێکی خاوەنی دوای فرێزە ناوییەکە بێ، بەڵام ئەم ڕاناوە ڕۆڵی بکەری و بەرکاری نابینێ، بەڵکو تەنیا ڕۆڵی دیارخەری (خاوەنێتی) دەبینێ. واتە" ئەو توخمەی لە ئارادا هەیە، خاوەنداره و لێرەدا کارەکە هەرگیز نابێتە تێپەڕ. ئەگەر فرێزە ناوییەکە بە ئاشکرا دەرنەکەوت، ڕاناوەکە دەکەوێتە دوای پێشگری (هە)، کە فۆرمی ئەرێیە نەك فرێزی ناوی(عەبدولوەهاب -٣٩ -٤٣). وەك:

| ڕستە | ف ن | پێشگر | دیارخەر | ڕەگ | مۆرفیمی ئێستا | ڕاناو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەمە | Ø | هە | مـ | Ø | ە | Ø | |
| هەتانە | Ø | هە | تان | Ø | ە | Ø | |
| هەیە | ـ | هە | ـ | Ø | (یـ) ناوبڕ+ ە | Ø | |
| هەیەتی | ـ | هە | ← | Ø | (یـ) ناوبڕ+ ە | (تـ)ناوبڕ+ Ø | ی |

← ← ← ←
←

٣- کاتی داهاتوو: مەبەست لە کاتی داهاتوو ئـەو ڕسـتانەن، کـە تـەنیا مـۆڕفیمی کـاتی داهاتوویـان تیادایـە. سـادەترین ڕسـتە (ڕسـتەی یـەك وشـەیی) لـەم جـۆرە ڕستانە بەوە دروست دەبێ، کە (بـ)ی ڕەگی (بوون) ببێتە پێشگری ڕەگی کارێکی سەرەکی و (ێ/Ø)ی مۆڕفیمی کاتی داهاتوو و مۆڕفیمی توخم (ڕاناوی لکاو) بـبن بە پاشگر. لێرەدا ئەگەرچی (بـ)ی ڕەگی (بوون) واتای ئارایی خۆی هەر دەمـێنێ، بـەڵام سـیمای ڕەگـی کـاری نامـێنێ، چـونکە مـۆڕفیمی کـات و ڕانـاوی بـە دوادا نەهاتوون، بۆیە لە بری ڕەگی (بـوون) دەتـوانرێ پـێی بـوترێ: مـۆڕفیمی ئـارایی. بواری چالاکی ئـەم جـۆرە ڕسـتانە، دوای کـاتی ئێـستایە، واتـە" کـاتی داهـاتووە. وەك:

| ڕستە | مۆڕفیمی ئارایی | ڕەگی کار | مۆڕفیمی داهاتوو | ڕاناو | |
|---|---|---|---|---|---|
| بگەڕێم | بـ | گەڕ | ێـ | م | بکەر |
| بسووڕێی | بـ | سووڕ | ێـ | ی | |
| بـ(هـ)ـێ | بـ | (هــ) | ـێ | Ø | |
| بشلەژێین | بـ | شـلەژ | ێـ | ین | بەرکار |
| دا(بـ)وەشێن | (بـ) | دا–وەش | ێـ | ن | |
| بــمــرن | بـ | مــر | Ø | ن | |

لەم فۆڕمەدا چەند تێبینییەك بەرچاو دەكەوێ:

أ- لە ڕووی یاسای داڕشتنەوە وەكو فۆڕمەكانی ڕابوردوو هیچ جیاوازییەك لە نێوان تێنەپەڕی بكەری و بەركاریدا نابینرێ، تەنیا ئەوە نەبێ، توخمی تێنەپەڕی بكەری دەبن بە بكەر و توخمی تێنەپەڕی بەركاری دەبن بە بەركار.

ب- ئەگەر پێشگرێك لە پێش (بـ)ی مۆرفیمی ئارایی هات، بە زۆری مۆرفیمی ئارایی دەسوێ.

ج- مۆرفیمی (ێ)ی كاتی داهاتوو لە چاوگە تێنەپەڕە (ا)ییەكاندا لە هەموو كەسەكاندا دەردەكەوێ، بەڵام لە چاوگە تێنەپەڕەكانی تر مۆرفیمی (ێ)ی كاتی داهاتوو تەنیا لە كەسی سێیەمی تاكدا دەردەكەوێ، چونكە ڕاناوی لكاو سفرە.

٣- كاتی ڕانەبوردوو: كاتی ڕانەبوردوو هەردووكاتی ئێستا و داهاتوو دەگرێتەوە (بڕوانە خشتەی ژمارە -٢-). مۆرفیمی (ە)ی كاتی ئێستا وەكو پێشگر دەكەوێتە پێش ڕەگی كار و لەبەر ئەوەی بزوێنە و لە سەرەتای وشەیە دەنگی (ئـ) هەمزەی لە پێش دروست دەبێ، لە هەندێ ناوچەشدا دەنگی (د) شوێنی هەمزەكە دەگرێتەوە، بەڵام مۆرفیمی (ێ/Ø)ی كاتی داهاتوو وەكو پاشگر دەكەوێتە دوای ڕەگی كار. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیە:

| ڕستە | مۆرفیمی ئێستا | | ڕەگی كار | مۆرفیمی داهاتوو | ڕاناو | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دەچم | (د/ئـ) | ە | چـ | Ø | م | بكەر |
| دەڕۆی | (د/ئـ) | ە | ڕۆ | Ø | ی | |
| دەنوێ | (د/ئـ) | ە | نوو | ێ | Ø | |
| دەترسێین | (د/ئـ) | ە | ترس | ێ | ین | بەركار |
| دەدۆڕێن | (د/ئـ) | ە | دۆڕ | ێ | ن | |
| دەمرن | (د/ئـ) | ە | مر | Ø | ن | |

لە فۆڕمی ئەم کاتەشدا ئەم تێبینییانە سەرنج ڕادەکێشن:
أ– وەکو تێبینی سێیەم لە کاتی داهاتوو مۆڕفیمی (ێ)ی کاتی داهاتوو لە چاوگە تێنەپەڕە (ا)بیەکاندا لە هەموو کەسەکاندا دەردەکەوێ، بەڵام لە چاوگە تێنەپەڕەکانی تر مۆڕفیمی (ێ)ی کاتی داهاتوو تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێ، چونکە ڕاناوی لکاو سفرە.
ب– چاوگی (ڕۆیشتن) یەکێکە لەو چاوگانەی(٦) لە کەسی سێیەمی تاکیش مۆڕفیمی (ێ)ی کاتی داهاتووی دەرناکەوێ.
ج– لە چاوگی (هاتن)دا (ها)ی ڕەگی کار دەسوێ و لە هەموو کەسەکاندا (ێ)ی مۆڕفیمی کاتی داهاتوو دەردەکەوێ:
هاتن ← دە(Ø)ێم ← دە(Ø)ێی ← دە(Ø)ێØ ← دە(Ø)ێین ← دە(Ø)ێن ← دە(Ø)ێن

<u>لە کاری تێپەڕدا:</u>

تەنیا جیاوازی لە کاری تێپەڕدا ئەوەیە، کە کاری تێپەڕ دوو توخم وەردەگرێ، کە بکەر و بەرکارن (یوسف–٥٧). لە ڕابوردوودا دەستەی خاوەنی دەبێتە بکەر و دەستەی ڕێککەوتن دەبێتە بەرکار، بەڵام لە ڕانەبوردوودا بە پێچەوانە.

بە پێی دەمکاتەکان یاسای داڕشتنی سادەترین ڕستە تێپەڕەکان بەم شێوەیەی خوارەوەن:
٤– کاتی ڕابوردوو: بە پێی ژمارە و جۆری مۆڕفیمەکان چەند جۆرێکی هەیە:
<u>*ڕابوردووی سادە*</u>: تەنیا یەك مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی تیادایە. لەم جۆرەدا ڕاناوی بەرکار لە دەستەی ڕێککەوتنە و بە زۆری کەسی سێیەمی تاك وەردەگرێ، کە سفرە و دەرناکەوێ، هەندێ جاریش ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك یان سێیەمی کۆ دەبنە بەرکار، بەڵام ڕاناوەکانی تر لەم ئەرکەدا ئاسایی نین و سرکن. ڕاناوی بەرکاریش دەکەوێتە پێش ڕاناوی بکەر، کە لە دەستەی خاوەنییە. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیە:

| ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕاناوی بەرکار | ڕاناوی بکەر |
|---|---|---|---|---|
| کێڵام | کێڵ | ا | Ø | م |
| گرتمت | گر | تـ | مـ | ت |
| خواردمی | خوار | د | مـ | ی |

*ڕابوردووی بەردەوام*: لەم جۆرەدا تەنیا جیاوازی لەگەڵ تێنەپەڕی بەرکاری ئەوەیە، ڕاناوی خاوەنی دەبێتە بکەر و دەکەوێتە دوای مۆرفیمی کاتی ئێستا و پێش ڕەگی کار، بە مەرجێ هیچ پێشگرێکی تر لە پێش مۆرفیمی کاتی ئێستا نەبێ. ئەگەر هەر پێشگرێکی وەك (نە، هەڵ، دا، ڕا، سەر، ژێر...) کەوتە پێشەوە، ڕاناوی بکەرەکە باز دەدا بۆ دوای ئەو. یاسای دارشتنی بەم شێوەیە:

| ڕستە | مۆرفیمی ئێستا | | ڕاناوی بکەر | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕاناوی بەرکار |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دەیناردین | (د/ئـ) | ە | یـ | نار | د | ین |
| دەمناشتن | (د/ئـ) | ە | مـ | ناشـ | تـ | ن |
| دەیاندزی | (د/ئـ) | ە | یان | دز | ی | Ø |

*ڕابوردووی تەواو*: لە ڕابوردووی تەواودا (و)ی مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو(٧) دوای مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو دێ و ئینجا ڕاناوی لکاوی بکەر دێ کە لە دەستەی خاوەنییە و دوای ئەوە (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستا دێ، دوای ئەویش ڕاناوی لکاوی بەرکار دێ، کە لە دەستەی ڕێککەوتنە و لەم جۆرەدا بە زۆری هەر کەسی سێیەمی تاك ئەم ڕۆڵە دەبینێ. مۆرفیمی کاتی ئێستاش وەك ڕەفتارە ئاساییەکەی خۆی تەنیا کاتێ کەسی سێیەمی تاکی بە دوادا دێ، کە لە دەستەی

ڕێککەوتن سفرە، دەردەکەوێ و لە ڕاناوەکانی تر دەرناکەوێ. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | مۆرفیمی ئاوەڵناو | ڕاناوی بکەر | مۆرفیمی ئێستا | ڕاناوی بەرکار |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هێناومە | هێن | ا | و | مـ | ە | Ø |
| کوشتوویانن | کوشـ | تـ | وو | یانـ | Ø | ن |
| گرتوویەتی | گر | تـ | وو | یـ(ناوبڕ) | ە | Ø تـ(ناوبڕ) ی |

← ← ←

لە (گرتوویەتی) تێبینی ئەوە دەکرێ، کە لە بنەڕەتدا دەبێ (گرتوویە)بێ(٨)، بەڵام لە بەر ئەوەی لە فۆڕمی (گرتوویە)دا ئەرکی (یـ) لە ڕاناوی بکەر دەگۆڕێ بۆ دەنگێکی ناوبڕی نێوان دوو بزوێنی (وو)ی ئاوەڵناوی کراو و (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستا، بۆیە وەرچەرخانێك ڕوو دەدا و (ی)ی ڕاناوی بکەر دەچێتە کۆتایی کارەکە، لەم بارەدا دیسان پێویستی بە ناوبڕێکی تر دەبێ لە نێوان خۆی و (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستای پێشی، چونکە گۆکردنی فۆڕمی (گرتوویەی) ئاسان نیە، بە تایبەتی لە ڕەوتی ئاخاوتندا، ئەمجارە لە بری (ی) دەنگی (تـ) دەبێتە ناوبڕی نێوان ئەم دوو بزوێنە.

<u>*ڕابوردووی دوور:*</u> لە ڕابوردووی دووردا وەکو ڕابوردووی سادە تەنیا جیاوازیی لەگەڵ تێنەپەڕی بەرکاریدا ئەوەیە، ڕاناوی بکەر لە دەستەی خاوەنی دەکەوێتە کۆتایی ڕستەکە، واتە" دوای ڕاناوی بەرکار لە دەستەی ڕێککەوتن. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| ڕستە | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕەگی (بوون) | (وو)ی ڕابوردوو | ڕاناوی بەرکار | ڕاناوی بکەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نووسیبووم | نووسـ | یـ | بـ | وو | Ø | م |
| ناردبوونی | نار | د | بـ | وو | نـ | ی |
| گرتبوومیان | گر | ت | بـ | وو | مـ | یان |

*ڕابوردووی خۆزگەیی:* ئەگەر کارەکە تێپەڕ بێ، یاسای داڕشتنی سادەترین ڕستەی کوردی لە ڕابوردووی خۆزگەییدا بەم شێوەیەیە:

| ڕستە | مۆرفیمی ئارازی | ڕاناوی بکەر | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | دووبارەی ئارازی | (ا)ی کاتی ڕابوردوو | ڕاناوی بەرکار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بتگرتبام | بـ | تـ | گر | تـ | بـ | ا | م |
| بیانناسیبابین | بـ | یانـ | ناسـ | یـ | بـ | ا | ین |
| بمانخوێندبا | بـ | مانـ | خوێنـ | د | بـ | ا | Ø |

لەم فۆڕمەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، کە بواری ڕوودانی کارەکە تەنیا لە ڕابوردوودایە. بەڵام ئەگەر مۆرفیمی کاتی ئێستای بخرێتە سەر، بواری ڕوودانەکە لە ڕابوردوودا درێژ دەبێتەوە بەرەو کاتی ئێستا، بەڵام بە زۆری مۆرفیمی ئاراییەکە دووبارە نابێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

| ڕسته | مۆرفیمی ئارایی | ڕاناوی بکەر | ڕەگی کار | مۆرفیمی ڕابوردوو | ڕاناوی بەرکار | (ا)ی کاتی ڕابوردوو | ناوبڕە دەنگ | مۆرفیمی ئێستا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **بتگرتمایه** | بـ | تـ | **گر** | تـ | م | ا | یـ | ـە |
| بیانناسیینایه | بـ | **یانـ** | ناسـ | یـ | ین | ا | یـ | ـە |
| بـمانخوێندایه | بـ | مانـ | خوێنـ | د | Ø | ا | **یـ** | ـە |

لــەم فۆڕمـــەدا شـــێوەی ڕابـــوردووی دووری خۆزگـــەیی (بتگرتبوومایـــە، بمانخوێندبووایە ...) کەمتر بەکاردێ.

٥- کاتی ئێستا: لە کاری تێپەڕدا ڕستەی کاتی ئێستای لێ دروست ناکرێ، مەگەر بە شێوەی فەرماندان نەبێ، کە لە بەشی چوارەمدا باسی دەکەین.

١- کاتی داهاتوو: سادەترین ڕستەی کاتی داهاتوو لە کاری تـێپەڕدا تـا ڕادەیـەك لە کاری تێنەپەڕی بکەری دەچێ، لەگەڵ جیاوازی ئـەوەی ڕانـاوی بـەرکار لـە دەستەی خاوەنی دەکەوێتە دوای (بـ)ی مۆڕفیمی ئارایی (ڕەگی بوون). وەك:

| ڕسته | مۆڕفیمی ئارایی | ڕاناوی بەرکار | ڕەگی کار | مۆڕفیمی داهاتوو | ڕاناوی بکەر |
|---|---|---|---|---|---|
| **بیگێڕین** | بـ | یـ | گێڕ | Ø | ین |
| بیانسووتێنێ | بـ | یانـ | سووتێن | ێـ | Ø |
| بتانبینم | بـ | تانـ | بین | Ø | م |

لەم فۆڕمەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، لـەو چـاوگانەی تـێپەڕێنراون(٩) دوو مـۆڕفیمی کـاتی داهـاتوو هـەن، یەکـەمیان: مۆڕفیمـە ڕەسـەنەکەی پـێش (ن)ی چـاوگە تێنەپەڕەکە، کە ئێستا ناتوانێ، ڕۆڵی کات بگێڕێ، چـونکە (ن)ی چـاوگی هـەر بـە دواوەیە و دووەمیـان: ئـەو مۆڕفیمـەی کـاتی داهـاتوو کـە دەکەوێـتە نـێوان (ن)ی

چاوگە ڕەسەنەکە و مۆرفیمی ڕاناوی لکاو (تـوخم)، کـە ئەمـەیان چـەمکی کـاتی داهاتوو دەبەخشێ.

هەروەها تێبینی ئەوەش دەکرێ کە مۆرفیمی (ێ)ی کاتی داهاتوو تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێ، چونکە ڕاناوی لکاو سفرە. تـەنیا مەگـەر چاوگەکە ناوێزە بێ، وەك: (بلێم /ی / Ø / ین .. ، بمەوێØ / بتەوێØ / بیەوێ Ø / بمانەوێØ ...هتد)، تەنانەت لە چاوگی ویستن ڕۆڵـی دەسـتە ڕاناوەکـانیش دەگۆڕێ.

ئەو چاوگانەش کە ڕەگەکانیان کۆتایی بە بزوێنە کورتەکەی (ە) دێ و لـە کەسی سـێیەمی تاکـدا درێـژ دەبـێتەوە بـۆ بزوێـنە درێـژەکەی (ا)، لـە بـەر گرانـی دەربڕین لە کەسی سێیەمیشدا (ێ)ی کاتی داهاتوو دەرناکـەوێ، وەك: (بکـاØ ، بخواØ ، بداØ ، بباØ ، بشواØ ، دابژواØ ، بخاØ .).

هەندێ چاوگیش هەن، لـە ئـەنجامی گۆڕانکـاری کـۆنی مـێژوویی (ا)یـێکی مۆرفیمی ڕابوردووی کۆنیـان لـە چـاوگەکاندا ماوەتـەوە و ئەگەرچـی ئێـستا ڕۆڵـی نەماوە، چونکە زۆربەیان (د)ی مۆرفیمی ڕابوردوویان بۆ دروست بـووە، بـەڵام لـە ڕانەبوردوودا دەبێتەوە (ێ)ی داهاتوو و کە ئەم (ێ)یەش ئێـستا چـەمکی داهـاتوو نابەخـشێ، بـەڵام ڕەفتـارە کۆنەکـەی گـۆڕان هـەر دەنوێـنێ، وەك: (نـاردن ← دەنێرێØ ، ژمـاردن ← دەژمـێرێØ ، سـپاردن ← دەسـپێرێØ ، بـژاردن ← دەبژێرێØ ، چاندن ← دەچێنێØ ، ..هتد.

٢- کاتی ڕانەبوردوو: کاتی ڕانەبوردوو هەروەکو لە تێنەپەڕدا هەردووکاتی ئێـستا و داهـاتوو دەگرێـتەوە (بڕوانـە خـشتەی ژمـارە دوو). مـۆرفیمی (ە)ی کـاتی ئێستا وەکو پێشگر دەکەوێتە پێش ڕەگـی کـار و لەبـەر ئـەوەی بزوێـنە و لـە سەرەتای وشەیە دەنگی (ئـ) هـەمزەی لـە پـێش دروسـت دەبـێ، لـە هەنـدێ ناوچەشدا دەنگی (د) شوێنی هەمزەکە دەگرێتەوە، بەڵام مـۆرفیمی (ێ/Ø)ی کاتی داهاتوو وەکو پاشگر دەکەوێتە دوای ڕەگـی کـار، بـەڵام جیـاوازی کـارە تێپەڕەکان لەوەدایە، ڕاناوی لکاوی خاوەنی دەبێتە بـەرکار و دەکەوێـتە دوای مۆرفیمی کاتی ئێستا و پێش ڕەگی کار، ئەگەر هیچ پێشگرێکی تری لە پـێش نەبێ. یاسای داڕشتنی بەم شێوەیەیە:

| ڕستە | مۆرفیمی ئێستا | | بەرکار | ڕەگی کار | مۆرفیمی داهاتوو | بکەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دەیکوژم | (د/ئـ) | ە | یـ | کوژ | Ø | م |
| دەمگری | (د/ئـ) | ە | مـ | گر | Ø | ی |
| دەیانهێنێ | (د/ئـ) | ە | یانـ | هێن | ێ | Ø |

لە فۆڕمی ئەم کاتەشدا وەکو تێبینییەکانی سەرەوەی کاتی داهاتوو مۆڕفیمی (ێ)ی کاتی داهاتوو بە هەمان شێوە ڕەفتار دەکا.

لە ڕاستیدا لە بچووکترین ڕستەی سادە (یا ڕستەی سادەی یەك وشەیی) مۆڕفیمە سەربەخۆکانی فرێزە ناوییەکان لە ئاستی سەرەوە دەر ناکەون و تەنیا وشەیەك دەمێنێتەوە و نوێنەرایەتی ڕستەکە دەکا، بۆیە جگە لە جۆری کارە گەردانکراوەکان جۆرێکی تری بچووکترین ڕستەی سادەش دەبیسترێ، کە ئەویش ئەو تاکە وشانەیە، کە لە وەڵامی ڕستە پرسەکان بەکاردێن. وەك:

| ڕستەی پرس | جۆری پرسیار | بچووکترین ڕستەی وەڵامی پرس |
|---|---|---|
| ئایا چووی بۆ بازاڕ؟ | دەربارەی گشتی | بەڵێ. / نەخێر. / ئا. / نا. / م. / چ. |
| کێ چوو بۆ بازاڕ؟ | دەربارەی کەس | ئازاد. / خانزاد. / من. / ئەو. |
| ئازاد چی کرد؟ | دەربارەی کار | ڕۆیشت. / گەڕایەوە. / حەپەسا. |
| خانزاد چوو بۆ کوێ؟ | دەربارەی شوێن | بازاڕ. / قوتابخانە. / ماڵ. / سەیران. |
| کەی چوو بۆ بازاڕ؟ | دەربارەی کات | دوێنێ. / پێرێ. / دەمێکە. |
| چۆن چوو بۆ بازاڕ؟ | دەربارەی چۆنیەتی | خێرا. / هەروا. / نازانم. |

**دووەم – ڕستەی سادەی ئاسایی:**

مەبەست لە ڕستەی سادەی ئاسایی ئەو ڕستانەن کە جگە لە ڕاناوی ڕێککەوتن، بکەر و بەرکارەکانیان بە ئاشکرا، واتە" وەك مۆرفیمی سەربەخۆ و بەبێ هیچ وشەیەکی دیارخەر دەردەکەون. بۆیە، ڕستەی سادەی ئاسایی لە کاری تێنەپەڕدا تەنیا لە دوو وشە پێکدێ، وشەیەکیان نیهادە، واتە" فرێزی ناوییە (بکەر بێ یا بەرکار) و وشەی دووەمیان گوزارەیە، واتە" فرێزی کارییە (تێنەپەڕی بکەری بێ یا بەرکاری)، بەڵام لە کاری تێنەپەڕدا ڕستەی سادەی ئاسایی لە سێ وشە پێك دێ، دوو وشە لە گرووپی ناوی، کە یەکەمیان ڕۆڵی بکەر دەگێڕێ و دووەمیان ڕۆڵی بەرکار، وشەی سێیەمیش کارە تێپەڕەکەیە. وەك لەم خشتەیەدا دەردەکەوێ:

| ڕستەی سادەی ئاسایی (لە بکەر دیاردا) | |
|---|---|
| لە کاری تێنەپەڕدا | **لە کاری تێپەڕدا** |
| بکەر یان بەرکار + کار | بکەر و بەرکار + کار |

**خشتەی ژمارە (٤)**

مەبەست لە گرووپی ناوی، دەشێ: ناو بێ، ئاوەڵناو بێ و لە جێی ناو هاتبێ، یان ڕاناوی سەربەخۆ بێ و لە جێی ناو هاتبێ، ... هتد. وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

| ڕستەی سادەی ئاسایی (لە بکەر دیاردا) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لە کاری تێنەپەڕدا | | | **لە کاری تێپەڕدا** | | |
| بکەر یان بەرکار + کار | | | بکەر و بەرکار + کار | | |
| بکەر | بەرکار | کار | بکەر | بەرکار | کار |
| من | | هاتم | من | تۆم | هێنا |
| مناڵەکەت | | خەوت | دایکەکە | مناڵەکەی | خەواند |
| شیرین | | هەڵدەستێ | شیرین | تەشی | دەڕێسێ |
| | ئێمە | ترساین | ئەوان | ئێمەیان | ترساند |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئێوە | دۆڕان | ئێوە | پارەتان | دۆڕاند |
| | ئەوان | مردن | ئێمە | دوژمنمان | بەزاند |

**سێیەم – ڕستەی سادەی فراوانکراو:**

ڕستەی سادەی فراوانکراو (عەبدوڵڵا–٥٢)، ئەو ڕستانەن، کە لە کاری تێنەپەڕدا پتر لە دوو وشە و لە کاری تێپەڕدا پتر لە سێ وشەن. واتە" جگە لە وشەکانی کار و بکەر و بەرکار، وشە سەربارەکانیش بەکار دێن. وەك:

لە تێنەپەڕدا:

| | |
|---|---|
| سادەترین ڕستە | وەرگەڕاØ . |
| ڕستەی سادەی ئاسایی | ئازاد وەرگەڕاØ . |
| ڕستەی سادەی فراوانکراو | ئازادی کوڕی نەوزادی دراوسێی خۆمان دوێنێ ئێوارەیەکی درەنگ بە ئوتومبێلە سپییەکەی لە پێچەکانی ڕێگەی پیرمام وەرگەڕاØ . |

لە تێپەڕدا:

| | |
|---|---|
| سادەترین ڕستە | وەریگێڕاØ . |
| ڕستەی سادەی ئاسایی | ئازاد ئوتومبێلەکەی وەرگێڕا. |
| ڕستەی سادەی فراوانکراو | ئازادی کوڕی نەوزادی دراوسێی خۆمان دوێنێ ئێوارەیەکی درەنگ ئوتومبێلە سپییەکەی لە پێچەکانی ڕێگەی پیرمام بە سەرخۆشی وەرگێڕا. |

لەم جۆرە ڕستە سادانەدا بە زۆری هیچ وشەیەك لە ئاستی ناوەوە نامێنێتەوە و زۆربەی وشەکان لە ئاستی سەرەوەدا دەردەکەون، ئینجا وشەکان دیارخەری فرێزە ناوییەکان بن، یان دەرخەرەکانی فرێزی کاری.

ڕێگاکانی فراوانکردنی ڕستەی سادەش زۆرن، لەوانە: هەندێ کەرەسەی پەیوەندی کە دەتوانن ئەندامەکانی گرووپە ناوییەکان، لە ناو، ئاوەڵناو، ڕاناو، ... هتد بە یەکەوە ببەستنەوە. وەك:

١- بە هۆی (ی)ی مۆرفیمی پەیوەندی. وەك: ئازادی كوڕی نەوزادی برای بەهزادی مامۆستای قوتابخانەی گەڕەگی خۆمان بە ئوتۆمبێلێكی سووری تاریكی جۆری كووپەیی تامپۆنێكی خراپی كرد.

٢- بە هۆی مۆرفیمی (ە)ی بەستن. وەك: كوڕە قوتابییە هەژارە زیرەكە باڵابەرزەكە بە یەكەم دەرچوو.

٣- بە هۆی ئامرازی (و)ی خستنەسەر: هۆزان و هۆنراو و هانا و هێلان لە قوتابخانە و سەیران و یاریكردن و ماڵەوە هەر بە یەكەوەن.

## ((بەشی دووەم))

**ڕستەی ناسادە**

ڕستەی ناسادە ئەو ڕستانەن، کە پتر لە کارێکیان تێدایە و دەبن بە دوو بەش:

**یەکەم – ڕســتەی لێکدراو:**

ڕستەی لێکدراو ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە، کە پتر لە کارێکیان تێدایە و هەر کارێك لە ڕستەیەکی سەربەخۆ پێك دەهێنێ، بەڵام بەشدارییێکی هاوبەش لە نێوانیان هەیە، وەك هاوبەشی لە هەمان فرێزی ناوی، چ بکەر بێ، چ بەرکار، یان بەشداری لە رووی کاتی ئەنجامدانی کاتەکان ...هتد. ئامرازە لێکدەرەکانیش ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پۆلینکردنی پەیوەندیی نێوان ڕستە سادە لێکدراوەکان(ڕەفیق–٨٨). بۆیە دەتوانرێ، ڕستەی لێکدراو بە پێی ئامرازەکان یان بە پێی کاتی ڕوودانی کارەکانیان دابەش بکرێن:

ا ـ پۆلینکردنی ڕستەی لێکدراو بە پێی ئامرازە لێکدەرەکان:

دەتوانرێ، ڕستە لێکدراوەکان بە پێی ئامرازە لێکدەرەکان بکرێن بە چوار جۆر:

*لێکدراوی هاوڕێك*: ( و، ئینجا، ئەوجا، ئەوسا، هەروەها، وێرگول (،) ...)

ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە، کە لە ڕووی ئەنجامدانی کاری ڕستەکانیان هاوڕێکن و کاری هەموو ڕستە لێکدراوەکان لە شێوەی ئەرێن و هەمان ئاراستە وەردەگرن. باوترین ئامرازی لێکدەری ئەم جۆرە ڕستانەش ئامرازی (و)ە. جگە لەوەی کە دەشێ، ئەم جۆرە ڕستانە بە ئامرازی (ئینجا/ ئەوجا/ ئەوسا/ هەروەها)ش لێك بدرێن(Randolph-٢٠٧)، بەڵام هەندێ جار بێ ئامرازیش لێك دەدرێن و لە نووسیندا وێرگولێك (،) لە نێوانیان دادەنرێ. وەك:

هێلان لە خەو هەڵسا و دەموچاوی شووشت و جلەکانی کردەبەری و چوو بۆ قوتابخانە.

دەتوانرێ، لە جێی هەر (و)ێکی لێکدەر هەر یەکێ لەم ئامرازە لێکدەرانەی خوارەوە (ئینجا/ ئەوجا/ ئەوسا/ هەروەها/..) دابنرێ:

هێلان لە خەو هەڵسا ئینجا/ ئەوجا/ ئەوسا/ هەروەها/ (،)/ .. دەموچاوی شووشت و

یان دەشێ هیچ دانەنرێ و وێرگولێك لە شوێنیان دابنرێ:

هێلان لە خەو هەڵسا، دەموچاوی شووشت، جلەكانی كردەبەری، چوو بۆ قوتابخانە.

لێرەدا جگە لە ئامرازە لێكدەرەكان، دوو فاكتەری تریش بوونەتە هۆی بە یەكەوە بەستنەوەی ئەم ڕستانە، كە یەكەمیان - هاوبەشییە لە بكەر، كە (هێلان)ە و دووەمیان - هەموو كارەكان لە ڕابوردووی سادەن و یەك لە دوای یەك ڕوویان داوە.

*لێكدراوی پێچەوانە*: ( بەڵام، ئەگەرچی، هەرچەندە، لەگەڵ ئەوەشدا كە، ...)

ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە، كە ڕوودانی ڕستەی دووەم پێچەوانەی ئەنجامی ڕستەی یەكەمە(كوردستان) ج (—٤٥). واتە" ئەگەر لە ئەنجامی ڕوودانی ڕستەی یەكەم چاوەڕێی ڕوودانی ئەرێی ڕستەی دووەم بین، ئەوا بە پێچەوانە دەبێتە نەرێ و ئەگەر چاوەڕێی نەرێ بین دەبێتە ئەرێ. وەك:

هۆنراو زیرەكە، بەڵام ناخوێنێ.

ئەگەرچی/ هەرچەندە/ لەگەڵ ئەوەشدا (كە)/ هۆنراو زیرەكە، (بەڵام) ناخوێنێ(١).

ئەگەرچی/ هەرچەندە/ لەگەڵ ئەوەشدا (كە)/ هۆنراو ناخوێنێ، (بەڵام) زیرەكە.

واتە" زیرەك بوون و نەخوێندن دوو كرداری ئاڕاستە پێچەوانەن بەڵام بە یەكەوە هاتوون.

یان لەم نموونەیەی خوارەوەدا ڕوونتر دەردەكەوێ، كاتێ یەكێك نەخۆش بێ ناچێ بۆ قوتابخانە، بەڵام لەم جۆرە ڕستە لێكدراوانە، كارەكە پێچەوانەیە:

(ئەگەرچی/ هەرچەندە/ لەگەڵ ئەوەشدا (كە)/..) هۆزان نەخۆشە، كەچی/ بەڵام هەر دێ بۆ قوتابخانە.

١- *لێكدراوی هەڵبژاردە*: ( یا/ یان/ یا ... یا / یان ... یان )

ئەم جۆرە ڕستە لێكدراوانە بە زۆری لە دوو ڕستەی سادە پێك دێن و لە كاری هەردوو ڕستەكە تەنیا كاری یەكێكیان ئەنجام دەدرێ و لە هەردووكیان یەكێ هەڵدەبژێردرێ، بۆیە ناوی هەڵبژاردەی لێنراوە. بە تەنیا بە ئامرازی

(یا"ن") لێك دەدرێ، یاخود لە سەرەتای هەردوو ڕستەکە دووبارە دەبێتەوە و دەبێتە (یا"ن" .. یا"ن"). ئەمەش زۆرجار لە پەندی پێشینانیش بەرچاو دەکەوێ. وەك:

یا دانیشـــە، یـــان بڕۆ. / دانیشە یا بڕۆ.

یا دەبی بە خانی خانان، یا دەبی بە پووشی بانان.

یا زانا بە، یا پرسـا بە.

٢- *لێکدراوی نەرێ*: ( نــە ... نــە )

هەندێ جار لێکدراوی دوو نەرێشی پێ دەوترێ، کە بە زۆری لە دوو ڕستەی نەرێ پێك دێ و هیچیان جێبەجێ ناکرێن و بە هۆی ئامرازی ( نــە ... نــە ) لێك دەدرێن و ئامرازی (و)ی لێکدەریش دەتوانێ بەشداری لێکدانی ئەم جۆرە ڕستە لێکدراوانە بکا. لە پەندی پێشینانیش زۆر دەبیسرێ. وەك:

نە دەمرێ (و) نە چاك دەبێ.

نە دادەنیشێ، نە دەڕوا.

نە شیری حوشتر، نە دیداری عەرەب.

نە ساڵی دوو بەهار، نە پیاوی گوێ بە گوار، نە ژنی جووچکەدار.

ب ـ پۆلینکردنی ڕستەی لێکدراو بە پێی دەمکاتی کارەکانیان:

دەشێ ڕستەی لێکدراو بە پێی کاتی ڕوودانی کاری ڕستە سادەکان بکرێتە دوو جۆر: ڕستەی لێکدراوی هەمان کاتی و ڕستەی لێکدراوی پێش و دوا:

یەکەم – ڕستەی لێکدراوی هەمان کاتی:

ئەو ڕستە لێکدراوانە دەگرێتەوە، کە کاری ڕستە سادەکانیان لە هەمان کاتدا ڕوودەدەن و دەتوانین سێ بەشیان لێ جیا بکەینەوە:

لێکدراوی هاوڕووداو: کاری سەرجەم ڕستە سادەکانی ئەم جۆرە ڕستە لێکدراوانە لە کاتێکی دیاریکراودا ڕوودەدەن، واتە" هەموو کارەکان لە هەمان دەمکاتدان و هەموویان بە یەکەوە ڕوودەدەن. ئەگەرچی لەم جۆرە ڕستە لێکدراوانەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، کە ڕستەی یەکەم زەمینەیەك بۆ ڕوودانی ڕستەکانی تر خۆشدەکا، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ( بە زۆری جگە لە ڕستەی

یەکەم) دەتوانرێ شوێنی هەموو ڕستە سادەکانی تـر بـە ئاسـانی ئـاڵوگۆڕ بکرێـن. وەك:

هەموومان کورد بووین، هەندێکمان بووین بە زەرد، هەندێکمان بووین بە سەوز، هەندێکمان بووین بە سوور، هەندێکمان بووین بە سپی.

ئەی کوردینە پیاوی باش بن، یەك بگرن، ئەم هەلە لەدەس مـەدەن، ئاگـاداری خۆتان بن، پشتی یەکتر بەرمەدەن.

جـاران ڕژێـم دەیگـرتین، ئـازاری دەدایـن، کیمیـا بـارانی دەکـردین، ئـەنفالی دەکردین، لە سێدارەی دەداین، وڵاتە زلهێزەکانیش دەنگیان نەدەکرد.

لێکدراوی یەك ڕووداو: ئەم جـۆرە ڕسـتە لـێکدراوانە بـە زۆری لـە دوو ڕسـتەی سـادە پـێك دێـن و تـەنیا کـاری یـەکێ لـە هـەردوو ڕسـتەکە ڕوودەدا و جـێبەجێ دەکرێ. بە زۆریش ئەم جۆرە ڕستانە لە شێوەی فەرماندان دەبن:

یا لەم لا بە، یان لەولا بە، چیتر ئەملا و ئەولا مەکە.

زانا بە، یا پرسا بە.

لە ئەنجامی ئەم ڕەفتارەت، یا دەتکەن بە خانی خانان، یا دەتکەن بە پووشی بانان.

لێکدراوی ڕوونەداو: لەم جۆرە ڕستە لێکدراوانەدا کاری هیچ لە ڕستە سادەکان ڕوونادا و جێبەجێ ناکرێ، چونکە هەموو کارەکان لە دۆخی نەرێدان و بـە زۆریـش ئەم جۆرە ڕستە لێکدراوانە لە دوو ڕسـتەی سـادە پـێك دێـن، کارەکـان کـەمتر لـە ئاستی سەرەوە دەردەکەون، بە تایبەتی لە پەندە کوردییەکاندا:

نە پێڵاوی تەنگ، نە ماڵی بە جەنگ.

نە ساڵی دوو بەهار، نە پیاوی گوێ بە گوار، نە ژنی جووچکەدار.

مناڵـە چەقاوەسـووەکەی دراوسـێمان، نـە دەخوێـنێ، نـە کارێـك دەکـا، نـە گوێڕایەڵی دایك و باوکی دەبێ.

شـایانی باسـە ئـەم ڕسـتانە هاوشـێوەی ڕسـتەی (نـەرێ)ن، بـەڵام لێـرەدا پۆلینکردنەکە بەپێی ئامرازەکان نییە و بەپێی دەمکاتەکانە.

**دووەم – ڕستەی لێکدراوی پێش و دوا:**

ئەو ڕستە لێکدراوانە دەگرێتەوە، کە کاری ڕستە سادەکانیان یەك لە دوای یەك ڕوودەدەن، واتە" کاری یەکەم دەست پێ دەکا، دوای ئەو کاری دووەم و ئینجا کاری سێیەم و ... هتد. وەك:

ڕاپەڕینمان دەست پێکرد، ئینجا کۆچڕەومان کرد، دوایی پەرلەمان و حکومەتی هەرێممان دروست کرد و بڕیاری فیدڕالیمان ڕاگەیاند.

کابرا بۆ ڕیش چوو، کەچی سمێڵیشی نایە بانی.

ڕژێمی سەددام شەڕی کوردی کرد، ئینجا شەڕی ئێرانی دەست پێ کرد، پاشان کوێتی داگیر کرد، دواجار لەگەڵ هاوپەیمانان کەوتەشەڕ.

**دووەم – ڕستەی ئاوێتە (تێکەڵ):**

ڕستەی ئاوێتە یا تێکەڵ ئەو جۆرە ڕستە ناسادانە دەگرێتەوە، کە پتر لە ڕستەیەکی سادە پێك دێن و لە هەموو ڕستە سادەکاندا تەنیا ڕستەیەکیان سەرەکییە (Independent Clause) و ناتوانرێ لابدرێ، کە (شاڕستە)ی پێ دەوترێ. سەرجەم ڕستەکانی تر لاوەکین (Dependent Clause) و دەتوانرێ لابدرێن (F.S.Scott-١٦٣)، کە (پاڕستە)یان پێ دەوترێ و هەر پاڕستەیەك کەرەسەیەکی ڕستەی سەرەکی ڕوونتر دەکاتەوە و دیاری دەخا، بۆیە سەرجەم پاڕستەکان دیارخەرین، ئەوانەی فرێزە ناوییەکان ڕوون دەکەنەوە، پاڕستەی دیارخەریی ناوین (٢) و ئەوانەی فرێزە کارییەکە ڕوون دەکەنەوە، پاڕستەی دیارخەریی کارین:

١– *پاڕستەی دیارخەری ناو:*

پاڕستەی دیارخەری ناو ئەو جۆرە ڕستە لاوەکییانە دەگرێتەوە، کە ناوێك لە ناوەکانی ڕستەی سەرەکی (شاڕستە) پتر ڕوون دەکەنەوە و دیاری دەخەن، بۆیە بە پێی ڕۆڵ و ئەرکی ناو لە ڕستەدا، ئەم جۆرە پاڕستانە دەکرێن بەم بەشانەی خوارەوە:

یەکەم – پاڕستەی دیارخەری بکەر:

لـەم جـۆرە ڕسـتە ئاوێـتانەدا پاڕسـتە لایەنـێکی بکـەری شاڕسـتە ڕوون دەکاتەوە و دەبێتە دیارخەری بکەری شاڕستە. بکەریش لە ڕۆنانی ڕستەی کاری تێپەڕ و کاری تێنەپەڕی بکەری دەردەکەوێ:

أ – بکەر لە کاری تێپەڕ:

| | فرێزی ناویی شاڕستە (بکەر) | پاڕستەی ناویی دیارخەری بکەر | فرێزی کاریی شاڕستە |
|---|---|---|---|
| ١ | ڕژێمی بەعس، | کە ئێستا لە زبڵدانی مێژوودایە، | نیو سەدە کوردی چەوساندەوە. |
| ٢ | هاوڕێکەمان، | کە ساڵێکە کراوەتە بەرپرس، | کۆشکێکی مەڕمەڕی دروست کرد. |
| ٣ | مۆبایل، | کـــە ئامـــێرێکی زۆر بـــچووك و تازەیە، | پەیوەندییـــەکانی ئاســـانتر کردووە. |

لەم نموونانەدا ئاشکرا دیارە، کە هەر یەکـە لـە پاڕسـتەکانی نـاویی دیارخـەری بکەر، وەسفی لایەنێکی بکەرەکەی شاڕستە دەکا و ڕوونی دەکاتـەوە. بـۆ نموونـە پاڕستەی (کە ساڵێکە لە زبڵدانی مێژوودایە) وەسـفی بکـەری شاڕسـتەکەی دەکـا، کە (ڕژێمی بەعس)ە و ئەوانی تریش بە هەمان شێوە.....

ب – بکەر لە کاری تێنەپەڕی بکەری:

| | فرێزی ناویی شاڕستە (بکەر) | پاڕستەی ناویی دیارخەری بکەر | فرێزی کاریی شاڕستە |
|---|---|---|---|
| ١ | ئەو دیلـــە | ی کــە چــەند ســاڵە چاوەڕێــی دەکەین، | دوێنێ هاتەوە. |
| ٢ | پاڵەوانەکەمان | کە زۆر لاف و گزاف لێ دەدا، | لـــە ســـەرەتای جەنگەکـــە هەڵهات. |
| ٣ | ئەو پێشمەرگانە | ی کە زۆر ئازا و دڵســـۆز بوون، | ئێستا زۆربەیان دانیشتوون. |

لەم ڕستانەدا کارەکانی (هاتەوە، هەڵهات، دانیشتوون) تێنەپەڕی بکەرین و فرێزە ناوییەکانیان (ئەو دیلە، پاڵەوانەکەمان، ئەو پێشمەرگانە) دەبن بە بکەری شاڕستە و هەریەکەیان بە پاڕستەی بەرامبەری وەسف کراوە.

دووەم – پاڕستەی دیارخەری بەرکار:

لەم جۆرە ڕستە ئاوێتانەدا پاڕستە لایەنێکی بەرکاری شاڕستە ڕوون دەکاتەوە و دەبێتە دیارخەری بەرکاری شاڕستە. بەرکاریش (ئەو توخمەیە کە، کارێکی بەسەردا دێ) لە شێوەی ڕۆنانی سێ جۆرە ڕستەدا دروست دەبێ:

أ – بەرکار لە کاری تێپەڕ:

| | شاڕستە | | | پاڕستەی دیارخەری بەرکار |
|---|---|---|---|---|
| | | بەرکار | | |
| ١ | سەددام | هەڵەبجە | ی بۆردومان کرد، | کە هێرۆشیمای کوردستانە. |
| ٢ | ئەبوجەعفەر | بەغدا | ی دروست کرد، | کە پایتەختی عێراقە. |
| ٣ | شای ئێران | پێشەوا | ی لە سێدارە دا، | کە سەرکۆماری مەهاباد بوو. |

لەم نموونانەی سەرەوەدا دەردەکەوێ، کە هەر یەکە لە پاڕستەکانی ناویی دیارخەری بەرکار، وەسفی لایەنێکی بەرکارەکەی شاڕستە دەکا و ڕوونی دەکاتەوە. بۆ نموونە پاڕستەی (کە هێرۆشیمای کوردستانە) وەسفی بەرکاری شاڕستەکەی دەکا، کە (هەڵەبجە)یە و ئەوانی تریش بە هەمان شێوە.....

ب – بەرکار لە کاری تێنەپەڕی بەرکاری:

| | فرێزی ناویی شاڕستە (بەرکار) | پاڕستەی ناویی دیارخەری بکەر | فرێزی کاریی شاڕستە |
|---|---|---|---|
| ١ | بارزانی، | کە ناودارترین سەرکردەی کوردە، | لە ساڵی ١٩٠٣ لە دایک بووە. |
| ٢ | سوپای عێراق، | کە لە سوپا بە هێزەکانی جیهان بوو، | لە جەنگی کەنداو خراپ شکا. |
| ٣ | گۆران، | کە شاعیرێکی ناوداری کورد بوو، | بە نەخۆشی شێرپەنجە مرد. |

لەم نموونانەی سەرەوەدا فرێزە ناوییەکان بۆیە بوونەتە بەرکار، چونکە کاری شارستەکانیان (بووە، شکا، مرد) تێنەپەڕی بەرکارین، واتە" فرێزە ناوی (نیهاد)ەکانیان بە ئارەزووی خۆیان کارەکانیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو بەسەریاندا **هاتووە.**

تەنانەت هەندێ جار ڕەگی کاری بوون (وەك لە ڕستەی هەواڵدانی کاتی ئێستا) دەبێتە مۆرفیمی سفر و دەرناکەوێ، لەم بارەشدا فرێزە ناوییەکەی هەر بەرکارە:

| فرێزی ناویی شارستە (بەرکار) | | پارستەی ناویی دیارخەری بکەر | فرێزی کاریی شارستە |
|---|---|---|---|
| ١ | کورد، | کە نەتەوەیەکی ئاشتیخواز و بێلایەنە، | بێ پشتوپەنایە. |
| ٢ | مێگر، | هاوینەهەوارێکی زۆر خۆشە، | شەقامی نییە. |
| ٣ | هەولێر، | کە پایتەختی هەرێمی کوردستانە، | مزگەوتی یەکجار زۆرە. |

لەم ڕستانەی سەرەوەدا، (ب)ی ڕەگی چاوگی (بوون) یان (هەبوون) دەرنەکەوتووە و شوێنی لە هاوکێشەی ڕیزبەندی مۆرفیمەکان بەم شێوەیە دەردەکەوێ:

پشتوپەنایە = (پشتوپەنا) فرێزی ناوی / بەرکاری بە یاریدە + (ب) ڕەگی کار، کە دەرنەکەوتووە، (چونکە دەرکەوێ ڕستەکە دەبێتە فەرماندان) + (یـ) ناوبڕی نێوان دوو بزوێتە + (ە) مۆرفیمی کاتی ئێستایە + ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك، کە سفرە و دەرنەکەوتووە و دەگەڕێتەوە بۆ (کورد).

دەشێ شارستە ڕستەیەکی یەك وشەیی بێ و ڕەگی چاوگی (بوون)ی تیا دەرنەکەوێ. وەك لە ڕستەکانی (دیارە، هەڵبەتە، ئاشکرایە، .....):

| | شارستە | پارستەی دیارخەری بەرکار |
|---|---|---|
| ١ | ئاشکرایەØ، | کە دوژمنانی کورد دژی ئازادیی کوردستانن. |
| ٢ | هەڵبەتەØ ، | کە کورد گەلێکی بێ پشتیوانە. |
| ٣ | دیارەØ ، | کە بەرژەوەندییەکان بنەمای پەیوەندیی گەلانن. |

دەشێ، (بــ)ی ڕەگی (بوون) لە شارستەدا لەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕوون بکرێتەوە:

| | شارستە | فرێزی ناوی | ڕەگی بوون | مۆرفیمی ئێستا | ڕاناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئاشکرایەØ، | ئاشکرا | بـ ← Ø | (یـ ناوبڕە) + ـە | Ø بەرکار |
| ٢ | هەڵبەتە Ø، | هەڵبەتە | بـ ← Ø | ـە | Ø بەرکار |
| ٣ | دیارەØ ، | دیار | بـ ← Ø | ە | Ø بەرکار |

لێرەدا ڕاناوی لکاو دەبێتە بەرکار، چونکە کارەکە تێنەپەڕی بەرکارییە.

سێیەم — پارستەی دیارخەری بەرکاری بە یاریدە:

لەم جۆرە ڕستە ئاوێتانەدا پارستە لایەنێکی بەرکاری بە یاریدەی شارستە ڕوون دەکاتەوە و دەبێتە دیارخەری بەرکاری بە یاریدەی شارستە. وەك:

| | شارستە | | پارستە | فرێزی کاری شارستە |
|---|---|---|---|---|
| | (ف.ن) | بەرکاری بە یاریدە | | |
| ١ | هێلان | بە ئوتومبێلەکەی، | کە تازە کڕیبووی، | هات. |
| ٢ | نامەیەکم | بە هۆنراودا، | کە کوڕەگەورەمە، | بۆ ناردی. |
| ٣ | شیعرێکم | لەو دەفتەرە | ی، کە تازە کڕیبووی، | بۆی نووسییەوە. |

٢- *پارستەی دیارخەری کار (ئاوەڵکاری)*:

پارستەی دیارخەری کار ئەو جۆرە ڕستە لاوەکییانە دەرێتەوە، کە کاری ڕستەی سەرەکی (شارستە) پتر ڕوون دەکەنەوە و دیاری دەخەن، بۆیە بە پێی ڕۆڵ و جۆری ڕوونکردنەوەکەیان دەکرێن بەم بەشانەی خوارەوە:

یەکەم — پارستەی دیارخەری کات:

لەم جۆرە ڕستە ئاوێتانەدا پارستە کاتی ڕوودانی کاری شارستە ڕوون دەکاتەوە، بە پەیوەستکردنی بە کارێکی کات زانراو. واتە" کاتی ڕوودانی کاری

پاڕستە زانراوە و بە هۆی ئەوەوە کاتی ڕوودانی کاری شاڕستەش دەزانرێ و دەتوانرێ شاڕستە و پاڕستەش پاش و پێش بکرێن. بە زۆری لەم جۆرە ڕستە ئاوێتانەدا ئامرازی لێکدەری (کە) بەکاردێت. وەک:

| | پاڕستەی دیارخەری کات | شــاڕســـتە |
|---|---|---|
| ١ | کــە مــن هــاتــم، | ئــەو لــەوێ بــوو. |
| ٢ | کـــــە تۆ دەچـــــووی ، | مـــن دەگـــەڕامـــەوە. |
| ٣ | کــە کــار لــە کـــار تـــرازا، | بـــرا دەبـــێـــتـــە بـــرازا. |

دووەم – پاڕستەی دیارخەری هـــۆ:

ئەم جۆرە پاڕستانە هۆی ڕوودانی کاری شاڕستە دەردەخەن و بە زۆری ئامرازە لێکدەرەکانی ( چونکە، لەبەرئەوەی، لەبەرئەوەی کە) تیایاندا بەکاردێن و دەتوانرێ، بە ئاسانی شوێنی شاڕستە و پاڕستە ئاڵوگۆڕ بکرێن. وەک:

| | پاڕستەی دیارخەری هـــۆ | شــاڕســـتە |
|---|---|---|
| ١ | چـونکە یەک ناگریـــن، | ســـەرنــاکــەویــن. |
| ٢ | لەبەرئەوەی ئاستی زانستیمان نزمە، | کــورد زانای تیا هەڵنەکەوتووە. |
| ٣ | لەبەرئەوەی قسەکانی حەق و ڕەقن، | لای کاربەدەستان پەسەند نییە. |

سێیەم – پاڕستەی دیارخەری ئەنجام:

ئەم جۆرە پاڕستانە ئـەنجامی ڕوودانـی کـاری شاڕسـتە دەردەخـەن و بـە زۆری ئامرازە لێکدەرەکانی ( بۆیە، لەبەرئەوە ) تیایاندا بەکاردێن و دەتوانرێ، بە ئاسانی شوێنی شاڕستە و پاڕستە ئاڵوگۆڕ بکرێن. وەک:

| | شــاڕســـتە | پاڕستەی دیارخەری ئەنجام |
|---|---|---|
| ١ | یـــەک نـــاگـــریـــن، | بـــۆیـــە ســـەرنـــاکـــەویـــن. |
| ٢ | ئاستی زانستیمان نزمە، | لەبەرئەوە زانامان تیا هەڵنەکەوتووە. |
| ٣ | قسەکانی حەق و ڕەقن، | لەبەرئەوە لای کاربەدەستان پەسەند نییە. |

شایانی باسە، پاڕستە دیارخەرەکانی هـۆ و ئـەنجام پێـچەوانەی یـەکترن، واتـە ئەگـەر شاڕسـتە و پاڕسـتەکانیان ئـاڵوگۆڕ بکـەین لەگـەڵ گـۆڕینی ئـامرازە لێکدەرەکانیان، پاڕستەکانی هۆ و ئەنجام ئاڵوگۆڕ دەبن.

چوارەم — پاڕستەی دیارخەری ئامانج:

ئەم جۆرە پاڕستانە ئامـانجی ڕوودانـی کـاری شاڕسـتە دەردەخـەن و بـە زۆری ئامرازە لێکدەرەکانی (بۆ ئەوەی، تـا، هـەتا، تـاکو، هـەتاکو،... ) تیایانـدا بەکاردێن. وەک:

| | شـــاڕســـتە | پاڕستەی دیارخەری ئامانج |
|---|---|---|
| ١ | کورد تێدەکۆشێت، | بۆ ئەوەی مافی چارەنووسی دابین بکا. |
| ٢ | ئێمە ڕاپەڕین، | تاکو کوردستان ڕزگار بکەین. |
| ٣ | کابرا ئەو هەموو مەرایییە دەکا، | تـا بیکەن بە شــــــتێك. |

پێنجەم — پاڕستەی دیارخەری پێوانە:

ئـەم جـۆرە پاڕسـتانە بـڕ و ڕادە و پـێوانەی ڕوودانـی کـاری شاڕسـتە دەردەخەن، واتە بـوار و سـنووری کارکردنەکـەی دەستنیـشان دەکـەن. بـە زۆری ئامرازە لێکدەرەکانی (کە، تـا، هەتا، تاکو، هەتاکو... ) تیایاندا بەکاردێن. جگـە لەمەش لە شاڕستەدا دیارخەرێـکی پـێوانە نادیـاری وەك ( بـە ڕادەیـەك، هـێندە، ئەوەندە ...) لە پێش ئاوەڵناوی شاڕستەکە هاتووە و ئەرکی پاڕستە دەرخستن و سنووردارکردنی ئەو دیارخەرەیـە. هـەر ئـەم دیارخەرانـە دەبنـە خـاڵی سـەرەکیی جیاکردنەوەی پاڕستەی دیارخەری پێوانە لە پاڕستەی دیارخەری ئامانج. وەك:

| | شـــاڕســـتە | پاڕستەی دیارخەری پێوانە |
|---|---|---|
| ١ | کوردستان بە ڕادەیەك ڕازاوەیە، | کـە هەر باسی ناکرێ!. |
| ٢ | کەلوپەلەکان هێندە گران بوون، | کە نەمتوانی هەڵیانبگرم. |
| ٣ | کچەگاوان ئەوەندە جوان بوو، | تـا برای خۆشی حەیرانی دەبوو. |

شەشەم – پاڕستەی دیارخەری مەرج:

ئەم جۆرە پاڕستانە مەرجی ڕوودانی کاری شاڕستە دەردەخەن و بە زۆری ئامرازی لێکدەری ( ئەگەر/گەر ) تیایاندا بەکاردێ. وەك:

| | پاڕستەی دیارخەری مەرج | شـــــاڕســـــتە |
|---|---|---|
| ١ | ئەگەر گوڵ نیت، | دڕکیش مەبە. |
| ٢ | (ئەگەر) پشتت سەفین بێ، | تــف لە ئاســـــن بکە. |
| ٣ | گەر خودا دەستمان بدا، | کوردستان یەك دەخەینەوە. |

لەم جۆرە ڕستە ئاوێتانەدا، پاڕستە دەبێتە ڕستەی مەرج و شاڕستەش دەبێتە وەڵامی مەرج(ئازاد–٨١).

## ((بەشی سێیەم))

### پۆلینی ڕستە لە ڕووی گەیاندنی واتا ( ئەرکە زمانەوانییەکانی ڕستە )

جگە لە پۆلینکردنی ڕستە لە ڕووی ڕۆنان و داڕشتنەوە، هەروەك لە بەشەکانی پێشەوە باسکرا، دەتوانرێ، لە ڕووی ئەرکی گەیاندنی واتا و مەبەستیش پۆلین بکرێ، کە هەندێ جار لە ڕووی ناوەرۆك(کوردستان-٦٠)، یان کردە قسەییەکانیشی(قیس-٣٨) پێ دەوترێ. زۆربەی زمانەوانە کوردەکان هەر لە زووەوە ئەم دابەشەیان کردووە و لەم ڕووەوە تەنیا چوار بەشیان لە یەك جیاکردۆتەوە: ڕستەکانی (هەواڵگەیاندن، پرسیار، فەرماندان و سەرسوڕمان)، بەڵام بە زۆری لایەنی داڕشتن و واتایان لە یەك جیا نەکردۆتەوە، هەرچەندە لە یەك ترازاندنیان کارێکی ئاسان نییە، چونکە دەنگەکان هەڵگری واتاکانن و پەیوەندییێکی لە خۆوەی ئەوەندە بە هێزیان پەیدا کردووە، لە یەکتر دابڕینیان ئەستەمە، بەڵام ڕێزمانی دێرین خۆی بە هەڵاواردنی ئەم دوو لایەنە ماندوو نەکردووە و تێکڕایی باس کراون.

ئەوەی گرنگە، بۆ دەستنیشانکردنی هەر ئەرکێکی ڕستە، دەبێ تەواو لە مەبەستی قسەکەر (یا نووسەر) بگەین و بە پێی مەبەستی وردی قسەکەر ئەرکەکە دەستنیشان بکرێ. لە ئاخاوتندا هێز و ئاواز و هێما جووڵەییەکانی قسەکەر یارمەتییێکی زۆری قسەکەر دەدەن بۆ گەیاندنی مەبەستە وردەکەی، بەڵام لە نووسیندا هەوڵدراوە، نیشانەکانی خاڵبەندیی ئەم ڕۆڵە بگێڕن، بۆیە فەرامۆشکردنیان دیاردەیەکی پەسەند نییە.

ژمارەی ئەرکە واتاییەکانی ڕستە لە نێوان زمانەوانە هاوچەرخەکانیش هاویەك نییە، لە نێوان سێ ئەرك و پتر لە دە ئەرکدایە. لەم بەشەدا هەموو بەشەکان بە وردی باس دەکرێن و بە سەر حەوت جۆر دابەش دەکرێن و ئەگەری جیاکردنەوە و تێکەڵکردنەوەی هەندێ بەشیش دەخرێتە ڕوو، بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێ، کە تەنیا سێ ئەرکی یەکەمیان ڕەسەن و سەرەکین و ئەوانی تر لاوەکین و دەتوانرێ، لەگەڵ سێ ئەرکە سەرەکییەکە تێکەڵ بکرێنەوە:

یەکەم: ئەرکی زانیاری و هەواڵدان:

ئـەم ئەرکـە سـەرەکیترین ئەرکـەکانی ڕسـتەیە. دەشـێ، ئـەم جـۆرە بـە ئەرکێك دابنرێ و دەشێ، دابەشی دوو بەش بکرێ:

١ – ئەرکی زانیاری: لەم ئەرکەدا بیرۆکەی زانینێکی هەمیـشەیی، واتـا زانیاریـێکی بەردەوامی نەگۆڕ لە مێشکی قـسەکەر (یـا نووسـەر)ە و دەتـوانرێ، بـە هـۆی ئـەو جۆرە ڕستەیەوە بگەیێنرێتە مێشکی گوێگر (یا خوێنەر). ئەم ئەرکـە بـە زۆری بـۆ گەیاندنی زانستەکان و بابەتی کەرەسە پێوراوەکان بە کاردێ. وەك:

– ئاو لە سەد پلەی سەدی دەکولێ و لە سفر پلەی سەدی دەبەستێ.

– زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە.

– یەکەی خێرایی یەکسانە: بە یەکەی درێژی، لەسەر یەکەی کات.

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) زانیـاری لـە مێـشکی قـسەکەر (یـا نووسـەردایە) و دەگوێزرێـتەوە بـۆ مێـشکی گوێگر (یا خوێنەر).

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ دەکەوێ.

(ج) بابەتی زانیارییەکە دەربارەی دیاردەیەکی نەگۆڕە.

(د) لـە قـسەکردندا ئـاوازی ڕسـتەکە ئاسـۆیی و ڕێـکە و لـە نووسـیندا لـە کۆتـایی ڕستەکە خاڵێك دادەنرێ.

٢ – ئەرکی هەواڵدان (یا هەواڵگەیاندن):

تەنیا جیاوازی لـە نـێوان ئـەم ئەرکـە و ئـەرکی زانیـاری ئەوەیـە، بابـەتی زانیارییەکە لە ئەرکی زانیاری دەربارەی دیاردەیەکی نەگۆڕە، واتە" لە کۆنـدا هـەر وابـووە و ئێـستاش هەروایـە و لـە داهاتووشـدا هـەر وا دەمـێنێ، بـەڵام بابـەتی زانیاریەکە لە ئەرکی هەواڵدان دەربارەی دیاردەیەکی گۆڕاوە، واتە" هەواڵێکە نـەك زانیارییێك و لە کۆندا نەبووە و لە دواییـدا هاتۆتـە ئـارا و لـە کۆتاییـشدا نـەماوە یـا نامێنێ. وەك:

– شەڕی چاڵدێران بووە هۆی یەکەم دابەشکردنی کوردستان.

– هێزی هاوپەیمانان ڕژێمی سەددامی دیکتاتۆریان ڕووخاند.

– ڕۆژێك دێ لە کوردستان نەوت نامێنێ و ڕۆڵی ئاو بایەخدار دەبێ.

دەشێ ئەم دوو ئەرکە تێکەڵ یەك بکرێن و بە یەك ئەرك دابنرێن: (ئەرکی زانیاری و هەواڵدان)، چونکە هەموو سیماکانیان وەکو یەکە و تەنیا لە سیمایەك جیان، کە هەمیشەیی زانیاری و ناهەمیشەیی هەواڵە، کە هەندێ جار ڕاستی دیاردەکە یا باوەڕەکە لە کەسێك بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، وەك بوونی خوا، فریشتە، جنۆکە... لای ئایندار و بێ ئایینەکان.

ئەوەی شایانی باسە لە (ئەرکی زانیاری و هەواڵدان)دا، ئەگەر زانیاری یا هەواڵەکە ڕاست نەبوو و قسەکەریش ڕاستییەکەی نەدەزانی، واتە" هەڵەکەی ئەنقەست نەبوو، ئەوا بیرۆکەکە هەڵەیە، بەڵام ئەگەر قسەکەر ڕاستییەکە بزانێ و بە ئەنقەست بە هەڵە بیداتە گوێگر، ئەوا لە بری هەڵە پێی دەوترێ: (درۆ)، بۆیە دەتوانرێ بوترێ: ئەم ئەرکە ڕاست و هەڵە یا ڕاست و درۆی تێ دەکەوێ.

دووەم: ئەرکی پرسیاری:

ئەرکی پرسیاری (یا پرسیارکردن) دووەم ئەرکی سەرەکی ڕستەیە و کوتومت پێچەوانەی ئەرکی زانیاری هەواڵدانە. لەم ئەرکەدا زانیاریەکە لە مێشکی گوێگر (یا خوێنەر)دایە و قسەکەر (یا نووسەر) داوای دەکا(أبوبکر–٣). وەك:

– ناوت چییە؟

– کەی کۆماری مەهاباد دامەزرا؟

– ئایا کوردستانێکی یەکگرتوو دروست دەبێ؟

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) زانیاری لە مێشکی گوێگر (یا خوێنەردایە) و دەگوێزرێتەوە بۆ مێشکی قسەکەر (یا نووسەر).

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ ناکەوێ. واتە" پرسیار هەر پرسیارە و قسەکەر ناتوانێ، پرسیارێکی هەڵە بکا، چونکە خۆی زانیاری دەربارەی شتەکە نییە.

(ج) مەرجی پرسیاری ئەوەیە، دەبێ قسەکەر چاوەڕێی وەڵام بکا، ئەگەر چاوەڕێی نەکرد، ئەوا مەبەستی پرسیار نییە. وەك: کووی؟، چۆنی؟... هتد، ئەمانە ئەرکێکی ترن، هەرچەندە دەشێ، بخرێنە ناو گرووپی ئەرکی پرسیاری.

(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە لـە ئاسـۆیی بـەرەو بەرزییـە و لـە نووسـیندا لـە کۆتایی ڕستەکە نیشانەی پرسیار دادەنرێ.

هەڵبەتە، وەڵامی ئەرکی پرسیاری بە ئەرکی یەکەم (زانیـاری و هەواڵـدان) دەدرێتەوە. لە ڕێزمانی دێریندا وا باو بوو، کە دەبووایـە، وەڵامـی پرسـیارەکە بـە تەواوی بدرێتەوە. واتە" کاتێ دەپرسـن: پ– نـاوت چـییە؟. دەبوایـە، بڵـێیت: و: ناوم فلانە. بـەڵام لـە ڕێـزمانی هاوچـەرخدا، دەتـوانی، تـەنیا نـاوی خـۆت بڵـێیت، چـونکە: یەکـەم – ئاسـتی نـاوەوە و ئاسـتی دەرەوە دۆزرایـەوە و دووەم – لـە زانستەکاندا تۆ یاسا دەدۆزیتەوە و یاسـا دروسـت ناکـەی و بـە زۆر بیسەپـێنی بـە سەر کەرەسەکاندا، واتـە" ئێـستا لـەبری: و: مـن نـاوم فلانـە. دەتـوانی بڵـێی (یـا بنووسی): فلان.

لە ڕستەی پرسیاریدا بۆشاییەکی زانیـاری لـە مێـشکی قـسەکەردا هەیـە، داوا لە گوێگر دەکا، ئـەو بۆشـاییەی بـۆ پـڕ بکاتـەوە. گەرچـی هەنـدێ جـار ئـەو زانیارییەی قسەکەر داوای دەکا خۆی دەیزانێ، وەك ئەو پرسیارانەی مامۆسـتا لـە قوتابییەکانی دەکا. بەڵام لێرەدا قسەکەر شتێکی تـر نـازانێ و ناڕاسـتەوخۆ داوای دەکا، ئەویش: ئایا گوێگر (واتە" قوتابییەکان) ئەو شتە دەزانن، یان نا؟.

سێیەم: ئەرکی فەرماندان و داخوازی و خۆزگەیی (ئەرکی ئارایی):

فەرماندان سێیەم ئەرکی سەرەکی ڕستەیە، ئەرکی فەرماندان و داخـوازی ئەوەیە، کە قسەکەر داوا لـە گوێـگر دەکـا، کارێـکی بـۆ ئـەنجام بـدا. واتـە" داوای نواندنێکی کارەکیی لێ دەکا، ئینجا نواندنەکـە قـسە بـێ یـان جووڵـە. دەتـوانرێ، پێی بگوترێ ئەرکی ئارایی، چونکە مەبەستی قسەکەر هاتنە ئـارایی شتـێکە. ئـەم ئەرکە دەکرێتە سێ بەش:

أ– فەرماندان: لەم بەشەدا کەسی یەکەم (قسەکەر یا نووسـەر) ڕاسـتەوخۆ داوا لە کەسی دووەم (گوێگر یا خوێنەر) دەکا، کە کارێکی بۆ جـێبەجێ بکـا لـە کـاتی ئێستادا. ئەم بەشەش بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێ:

١- فەرمانی بەهێز: لێرەدا قسەکەر دەسەڵاتی بە سەر گوێگردا دەڕوا و چ لە پلە و پایە بێ، یان تەمەن، لە گوێگر گەورەترە. فەرمانەکانیش بە زۆری بچووکترین ڕستەی سادەن و کەمتر گرێی ئامادەکاری یان ڕوونکردنەوەیان لە گەڵدایە. وەك:

- بۆ پێشەوە بڕۆ / بڕۆن، هەڵمەت بەرە / هەڵمەت بەرن.
- پێنووسەکەت دانێ. پێنووسەکانتان دانێن.
- بنووسە / بنووسن.

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر داوای ئەنجامدانی ئەرکێك لە گوێگر دەکا لە کاتی ئێستادا. مۆرفیمی کاتی ئێستاش (ە) لە کەسی دووەمی تاکدا دەردەکەوێ، (ئەگەر ڕەگەکە کۆتایی بە بزێن نەهاتبێ،) چونکە گوێگر ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرامبەر قسەکەرە، تێی دەگا، پێویست بە ڕاناوی لکاو ناکا و دەبێتە سفر (∅)، بەڵام لە کەسی دووەمی کۆدا مۆرفیمی کاتی ئێستا (ە) دەرناکەوێ، چونکە (ن)ی ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ دەردەکەوێ، تاکو جیا بکرێتەوە لە کەسی دووەمی تاك. وەك: بنووسە∅ ، بنووس∅ ن.

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ ناکەوێ.

(ج) داواکارییەکە بە زۆری کارەکییە و دەشێ زارەکیش بێ، (وەك، داواکردنی وتنی شتێك)..

(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە ئاسۆییە لە کۆتاییدا بەرەو خوارەوەیە و لە نووسیندا لە کۆتایی ڕستەکە خاڵێك دادەنرێ.

(ه) بۆ نەرێکردنی ئەم جۆرە ڕستانەی فەرماندان پێشگری نەرێی (مە) لە بری (بـ)ی مۆرفیمی فەرماندان (هاتنە ئارایی) دادەنرێ.

٢- فەرمانی بەڕێز: لێرەدا قسەکەر دەسەڵاتی بە سەر گوێگردا ناڕوا و چ لە پلە و پایە بێ، یان تەمەن، لە گوێگر بچووکترە یان هاوتەمەنن. هەندێ جاریش ئەگەر قسەکەر دەسەڵاتیشی بە سەر گوێگردا بڕوا، نایەوێ فەرمانەکەی بە هێز بەسەردا بچەسپێنێ و لە بری ڕێگەی سەربازی ڕێگەیەکی دیپلۆماسی ئەگرێتەبەر.

فەرمانەکانیش هەرگیز بچووکترین ڕستەی سادە نین و هەردەم گرێی ئامادەکاری یان ڕوونکردنەوە و مەراییيان لەگەڵدایە. وەك:

- بە یارمەتیت، هەرچەندە بە کاری تۆش ناشێ، جامێك ئاوم بۆ بێنە.
- بەڕێزتان گەر بە گرانی نازانن، ئەم داواکارییەمان بۆ واژۆ بکە.
- فەرموو، مێوان بە.
- ببوورن، تکایە بێدەنگبن.

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر داوای ئەنجامدانی ئەرکێك لە گوێگر دەکا لە کاتی ئێستادا. مۆرفیمی کاتی ئێستاش (ە) لە کەسی دووەمی تاکدا دەردەکەوێ، (ئەگەر ڕەگەکە کۆتایی بە بزێن نەهاتبێ،) چونکە گوێگر ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرامبەر قسەکەرە، تێی دەگا، پێویست بە ڕاناوی لکاو ناکا و دەبێتە سفر ($\emptyset$)، بەڵام لە کەسی دووەمی کۆدا مۆرفیمی کاتی ئێستا (ە) دەرناکەوێ، چونکە (ن)ی ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ دەردەکەوێ، تاکو جیا بکرێتەوە لە کەسی دووەمی تاك. واتە" کوتومت وەك فەرماندانی بەهێزە، بەڵام فۆرمێکی ڕێزداری پێش دەکەوێ.

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ ناکەوێ.

(ج) داواکارییەکە بە زۆری کارەکییە و دەشێ زارەکیش بێ، (وەك، داواکردنی وتنی شتێك. بۆ نموونە: تکایە، فەرموو، تۆش گەواهی خۆت بدە.).

(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە ئاسۆییە لە کۆتاییدا لادانی بەرەو خوارەوە زۆر کەمترە لە فەرماندانی بەهێز. لە نووسیندا لە کۆتایی ڕستەکە خاڵێك دادەنرێ.

(هـ) بۆ نەرێکردنی ئەم جۆرە ڕستانەی فەرماندان پێشگری نەرێی (مە) لە بری (بـ)ی مۆرفیمی فەرماندان (هاتنە ئارایی) دادەنرێ و بە زۆری فۆرمە ڕێزدارییەکانی پێشەوە دەسکاری ناکرێن، ئەگەر لەگەڵ مەبەستدا بگونجێن.

ب- داخوازی: لەم بەشەدا کەسی یەکەم (قسەکەر یا نووسەر)، چ تاك بێ، چ کۆ، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، داوا لە هەر یەکێك بیەوێ، لە هەر شەش کەسەکە (تەنانەت خۆیشی) دەکا، کە کارێکی بۆ جێبەجێ بکا لە کاتی داهاتوو:

لە کاری تێنەپەڕ:

| ڕستەی داخوازی | مۆرفیمی ئارایی | ڕەگی کار | مۆرفیمی داهاتوو | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|---|
| بـچـØ ـم | بـ | چـ | Ø | م | کەسی یەکەمی تاك |
| بـچـØ ـی | بـ | چـ | Ø | ی | کەسی دووەمی تاك |
| بـچـێØ | بـ | چـ | ێ | Ø | کەسی سێیەمی تاك |
| بـچـØ ـین | بـ | چـ | Ø | ین | کەسی یەکەمی کۆ |

لە کاری تێپەڕ:

| ڕستەی داخوازی | مۆرفیمی ئارایی | ڕاناوی بەرکار | ڕەگی کار | مۆرفیمی داهاتوو | ڕاناوی لکاوی بکەر | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بینووسـØ ـم | بـ | یـ | نووسـ | Ø | م | کەسی یەکەمی تاك |
| بماتنووسـ Øـی | بـ | مانـ | نووسـ | Ø | ی | کەسی دووەمی تاك |
| بتاننووسـێ Ø | بـ | تانـ | نووسـ | ێ | Ø | کەسی سێیەمی تاك |
| بیاننووسـ Øـین | بـ | یانـ | نووسـ | Ø | ین | کەسی یەکەمی کۆ |

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر داوای ئەنجامدانی ئەرکێك لە گوێگر دەکا لە کاتی داهاتوودا. گوێگر دەشێ هەر یەکێك بێ لە شەش کەسەکە و ڕاناوی لکاو لە کەسی دووەمی تاکدا (ی)ی ئاساییە و سفر (Ø) نییە. مۆرفیمی کاتی ئێستا لەم جۆرە ڕستانەدا

نییە و تەنیا مۆرفیمی کاتی داهاتوو (ێ/Ø) هەیە، واتە" ئەنجامدانی کارەکە هەردەم دوای کاتی ئێستا (دەمی ئاخاوتن) دەبێ.

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ ناکەوێ.

(ج) داواکارییەکە بە زۆری کارەکییە و دەشێ زارەکیش بێ.

(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە ئاسۆییە لە کۆتاییدا لادانی بەرەو خوارەوە زۆر کەمترە لە فەرماندانی بەهێز. لە نووسیندا لە کۆتایی ڕستەکە خاڵێك دادەنرێ.

(هـ) بۆ نەرێکردنی ئەم جۆرە ڕستانەی فەرماندان پێشگری نەرێی (نە) لە بری (بـ)ی مۆرفیمی فەرماندان (هاتنە ئارایی) دادەنرێ . ئەگەر ڕستەی ئەرێ و نەرێ بە دوای یەکدا هاتن، گومانداری و دوودڵی دەگەیێنێ لە ئەنجامدانی کارەکە، وەك: (بچم، نەچم؟! بینووسین، نەینووسین؟!).

(و) دەتوانرێ، ئەم جۆرە ڕستانە بۆ پاڕستەی مەرجیش بەکاربێن، وەك: (ئەگەر بە یەکەم دەربچی، خەلات دەکرێی).

ج- خۆز ـەیی: جیاوازیی سەرەکیی ئەم بەشە لەگەڵ داخوازیدا ئەوەیە، کە داخوازی لە کاتی داهاتوودایە، بەلام خۆزگەیی لە کاتی ڕابوردوودایە. واتە" لە داخوازیدا قسەکەر ئاواتی ئەوە دەخوازێ، لە داهاتوودا شتێکی بۆ بهێنرێتە ئارا، بەلام لە خۆزگەییدا قسەکەر ئاواتی ئەوە دەخوازێ، لە ڕابوردوودا شتێکی بۆ بهێنرێتە ئارا، بەلام کاتی ڕابوردوو بە سەر چووە و لە دەست دەرچووە و دەسەلاتمان بە سەری نەماوە، بۆیە تازە ناکرێ، ئاواتەکەی قسەکەر بهێنرێتە دی و داواکارییەکەی دەبێتە خۆزگەیی.

چۆنیەتی داڕشتنی ڕستەی خۆزگەیی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر (بە گونجانی فۆنۆلۆجی و ئاسانی دەربڕینی ناوچەکە) دەگۆڕێ. بۆ نموونە ئەگەر بواری ڕوودانی کارەکە تەنیا لە ڕابوردوو بێ، ئەم شێوازانە دەبیسترێن:

چووبام ... چووبای ... چووباØ ...چووباین ...

بچووام ... بچووای ... بچوواØ ... بچووایین ...

بچووبام ... بچووبای ... بچووباØ ... بچووباین ...

بەلام ئەگەر بواری ڕوودانی کارەکە لە ڕابووردوودا تا کاتی ئێستا (دەمی ئاخاوتن) درێژ بکرێتەوە، ئەوا مۆرفیمی کاتی ئێستاشی دێتە سەر، وەك:

چووبامایە ... چووبایتایە ... چووباØ یە...چووباینایە ...

بچووامایە ... بچوویتایە ... بچوواØ یە... بچوواینایە ...

بچووبامایە ... بچووبایتایە ... بچووباØ یە... بچووبایانایە ...

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر ئاواتی ئەنجامدانی ئەرکێك لە گوێگر دەخوازێ لە کاتی ڕابوردوودا. گوێگر دەشێ هەر یەکێك بێ لە شەش کەسەکە. بەڵام لەبەرئەوەی کاتەکە ڕابوردووە، کارەکە ئەنجام نادرێ و دەبێتە خۆزگەیی.

(ب) ڕاست و هەڵەی تێ ناکەوێ.

(ج) داواکارییەکە بە زۆری کارەکییە و دەشێ زارەکیش بێ.

(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە ئاسۆییە. لە نووسیندا لە کۆتایی ڕستەکە خاڵێك یان نیشانەی سەرسوڕمان یان هەردووکیان دادەنرێن.

(ه) بۆ نەرێکردنی ئەم جۆرە ڕستانەی فەرماندان پێشگری نەرێی (نە) لە بری (بـ)ی مۆرفیمی فەرماندان (هاتنە ئارایی) دادەنرێ (تەنیا ئەگەر پێشگر بێ) .

(و) دەتوانرێ، ئەم جۆرە ڕستانە بۆ پاڕستەی مەرجیش بەکاربێن، وەك: (ئەگەر بە یەکەم دەرچووبای، خەڵات دەکرای).

چوارەم: ئەرکی هەست دەربڕین (سەرسوڕمان):

لەم بەشەدا قسەکەر هەستی پەنگخواردووی خۆی بە ڕاستی و بێ دەسکرد بەرامبەر هەر توخمێك بە چاکە یا خراپە دەردەبڕێ. دەتوانرێ، ئەم بەشەیان بکرێتە دوو جۆر:

| | |
|---|---|
| پاڕانەوە: | ئەم زوڵمە قبووڵ نەکەی خودایە ! ئەسڵەن ئەمەلم بە کەس نەمایە !<br>ئەم میللەتە گەورەیە و عەزیمە ! سێ پارچە کراوە، بۆتە قیمە. |

أ- هەست دەربڕین بە چاکە: لێرەدا قسەکەر ئەوپەڕی ڕەزامەندیی خۆی

| | |
|---|---|
| سەرسوڕمان: | (وای،) لەم شاخە بەرزەی! ... (ئەڵڵاه،) چەند جوانە ! |
| شیعری وەسفی: | کۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردن کەش، .... ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش! |
| نزا: | تەمەن درێژ بی! ... بێ وەی بی! ... خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ! |

دەربارەی توخمی مەبەستەکەی دەردەبڕێ و بێ ئەوەی توخمەکە گوێی لێ بێ یا نەبێ، قسەکەر هەست و نەستی خۆی بە ڕاستی و بە چاکە دەردەبڕێ. واتە" قسەکەر هیچ مەبەستێکی نییە، تەنیا هەست دەربڕین نەبێ، وەك لە ڕستەی سەرسوڕمان و شیعری وەسفی و پیاهەڵدانی بێ درۆ و نزا و پاڕانەوە و گۆرانی و ...هتد:

ب- هەست دەربڕین بە خراپە: لێرەدا قسەکەر ئەوپەڕی ناڕەزایی خۆی دەربارەی توخمی مەبەستەکەی دەردەبڕێ و بێ ئەوەی توخمەکە گوێی لێ بێ یا نەبێ، قسەکەر هەست و نەستی خۆی بە ڕاستی و بێ دەسکرد و پێچ و پەنا دەردەبڕێ. واتە" قسەکەر هیچ مەبەستێکی نییە، تەنیا هەست دەربڕین نەبێ، وەك لە ڕستەی سەرسوڕمان و شیعری داشۆرینی ڕاست و تووك و نەفرەت و جنێودان (١) و ...هتد:

| | |
|---|---|
| سەرسوڕمان: | (وای،) لەم مناڵە پیس و پۆخڵەی!.....(پەککو،) چەند هیچ و پووچە! |
| شیعری داشۆرین: | ئەسڵ و نەسەبت دۆمە، لە من بووی بە هەجیجی!<br>بێ مروەت و ئینساف و حەڕامزادە و پیچی! |
| تووك لێکردن: | تەمەنت کورت بێ! .. ڕووت ڕەشبێ! .. چاوت کوێر بێ!..هەی داوەششێی! |
| نەفرەت لێکردن: | ئەوەی ڕێگەی لە کوردان گۆڕی، لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕی! |
| جنێو پێدان: | نامەرد!...نارەسەنی!...بێ ئابرووە!...بێ شەرمن!...سەرسواڵکەرین!... |

لە ڕستەی جنێودانا تێبینی ئەوە دەکرێ، کە ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك بە زۆری دەرناکەوێ، چونکە بەرامبەر قسەکەرە و پێویست ناکا، بەڵام بەوە لە کەسی سێیەمی تاك جیادەکرێتەوە، کە لە کەسی سێیەمی تاکدا مۆرفیمی کاتی ئێستا دەردەکەوێ و لە کەسی دووەمی تاکدا دەرناکەوێ، وەك: (تۆ هینی!... هەی هین! ... ئەو هینە!...).

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر بێ ئەوەی گرنگی بدا بە بوون و نەبوونی گوێگر، هەستی ڕاستەقینە و پەنگخواردووی خۆی دەربارەی توخمێك (چاك بێ یان خراپ) دەردەبڕێ.
(ب) دوو جۆری هەیە، هەست دەربڕین بە چاکە و هەست دەربڕین بە خراپە.
(ج) دەبێ قسەکەر هەستی خۆی بە ڕاستی و بێ دەسکاری وەك چۆن لە دەروونیدا هەیە، بەم شێوە دەربڕێ، ئەگەر هەستەکە دەسکرد بێ، ڕستەکە لەم ئەرکە دەردەچێ و هەستی دەسکرد بە چاکە دەبێتە ڕستەی مەرایی و هەستی دەسکرد بە خراپە دەبێتە داشۆرین و شکاندنی توخمەکە.
(د) لە قسەکردندا ئاوازی ڕستەکە لە نزمی بەرەو بەرزییە. لە نووسیندا لە کۆتایی ڕستەکە نیشانەی سەرسوڕمان دادەنرێ.

دەشێ، ڕستەکانی هەست دەربڕین لەگەڵ ئەرکی هەواڵدان تێکەڵ بکرێن، چونکە قسەکەر ڕای خۆی دەربارەی توخمێك (بە چاك یا خراپ) دەربڕیوە، بەڵام ڕستەکانی نزا و پاڕانەوە و تووك و نەفرەت دەشێ بخرێنە سەر ئەرکی فەرماندان و ببن بە جۆرێکی داخوازی، هەرچەندە شێوە و مەبەستی دەربڕینیان لە هەواڵدان و فەرماندان جیاوازە.

پێنجەم: ئەرکی هەست وروژاندن:

لەم بەشەدا قسەکەر دەیەوێ، بەم جۆرە ڕستانە هەستی گوێگر بورووژێنێ و ناڕاستەوخۆ کارێکی پێ ئەنجام بدا (چاکە بێ یا خراپە). واتە" دەیەوێ، چ بە پاداش و تەماحی بێ، چ بە هەڕەشە و ترساندن بێ، فریوی بدا و ناڕاستەوخۆ داواکاریەکەی پێ ئەنجام بدا. بۆیە دەتوانرێ، ئەم بەشە بخرێتە پاڵ جۆرێکی فەرماندان، هەرچەندە قسەکەر شێوازی داواکارییەکەی جیایە.
دەشێ، ئەم بەشەش بکرێتە دوو جۆر:
أ- هەست وروژاندن بۆ سوودی گشتی: لێرەدا قسەکەر هەوڵدەدا بەم جۆرە ڕستانە ناڕاستەوخۆ وا لە گوێگر بکا، کارێکی چاك ئەنجام بدا. لەم جۆرە ڕستانەدا قسەکەر ڕەچاوی هیچ بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆی ناکا و مەبەستی تەنیا سوودبەخشین و بەرژەوەندیی گشتییە. وەك لە وتاری کۆمەڵایەتی و ئایینی و باسی پاداشی بەهەشت و سزای دۆزەخ و لە پەندەکانی پێشینان و ئامۆژگاری و

هاندانی پێشمەرگە و سەرجەم نیشتمانپەروەران بۆ بەرگریکردن لە گەل و وڵات ...هتد.

| | | |
|---|---|---|
| پەنـدی پێشینان: | برا لە پشت برا بێ، مەگەر قەزا لە لای خوا بێ! | مەبەست: یەکگرن |
| هاندان: | ئەم خاکە داکی تۆیە! کەوتە دەستی ئەجنەبی،<br>ئەی کوردی ساحێب غیرەت! تۆ چلۆن ڕازی دەبی؟! | مەبەست: بەرگری کردنە لە نیشتمان. |
| ئامۆژگاری: | بە ڕیشی پان و پرچی پڕ لە ئەسپێ،<br>بناغەی ئیشی کوردان چۆن دەچەسپێ؟! | لێرەدا مەبەست پرسیار نییە، بەڵکو ئامۆژگارییە. |

ب- هەست وروروژاندن بۆ سوودی تایبەتی: لێرەدا قسەکەر هەوڵدەدا بۆ سوودی تایبەتی خۆی بەم جۆرە ڕستانە ناڕاستەوخۆ وا لە گوێگر بکا، کارێك ئەنجام بدا. لەم جۆرە ڕستانەدا قسەکەر ڕەچاوی هیچ بەرژەوەندییەکی گشتی ناکا و مەبەستی تەنیا سوودمەندی تایبەتی خۆی یا گرووپەکەی خۆیەتی. لێرەدا کەمتر باسی ترس و تۆقاندن دەکرێ، بەڵکو بەوە فریوی گوێگر دەدرێ، کە ئەنجامدانی کارەکە بۆ بەرژەوەندی خۆیەتی و ئەنجامدانی کارەکە لە دەروونیا جوان و شیرین دەکا، وەك لە سەرجەم پڕۆپاگەندە بازرگانی و ڕامیاری و گەشتوگوزاری و ...هتد، دەزگاکانی ڕاگەیاندن و میدیاکان لەم ئەرکەدا ڕۆڵێکی باش دەبینن. وەك:

| | |
|---|---|
| پاگەندەی بازرگانی: | فلیمی قەدەر، جوانترین و سەرکەوتووترین فلیمی کوردییە! کە ...... |
| پاگەندەی ڕامیاری: | دەنگدان بە ساڵەهای خەبات! دەنگدانە بە خوێنی شەهیدان! دەنگدانە بە .. |
| پاگەندەی گەشتیاری: | ئەم سەیرانگایە جوانە! جێی شادی گشت دڵانە! نرخەکەی زۆر هەرزانە! |

هەروەها داگیرکەرانیش ئەم جۆرە ڕستانەی تاودان بەکاردێنن بۆ سەربازەکانیان و وایان نیشان دەدەن، کە ئەوان لە سەر مافن و بەرامبەریان بە دوژمن دادەنێن و دەبێ لە ناو ببرێن ...

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) قسەکەر ناڕاستەوخۆ بێ ئەوەی مەبەستەکەی بە زەقی بخاتە ڕوو، دەیەوێ، هەستی گوێگر بورووژێنێ بۆ ئەوەی کارێکی پێ ئەنجام بدا (چاك بێ یان خراپ).

(ب) دوو جۆری هەیە، هەست وروژاندن بۆ سوودی گشتی و هەست وروژاندن بۆ سوودی تایبەتی.

(ج) قسەکەر بۆ وروژاندنی هەستی بەرامبەر، پەنا دەباتە بەر بەڵێندان بۆ پێدانی بەخشش و پاداش، یان هەڕەشە و گەفوگوڕی زیان و سزادان.

(د) بە زۆری دەزگاکانی ڕاگەیاندن و میدیاکان هۆکاری گواستنەوە و بڵاوکردنەوەی ئەو ئەرکەن.

ئەگەرچی هەست دەربڕین و هەست وروژاندن دوو ئەرکی جیاوازن، بەڵام لە بەر ئەوەی هەردووکیان دەربارەی هەستن، یەکەمیان دەربارەی هەستی قسەکەرە و دووەمیان دەربارەی هەستی گوێگرە، دەکرێ وەك دوو بەشی جۆرێك، ناوونیشانێکیان بۆ دابنرێ، وەك: ئەرکی هەست دەربڕین و وروژاندن.

## شەشەم: ئەرکی ڕاپەڕاندن:

مەبەست لە ئەرکی ڕاپەڕاندن ئەوەیە، کە ڕستەی ڕاپەڕاندن خۆی دەبێتە کەرەسە و خودی ئەرکەکە و هەرکە ڕستەکە لە دەمی قسەکەر تەواو بوو، ئەرکەکە ئەنجام دراوە. واتە" مەبەستی قسەکەر ئەنجامدانی کارێکی زارەکییە و کارەکی نییە، کارەکەش بریتییە لە خودی ڕستەکە و لەگەڵ کۆتایی هاتنی دوا وشەی ڕستەکە لە دەمی قسەکەر ئەوا یەکسەر کارەکە ئەنجام دراوە. وەك لە سوێند و تەڵاق خواردن(٢) و بەڵێندان و مەرجکردن و ناونان و کردنەوە و داخستنی ئاهەنگ و کۆبوونەوە و ئێزگە و بۆنەکان و ...هتد. وەك:

| | |
|---|---|
| سوێند خواردن: | سـوێند دەخۆم، کە ئیتر کات بە فیڕۆ نەدەم. ... بە سـەری تۆ، چیتر وا ناکەم. |
| مەرج و پەیمان : | مـەرج بـێ، تـا مـاوم، لـە بیرتـان نەکـەم. ... پـەیمان بـێ، لەمەودوا جگەرە نەکێشم. |
| ناونان: | وا ئەو منالە ناو دەنێین (ڕاپـەڕین). .. ئـەم گەڕەکـە تازەیـە ناو دەنێین (شەهیدان). |
| کردنەوەی بۆنە: | ئەم کۆبوونەوەیەمان (بە سروودی ئەی ڕەقیـب) دەسـت پـێ دەکەین. |

لەم ڕستانەدا تێبینی ئـەوە دەکرێ، ئەگـەر ڕسـتەکە سـادە بـێ، ئـەوا هـەر خـۆی ڕستەی ڕاپەڕاندنـە، بـەڵام ئەگـەر ڕسـتەکە ئاوێـتە بـوو، ئـەوا شاڕسـتەکە ڕسـتەی ڕاپەڕاندنە. بۆ نموونە: لە ڕستەی یەکەمدا، کاتێ قسەکەر وتـی (سوێـند دەخـۆم،) ئیتر تەواو، واتە" سوێندی خوارد، ئیتر ڕستەی دووەم جێبەجێ بکا یا نەکا.

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) ڕستەی ڕاپەڕاندن خـۆی بریتییـە لـە خـودی ئـەو کـارەی، قسـەکەر دەیـەوێ ئەنجامی بدا و هەر کە کۆتایی بە ڕستەکە هێنا، ئەرکەکە ئەنجام دەدرێ.

(ب) زۆربەی ڕستەکان لە کاتی ڕانەبوردوودان، ئەکەر کران بە ڕابوردوو دەبـن بـە ڕستەی هەواڵدان.

(ج) قسەکەر بە زۆری کەسی یەکەمی تاکە (دەشێ بە نوێنەرایەتی یەکەمی کۆش قـسە بکـا) و خـۆی ئەنجامـدەری کارەکەیـە، کارەکـەش زارەکییـە و خـودی ڕستەکەیە.

(د) ئاوازی ڕستەکان یا ئاسۆیی یا لـە سـەرەوە بـەرەوخوارە و لـە نووسـیندا لـە کۆتایی وێرگوڵ یا خاڵ دادەنرێ.

ئەم ئەرکەش ئەرکێکی لاوەکییە و زۆر جیاوازی لەگەڵ ئەرکی هەواڵدان نییە و دەشێ بخرێتەوە سەر ئەرکی هەواڵدان.

حەوتەم: ئەرکی کۆمەڵایەتی:

ئـەرکی کۆمەڵایـەتی، هەنـدێ ئـەرکی خۆبردنەپـێش یـا مەراییـشی پـێ دەوترێ، کە بریتییە، لەو ڕستانەی لـە سـڵاوکردن و چاکوچـۆنی و هـەواڵ پرسـین

بەکاردێـن. مەبەسـتی قـسەکەر لـەم جـۆرە ڕسـتانە، نیـشاندان و پتـەوکردنی پەیوەندی نێوان خۆی و گوێگرە. وەك:

| | |
|---|---|
| سڵاوکردن: | بەیانیت باش!.. ماندوو نەبی!.. سڵاوتان لێ بێ!.. بـە خـێر بـێن!.. خواتان لەگەڵ!.. |
| چاکوچۆن: | چـــۆنی؟!.. لـــە چـــیای؟!.. باوکـــت چـــۆنە؟!.. کـــووی؟!.. تەندروستیتان؟!.. باشن؟!.. |

سیماکانی ئەو جۆرە ڕستانە ئەمانەن:

(أ) لە ڕستەی کۆمەڵایەتیدا، ئەگەر قسەکەر مەبەستی مـەرایی و خۆبردنـە پێـشی نەبێ، واتە" هیچ ئیشێکی بە گوێگر نەبێ، ئەوا مەبەستی نیشاندانی بێگەردی و پتەوی پەیوەندی نێوانیانە.

(ب) هەندێ جار لە ڕستەکاندا کار سواوە و لە ئاستی سـەرەوەدا دەرناکـەوێ، وەك لە (بەیانیت باش!) لە بنەڕەتا (بەیانیت باش بێ!)، یان (تەندروسـتیتان؟!)، لە بنجدا (تەندروستیتان چۆنە؟!).

(ج) ئەگەر ڕستەکە لە شێوەی پرسیاری بێ، ئەوا جیاوازی لەگەڵ ئەرکی پرسـیاری لەوەدایە، کە قسەکەر چاوەڕێی وەڵامی گوێگر ناکـا. واتـە" کـاتێ قـسەکەر بـە گوێگر دەڵێ (چۆنی؟!، باشی؟!)، مەبەستی ئەوە نییە، گوێگر باسی خۆی بۆ بکا، بەڵکو مەبەستی تـەنیا سـڵاوە. ئەگـەر هـاتوو قسەکەر چاوەڕێـی وەڵامـی کرد، دیارە مەبەستی پرسیارکردنە، نەك چاکوچۆنی.

(د) ئاوازی ڕستەکان یان لە شێوەی پرسیاریدان، یـان لـە شـێوەی داخـوازی و لـە کۆتـایی سـڵاودا نیـشانەی سەرسـوڕمان دادەنـرێ و لـە کۆتـایی چاکوچـۆنیدا نیشانەی پرسیار و سەرسوڕمان دادەنرێن.

ئەرکی کۆمەڵایەتیش ئەرکێکی لاوەکییە و دەشـێ جـۆری سـڵاوکردنەکە بکـرێ بـە بەشـێك لـە داخـوازی و جـۆری هەواڵپرسـینەکەش بخرێـتە سـەر جـۆری ئـەرکی پرسیاری.

## ((ئەنجامەکان))

دەشێ ڕستەی کوردی پۆلین بکرێ بۆ تەنیا دوو جۆر ڕستەی سەرەکی:

یەکەم: سادە – دەتوانرێ بە پێی سیماکان، سێ جۆر ڕستەی سادە جیا بکرێنەوە:

أ ـ سادەترین ڕستەی کوردی: بە تەنیا لە یەك تاکە وشە پێك دێ.

ب ـ ڕستەی سادەی ئاسایی: بە پێی جۆری کارەکە، تەنیا بەشە سەرەکییەکانی ڕستەی تیادایە لە بکەر و بەرکار و کار.

دووەم: ناسادە – دابەشی دوو بەش دەبێ:

أ ـ ڕستەی لێکدراو: سێ جۆر ڕستە دەگرێتە خۆی: (هاوڕێك)، (پێچەوانە)، (هەڵبژاردە) و (نەرێ).

ب ـ ڕستەی ئاوێتە (تێکەڵ): دوو جۆر ڕستە دەگرێتە خۆی: (دیارخەری ناو) و (دیارخەری کار).

ڕستەی کوردی لە ڕووی گەیاندنی واتاوە، دەتوانرێ حەوت جۆر ئەرکی سەرەکی جیابکرێنەوە و دەشێ هەندێ لەو ئەرکە سەرەکییانە بۆ ئەرکی وردتر دابەش بکرێن:

١ـ ئەرکی زانیاری و هەواڵدان.
٢ـ ئەرکی پرسیاری.
٣ـ ئەرکی فەرماندان، داخوازی، خۆزگەیی (ئارایی).
٤ـ ئەرکی هەست دەربڕین (سەرسوڕمان).
٥ـ ئەرکی هەست ورووژاندن.
٦ـ ئەرکی ڕاپەڕاندن.
٧ـ ئەرکی کۆمەڵایەتی.

دەشێ ئەگەر سیماکان بە درشتی وەرگرین، ڕستەی کوردی لە ڕووی ئەرکەوە، تەنیا دابەشی سێ جۆر بکەین: ڕستەی (هەواڵی)، (پرسیاری) و (ئارایی)، بەڵام ئەگەر سیماکان بە وردی وەرگرین، دەشێ ڕستەی کوردی لە ڕووی ئەرکەوە، دابەشی پتر لە دە جۆر بکەین.

# ((ملخص البحث))

رغم قصر مدة تأريخ الدراسات اللغوية ولاسيما الأكاديمية عند الكورد مقارنة بالشعوب الأخرى، ولكن قلما نجد باحثا لغويا في اللغة الكوردية لم يتطرق بشكل أو بآخر الى تصنيفات الجملة. ولكتابة هذا البحث، تم الإستفادة من كل الجهود السابقة مقارنة بالتصنيفات في اللغات الأخرى المعروفة لدى الباحث، مثل العربية والانكليزية والفارسية. حيث تم تصنيف الجملة بشكل علمي آخر، مع مراعات خصوصيات اللغة الكوردية. ولتحقيق ذلك بادر الباحث الى تقسيم البحث الى ثلاثة فصول، إضافة الى اهم النتائج وملخص البحث باللغتين العربية والأنكليزية وهوامش الفصول الثلاثة والمصادر.

ففي الفصل الأول: تطرق الباحث الى الجملة البسيطة، بأنواعها الثلاثة: (الأبسط) (الإعتيادي) و (الموسع).

أما الفصل الثاني: يتناول الجملة غير البسيطة، بنوعيها المركبة والمعقدة، تنقسم كل منها الى أنواع ثانوية أخرى.

والفصل الثالث: مخصص لتناول تصنيف الجملة الكوردية على أساس دلالات الجمل، حيث تمكن الباحث من تميز سبعة أنواع من الجمل حسب الوظيفة الدلالية التي تؤدي كل منها.

## ((Summary))

## Sociolinguistic Differences between Rural and Urban Subvarieties

This study sheds some light on the social and linguistic differences between rural and urban subvarieties in Kurdish. Many people regard rural subvariety and accent as debased and inferior from of Kurdish. They believe that certain rural expressions would provoke laughter, anger, and ridicule.

The study discusses the people social attitudes about the appropriateness of certain linguistic varieties to certain social contexts. The people of town regard themselves to be at the top of social scale, and they regard the villagers to be at the and of social scale, particularly in the case of peasants in isolated rural areas. This is due to the general economic, demographic and culture dominance of twon over country.

The study investigates the Kurdish society in the period before the third millennium, when the social condition in Iraqi Kurdistan, to a large extent, was stable. The effects of displancement, Arabization, and Anfal campagin were not so obvious.

In the first part of the paper, the daily life of both rural and urban Societies are evaluated. The Social effects on the language of each society is discussed .

In the second parts the relationship between the individuals of each society is classified. Depanding on this classification, the two regional subvarieties are compared.

The third part is a comparison between the rural and urban subvarieties, with regard to the principles of language simplification and brevity-including the loss of redundant teatures and the omission of irregularties .

The study ends with conclusions and bibliography.

**((پەراوێزەکانی بەشی یەکەم))**

(١) لە زماندا هیچ ڕستەیەك بێ کار نابێ، چونکە ڕستە لە ڕووی واتاوە بوون و نەبوونی ڕووداوێك دەگەیێنێ، لە کاتی ڕابوردوو بێ یا ڕانەبوردوو (ئێستا + داهاتوو). ڕووداویش واتە" گەیاندنی بارودۆخی تەنێك، وەستاو بێ یا جوولاو. هەر بۆیەشە ڕستە بە بێ توخمێك (فرێزی ناوی) و کارێك (فرێزی کاری) دروست نابێ. دۆخە وەستاوەکە (کە نیشاندانی باری ئێستای توخمەکەیە و تەنیا لە خستنە ڕووی کاتی ئێستای توخمەکە ڕوودەدا) و تەنیا لەم بارەدا ڕەگی چاوگی ئارایی (("هە"بوون)) دەتوانێ ئەم ڕۆڵە بگێڕێ، چونکە لە کاتی ئێستادا دەرناکەوێ، وای لە هەندێ زمانەوانە کوردەکان و ناکوردەکان کردووە باوەڕ بە بوونی ڕستەی ناوی (ڕستەی بێ کار) بکەن. هەندێ زمانەوانی تر ڕێچکەی ئەوەیان گرتووە، مۆڕفیمی (ە)ی کاتی ئێستا بە کار دابنێن و ناوی (کاری بێ هێز)ی لێ بنێن. لە هەموو کارێکی زمانی کوردیدا دوای ڕەگی کار مۆڕفیمی کات دێ و ڕاناوە لکاوەکانیش پێشگر بن یا پاشگر ڕۆڵی توخمەکان دەردەخەن. بەراوردی ئەم ڕستانە بکە:

| | فرێزی ناوی | ڕەگی چاوگی (بوون) | مۆڕفیمی کات | ڕاناوی لکاوی ك٣ت |
|---|---|---|---|---|
| ١- | پیاو | بـ (دەرنەکەوتووە) | ە (کاتی ئێستا) | سفر (دەرنەکەوتووە) |
| ٢- | پیاو | بـ (دەرکەوتووە) | ێ (کاتی داهاتوو) | سفر (دەرنەکەوتووە) |
| ٣- | پیاو | بـ (دەرکەوتووە) | وو (کاتی ڕابوردوو) | سفر (دەرنەکەوتووە) |

لە ڕستەی یەکەمدا ڕەگی کار (ب) دەرنەکەوتووە، ئەگەر دەرکەوێ ڕستەکە لە هەواڵدانی کاتی ئێستا دەگۆڕێ بۆ ڕستەی فەرماندان و کەسەکەش لە کەسی سێیەمی تاك دەگۆڕێ بۆ دووەمی تاك.

لە ڕستەی یەکەم و دووەمدا مۆڕفیمەکانی کاتی ئێستا (ە) و داهاتوو (ێ) تەنیا لە کەسی سێیەمی تاك دەردەکەون، چونکە ڕاناوی لکاو سفرە و

دەرناکەوێ، بەڵام لە کەسەکانی تر دەرناکەون، چونکە ڕاناوەکان (م/ی/ین/ن/ن) سفر نین و دەردەکەون.

دەشێ، کەسی مۆرفیمەکانی ئێستا و داهاتوو لە ڕستەیەکدا ڕۆڵ ببینن، ئەو کاتە دەبێتە کاتی ڕانەبوردوو. وەك: پیاو ە+ب+ێ+سفر یان ە+ب+ێ+سفر بە پیاو). هەروەها دەشێ، مۆرفیمەکانی ئێستاو ڕابوردوو لە ڕستەیەکدا ڕۆڵ ببینن، ئەو کاتە دەبێتە کاتی ڕابوردووی بەردەوام. وەك: پیاو ە+ب+وو+سفر یان ە+ب+وو+سفر بە پیاو).

(٢) زاراوەی توخممان لە بری کەس بەکارهێنا، چونکە وا باوە کەس بە زۆری واتای مرۆڤ دەبەخشێ، بەڵام ئەو کەرەسانەی ڕۆڵی بکەر یا بەرکار دەبینن لە ڕستەدا، مەرج نییە هەردەم مرۆڤ مرۆڤ بن، دەشێ گیانەورێ یان بێ گیانێك بێ، بۆیە ویستمان زاراوەی توخم هەموویان بگرێتەوە.

(٣) لەم خشتەیەدا بە بێ پێشگر و پاشگرەکانی وەك (هەڵ-، دا-، ڕا-، وەر-، ... -ەوە، ...) پۆلینی زۆربەی چاوگەکان دەخەینە ڕوو:

| چاوگی تێپەڕ | چاوگی تێنەپەڕی بکەری | چاوگی تێنەپەڕی بەرکاری |
|---|---|---|
| کوتان،پەستان، هەڵێنجان، دان، | وەستان، | چەسپان، قەپان، ڕووتان، |
| کێشان، پێکان، پێوان، شێلان، | چەرخان، | سووتان، فەوتان، ترنجان، |
| کێلان، هێلان، نان، هێنان، ... | دامەزران، | قنجان، گونجان، گرمخان، |
| گرتن، گەستن، بێشتن، پاراستن، | گوزەران، | ڕووخان، خوران، شۆران، |
| خواستن، خستن، پەرستن، ڕستن، | تۆران، پاڕان، | وێران، پچڕان، دڕان، زڕان، |
| گواستن، بەستن، بیستن، ویستن، | سووڕان، | دۆڕان، زان، ترازان، برژان، |
| لێستن، ناشتن، ڕشتن، چەشتن، | گەڕان، | بۆرژان، ڕژان، کوژان، |
| هاژۆشتن، شووشتن، کوشتن، | لەوەڕان، | شلەژان، هەژان، تاسان، |
| کرۆشتن،فرۆشتن، ڕۆیشتن، | سازان، | پسان، ترسان، گیرسان، |
| هاوێشتن، وتن، پەنداوتن، ئاخاوتن، | کرووزان، | ئاوسان، خەسان، |

| | | |
|---|---|---|
| ئەنگاوتن، پاڵاوتن، ...<br>بژاردن، شاردن، ژماردن، ناردن، خواردن، بردن، کردن، بووردن، کەندن، خوێندن، ستاندن، ڕەتاندن، ڕیخاندن، چەراندن، درکاندن، تەکاندن، سەنگاندن، لاواندن، نواندن، خایاندن، قیژاندن، چیڕاندن، لووراندن، گرماندن، بۆڕاندن، زیڕاندن، زریکاندن، میاواندن، قیڕاندن، حیلاندن، نەڕاندن، شیڕاندن، فیکاندن، چریکاندن، جریواندن، لەنگاندن، چرپاندن، گماندن، قاسپاندن، قووقاندن، ...<br>پاچین، قاچین، شاخین، هاڕین، بڕین، چڕین، سڕین، کڕین، گۆڕین، دزین، دۆزین، مژین، تۆژین، ناسین، واسین، پرسین، نووسین، تاشین، بەخشین، دۆشین، گوشین، لووشین، پۆشین، کۆشین، نۆشین، گلۆفین، ماڵین، کۆڵین، زانین، سمین، توانین، ڕوانین، ڕنین، پشکنین، چنین، ئاخنین، ژەنین، هۆنین، بینین، ...<br>دروون، سوون، جوون، هەنوون، گروون، فەرموون، | نووزان، گژان، ئاڕسان، کاوان، دوان، خولان، جووڵان، ژیان، گریان، ڕامان، ....<br>هاتن، نووستن، گەیشتن، خەوتن، سرەوتن، ...<br>حەپین، لەوچین، باڕین، زەڕین، فڕین، پەڕین، وەڕین، خوڕین، نازین، گەوزین، گرژین، خشین، چەقین، جەنگین، ناڵین، کەنین، | خووسان، نووسان، ئایسان، نەخشان، ترشان، ڕشان، کشان، داڕووشان، درەوشان، داوەشان، تلیشان، قڵیشان، ئێشان، لەقان، شڵەقان، بریقان، تکان، بزرکان، شکان، لکان، دامرکان، خلیسکان، خنکان، ترووکان، شەکان، پەشۆکان، توان، ڕوان، بزوان، شێوان، گوان، لوان، تلان، کولان، گلان، کوڵان، مان، ڕمان، ڕووخان، پەلمان، کڕان، دڵۆپان، ...<br>پشکووتن، کەوتن، ...<br>مردن، ...<br>بارین، خزین، ڕزین، لەرزین، بەزین، تەزین، تۆپین، تەقین، تۆقین، چڵەکین، کۆکین، پژمین، گەنین، مەیین، خەمڵین، ...<br>بوون، هەبوون، ... |

تێبینی ئەوە دەکرێ، هەندێ جار بە گۆڕینی گیرەکەکان، یان گۆڕانی واتا پۆلی هەندێ چاوگ بگۆڕێ. هەندێ چاوگ دەتوانن، لە گەڵ دوو پۆل ڕەفتار بکەن (تێنەپەڕی بکەری و بەرکاری)، وەك:( گریان، ژیان، کشان ... ):

تەنە ڕەقەکان بە گەرما دەکشێن. ( تێنەپەڕی بەرکاری).

بە گەرما پلەی گەرما هەڵدەکشێ و بە سەرما دادەکشێ.

هێزەکانی هاوپەیمانان دوای ڕزگارکردنی کوێت کشانەوە. (تێنەپەڕی بەرکاری).

بە هاوین کۆچەرەکان بەرەو کوێستان هەڵدەکشێن و بە زستان بەرەو گەرمیان دادەکشێن.

هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ، ڕستەی فەرماندان لە تێنەپەڕی بەرکاری دروست ناکرێ، ئەگەر دروست کرا واتای چاوگەکە دەگۆڕێ. وەك: کاتێ دایکێك بە منداڵەکەی دەڵێ: (بتۆپە.)، واتای مردن و تۆپین نادا، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ( بخەوە.). هەندێ جار بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی دەتوانرێ، جۆرێك لە فەرماندان لە (بوون) دروست بکرێ، بەڵام ئەو کاتە (بوون) واتای (گواستنەوە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر، یان – بوون بە ...) دەدا نەك ئارایی[ عەبدولوەهاب– ٤٤-٤٧]. وەك: ببە بە پیاو. یان ببە پیاو، پیاو بە، کە ڕەنگە فەرمان پێکراوەکە لە ئارادا (لە بووندا) پیاو بێ، بەڵام ڕەفتاری پیاوە نەبێ. ئەمە ئەوە ناگەیێنێ، کە فەرماندان لە تێنەپەڕی بکەری واتای تر نادا، وەك: (هەستە لە خەو ئەی لاوی کورد ...) لێرەدا واتای بنجی ڕستەکە ( بێدار بوونەوەیە لە نووستن) و واتا خوازراوەکەشی (وشیار بوونەوەیە لە بێ ئاگایی)، بەڵام لە فەرماندانی تێنەپەڕی بەرکاری واتا بنجییەکە دەناکەوێ و تەنیا واتا خوازراوەکەی دووەم دەردەکەوێ.

جگە لەمەش بە زۆری لە تێنەپەڕە بکەرییەکان توخمەکە سوودمەند دەبێ، یان زیانی پێ ناگا، بەڵام بە زۆری لە تێنەپەڕییە بەرکارییەکان توخمەکە زیانی پێ دەگا. لەم دیاردەی زیان پێگەیشتنەدا، چاووگی ﴿هە(بوون)﴾ ناوێزەیە. ئەگەرچی چاووگی ﴿هە(بوون)﴾ هەردەم تێنەپەڕێکی بەرکارییە، چونکە توخمەکە ناتوانێ ڕۆڵێکی بکەریی ئارەزوومەندی ڕەها بگێڕێ لە بوون یا هەبوونی شتێك. ئەگەر بە ئارەزووی توخمەکە بێ بەم شتە ڕازی نابێ و داوای

بالاتر دەکا، بۆیە زۆربەی بە ناچاری سوپاسگوزاری بوون و هەبوونەکانیەتی. بۆ نموونە: کە قوتابییەك دەڵێ: ( دەبم بە مامۆستا.)، ئەمە بارودۆخەکە ناچاری کردووە، کە مامۆستایەتی هەڵبژێرێ، ئەگەر لە دەستی بێ، دەبێتە وەزیر، یا پاشا. دەڵێن ( فیرعەون ) پاشای جیهان بوو، داوای خوایەتی دەکرد.

ناوێزەیی ﴿هە(بوون)﴾ لەوەدایە: توخمەکە لە بوون و هەبوونی شتە باشەکان، وەك: سامان و خۆشی و ... هتد زەرەرمەند نابێ، بەلام لە بوون و هەبوونی شتە خراپەکان، وەك: هەژاری و خەم و ناخۆشی و ... هتد زیانمەند دەبێ. بۆ نموونە: کە دەڵێین: ( منالەکە بوو. ). نازانین، ژیانی ئەو منالە چۆن دەبێ؟! لەم بارەیەوە خەیام دەڵێ:

هاتن بە دەستی خۆم نەبوو هێنایانم، دەرچوونە دەریش چۆن و کەیە؟ نازانم.
خۆزگە! نە هاتبام، نە چووبام، نە ببام، لەم گێرە و کێشەدا ڕەحەتبا گیانم.

(٤) هەرگیز ڕەگی کار وەك مۆرفیمێکی سەربەخۆ دەرناکەوێ، ئەگەر دەرکەوت، وەك ڕەگی کار ڕەفتار ناکا. بۆ نموونە: ( دزەکە شتێکی دزی.) لێرەدا (دز)ی یەکەم ناوە و جیاوازە لە (دز)ی دووەم کە ڕەگی کارە.

(٥) (و)ی مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو، مۆرفیمێکە، هێمایە بۆ کەسێکی نادیار، کە کارێکی بەسەردا هاتبێ. واتە" هێمای بەرکارێکی نادیارە. بە پێچەوانەی مۆرفیمی (ر)ی بکەر نادیار کە هێمایە بۆ کەسێکی نادیار، کە کارێکی ئەنجام دابێ یا ئەنجام بدا. واتە" جگە لەوەی هەردووکیان دەتوانن، ئاوەڵناوی دەسکرد دروست بکەن، وەك: ئاوەڵناوی کراوی ( سووتاو، مردوو، ڕزیو، دانیشتوو ...)، یان ئاوەڵناوی بکەری ( نووسەر، سووتێنەر، تێکدەر، نامەبەر ...)، جیاوازییان لەوەدایە لە ڕستەدا، مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو تەنیا لە ڕستەی ڕابوردوودا بەکاردێ، وەك: ( پووشەکە سووتاوە. نامەکە نووسراوە. کابرا کوژراوە. .......)، بەلام مۆرفیمی ئاوەڵناوی بکەر دەتوانرێ ڕستەی ڕابوردوو و ڕانەبوردووی لە بکەر نادیاردا پێ دروست بکرێ، وەك: (پووشەکە سووتێنرا / دەسووتێنرێ. نامەکە نووسرا / دەنووسرێ. کابرا کوژرا / دەکوژرێ. ...).

مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو لە دیالێکتی ناوەڕاستدا (و)ە، لە دیالێکتی ژووروودا دەبێتە (ی) و لە دیالێکتی خواروودا دەبێتە (گ). وەك:

سووتاوە، مردووە، هاتووە، ..... ( دیالێکتی ناوەڕاست)
سـۆتیە، مـریـە، هـاتیە، ..... ( دیالێکتی ژووروو)
سووزیاگە، مردگە، هاتگە ..... ( دیالێکتی خواروو)

(٦) چاوگێکی تێنەپەڕ و شەش چاوگی تێپەڕ هەن، لەبەر ئـەوەی لـە بنەڕەتـدا ڕەگەکانیان کۆتایی دێ بە بزوێنی (ە)، لـە هـەموو کەسـەکان تەنانـەت لـە کەسـی سێیەمی تاکیش مۆرفیمی (ێ)ی کاتی داهاتوو دەرناکەوێ، لە بـری ئـەوە لـە بـەر ئەوەی لە کەسی سێیەمی تاکدا ڕاناو دەرناکەوێ، (ە)ی بزوێنە کورتەکەی کۆتایی ئەم ڕەگانە درێژ دەبێتەوە و دەبێتە (ا)ی بزوێنی درێـژ، هـەروەها ئـەو چـاوگانەی ڕەگەکانیان بە (وە) کۆتـایی دێ، ئـەم دوو دەنگـی (و) و (ە)یـە جگـە لـە کەسـی سێیەمی تاك لە هەموو کەسەکانی تـر لـێك دەدەن و دەبـن بـە (ۆ)، واتـە: (و + ە ← ۆ) ئەمانــەش دیــاردەی دەنگــسازین و پەیوەنــدییان بــە واتــاوە نییــە. چاوگەکانیش ئەمانەن:

| چاوگ | ڕەگی بنەڕەت | | یەکەمی تاک | دووەمی تاک | سێیەمی تاك | یەکەمی کۆ | دووەمی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆیشتن | ڕەوتەن | ڕوە | دەڕۆØم | دەڕۆØی | دەڕواØØ | دەڕۆØین | دەڕۆØن |
| **بردن** | بەردەن | بە | دەبەØم | دەبەØی | دەباØØ | دەبەØین | دەبەØن |
| کردن | کەردەن | کە | دەکەØم | دەکەØی | دەکاØØ | دەکەØین | دەکەØن |
| خواردن | خوەردەن | خوە | دەخۆØم | دەخۆØی | دەخواØØ | دەخۆØین | دەخۆØن |
| دان | دادەن | دە | دەدەØم | دەدەØی | دەداØØ | دەدەØین | دەدەØن |
| شووشتن | شوەردەن | شوە | دەشۆØم | دەشۆØی | دەشواØØ | دەشۆØین | دەشۆØن |
| هاژۆشتن | هاژوەشتەن | هاژوە | دەهاژۆØم | دەهاژۆØی | دەهاژواØØ | دەهاژۆØین | دەهاژۆØن |

(٧) جیــاوازی نــێوان ئاوەڵنــاوی کــراو و ئاوەڵنــاوی سروشــتی لــە دوو خاڵــدا دەردەکەوێ:

١– ئاوەڵناوی کراو سیما و ناوەڕۆکێکی نوێ دەداتـە پـاڵ کەسـەکە. واتـە" لـە بنەڕەتـدا نـەبووە و لـە ڕابـوردوودا کارەکـەی بـە سـەردا هـاتووە، وەك: سـووتاو، وەسـتاو، ڕژاو، دڕاو، دانیـشتوو، مـەییو، ترشـاو، ......هتـد، بـەڵام ئاوەڵنـاوی سروشتی سیما و ناوەڕۆکەکەی سروشـتییە و لـە بنەڕەتـدا هـەبووە، وەك: جـوان، باش، خراپ، شیرین، ترش، قەڵەو، کورت ....هتد.

٢- ئاوەڵناوی کراو لە کاری تێپەڕی بکەر دیار ئەگەر وشەیەکی لێکدراو نەبێ، بە دەگمەن دروست دەکرێ، وەك: گورگان خواردوو، ماران گەستوو، گرتووخانە....)، بەڵام لە بکەر نادیاردا بە ئاسانی دروست دەکرێ، وەك: نووسراو، کوژراو، سووتێنراو....هتد.

(٨) بۆ ڕوونکردنەوەی فۆڕمی (ـ ەتی)، بەراوردی ئەم ڕستانە بکە:

| چاوگی (هەبوون) لەگەڵ *ڕاناوی ڕێککەوتن* | | | | | چاوگی (هەبوون) لەگەڵ *ڕاناوی خاوەنی +ڕاناوی ڕێککەوتن* | | | | | | وەرچەرخان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕاناوی لکاوی خاوەنی | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | |
| من | هە | Ø | Ø | م | من | هە | ـمـ | Ø | ـە | Ø | |
| تۆ | هە | Ø | Ø | ی | تۆ | هە | ـتـ | Ø | ـە | Ø | |
| ئەو | هە | Ø | ـیـ (ناوبڕ)+ە | Ø | ئەو | هە | ـیـ | Ø | ـە | Ø | تـ (ناوبڕ)+ی |
| | | | | | | ←←←←←←←←←←←← | | | | | |

لە کەسی سێیەمدا دەبینین، کاتێ ڕاناوی خاوەنی پتر دەبێ، هاوشێوەی بەرامبەرەکەی (بە بێ ڕاناوی خاوەنی) دەبێ، کە لە وێشدا فۆڕمەکە بریتییە لە (هەیە ← هە + Ø + ـیـ (ناوبڕ)+ە + Ø )، ئینجا کە ڕاناوی خاوەنی پتر دەبێ، فۆڕمەکە هاوشێوەی یەکەم دەبێ و دەبێتە (هەیە ← هە + ـیـ + Ø + ـە + Ø )، بۆیە بۆ ڕزگاربوون لە لێڵواتایی وەرچەرخانێك ڕوودەدا و وادادەنرێ، کە هەردوو فۆڕمەکە هاوشێوەن، بەم شێوەیە (ی)ی ڕاناوی لکاو لە فۆڕمی دووەم یەکسان دەبێ بە (ی)ی ناوبڕ لە فۆڕمی یەکەم، بەم شێوەیە پێویستیمان بە (ی)یێکی ڕاناوی لکاوی خاوەنی دەبێ، تاکو خاوەنێتی کەسی سێیەمی تاك بنوێنێ لە فۆڕمەکەدا و ئەم (ی)یەی ڕاناوی لکاوە دەچێتە کۆتایی فۆڕمەکە و دەبێتە (هەیەی)، بەڵام لە نێوان هەردوو بزوێنەکەی کۆتایی پێویستیمان بە ناوبڕێك دەبێ و لەم بارەدا دەنگی (تـ) ڕۆڵی ناوبڕەکە دەبینێ و فۆڕمەکە دەبێتە

(هەیەتی). لە سەرجەم داڕشتنە هاوشێوەکانی ئەم فۆڕمە ئـەم دیاردەیـە دووبـارە دەبێتەوە. وەك:

| ڕاناوی ڕێککەوتن | | | | | ڕاناوی خاوەنی +ڕاناوی ڕێککەوتن | | | | | | وەرچەرخان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕاناوی لکاوی خاوەنی | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | |
| من | برا | Ø | Ø | م | ئەو | برا | ـمـ | Ø | ـە | Ø | |
| تۆ | برا | Ø | Ø | ی | ئەو | برا | تـ | Ø | ـە | Ø | |
| ئەو | برا | Ø | یـ (ناوبڕ)+ە | Ø | ئەو | برا | یـ | Ø | ـە | Ø | تـ (ناوبڕ)+ی |
| | | | | | | ←←←←←←←←←←← | | | | | |

هەروەها دەتوانی بەراوردی بکەی لەگەڵ گۆڕینی کەسەکان:

| ڕاناوی ڕێککەوتن | | | | | ڕاناوی خاوەنی +ڕاناوی ڕێککەوتن | | | | | | وەرچەرخان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | فریزی ناوی | پێشگری ئەرێ | ڕاناوی لکاوی خاوەنی | ڕەگی (بوون) دەرنەکەوتووە | مۆرفیمی کاتی ئێستا | ڕاناوی لکاوی ڕێککەوتن | |
| من | برا | Ø | Ø | م | من | برا | تـ | Ø | Ø | م | |
| تۆ | برا | Ø | Ø | ی | تۆ | برا | مانـ | Ø | Ø | ی | |
| ئەو | برا | Ø | یـ (ناوبڕ)+ە | Ø | ئەو | برا | یانـ | Ø | ـە | Ø | |

(٩) لـە کـرداری تـێپەڕاندندا ئەگـەر بـە وردی سـەرنجی ڕۆنـانی چـاوگ بـدەین، دەبیـنین، بـە گـشتی پـێك هـاتوون لـە (ڕەگ+مـۆرفیمی کـاتی ڕابـوردوو+{ن}ی چـاوگ). ئـەم {ن}ی چـاوگە {ن}ێـکی کـۆی ئاسـاییيە و هـەموو ئـەو ئەگـەری

ڕووداوانانە کۆ دەکاتەوە، کە ڕەگی کارەکە لە ڕابوردوودا دەشێ ڕوویاندابێ. بۆیە {ن}ێکی کۆی بێ لایەنە و ناگەڕێتەوە بۆ هیچ توخمێك، ئەم بێلایەنیەشە وای کردووە، مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی پێش {ن}ی چاوگ نەتوانێ، لە چاوگدا ڕۆڵی خۆی ببینێ، چونکە توخمێك نییە، تاکو ڕەگی کارەکەی پێ ڕاپەڕێنرێ. ئاشکرایە، کە {ن}ی چاوگ چاڵی سێیەمی چاوگ پڕ دەکاتەوە، کە لە کاتی گەردانکردندا ئەم چاڵە دەبێتە شوێنی توخمەکان، واتە" {ن}ی چاوگ شوێنی توخمەکانی پڕ کردۆتەوە و هەر کاتێك لادرا، توخمێك دێتە شوێنی. بۆیە، لێرە دەگەینە ئەنجامێك، ئەگەر لە چاوگە تێنەپەڕەکاندا {ن}ێکی تری چاوگ بخەینە دوای {ن}ی بنەڕەتی چاوگە، ئەوا چاڵێکی تر بۆ توخمێکی زیاد دەبێ و بەمەش توانای چاوگە تێنەپەڕەکە لە بەڕێوەبردنی توخمێك دەگۆڕێ بۆ دوو توخم، واتە" کارەکە لە تێنەپەڕ دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ (عەبدوللا١٣٠ـ١٣٦)، وەك: ( سووتان ← سووتانن ← سووتانــ م / ت / ی / مان / ..)، ( وەستان ← وەستانن ← وەستانــ م / ت / ی / مان / ..)، بەڵام تێبینی ئەوەش دەکرێ، ئەو چاوگە تێنەپەڕانەی مۆڕفیمەکانی کاتی ڕابوردوویان (ا) نییە، واتە" (ا)یی نین، مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووی (ا) دێتە جێی ئەلۆمۆڕفەکەی تری، واتە" چاوگوکو دەگۆڕێ بۆ (ا)یی، ئینجا (ن)ێکی تر دەخرێتە دوای {ن}ی یەکەمی چاوگەکە و دەبێتە تێپەڕ، وەك : (خزین ← خزان ← خزانن)، (مردن ← مران ← مرانن) (تەقین ← تەقان ← تەقانن) ...هتد. جگە لە شێوەزاری سلێمانی لە شێوەزارەکانی تری دیالێکتی ناوەڕاست (د)ێك دەکەوێتە نێوان هەردوو {ن}ی چاوگەکە، کە ڕۆڵێکی ئاسانکردنی گۆکردن دەبینێ لەم شێوەزارانەدا و جگە لەمەش دەبێتە مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووش، هەرچی (ا)ی مۆڕفیمە یەکەمەکەی کاتی ڕابوردووە، لە بەر ئەوەی لە دوای گەردانکردنیشدا {ن}ـە ڕەسەنەکەی چاوگی هەر بە دوادا دەمێنێ، بۆیە لە ڕووی گەیاندنی واتا ڕۆڵی نامێنێ، بەڵام ڕەفتاری خۆی هەر دەنوێنێ، واتە" لە ڕابوردوودا هەر (ا) دەبێ و لە ڕانەبوردوودا دەبێتە (ێ)ی داهاتوو، وەك:

أ‌- لە ڕابوردوو:

| ڕستە | ڕەگی تێپەڕ | مۆرفیمی ڕابوردوو | بەرکار | بکەر |
|---|---|---|---|---|
| سـووتاندØ ی | سووتان | د | Ø | ی |

لـەم جـۆرە چـاوگە تـێپەڕێنراوانەدا تـێبینی ئـەوە دەکـرێ، کـە ڕەگـی چـاوگە تێپەڕێنراوەکە یەکسانە بە خودی چاوگە ڕەسەنە تێنەپەڕەکە، کە لەم نموونەیـەدا (سووتان)ە. ئەم ڕەگـەش لـە خـودی خۆیـدا پـێك هـاتووە لـە : ڕەگ (سـووت) + مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو (ا) + نوونی چاوگ (ن).

ب‌- لە ڕانەبوردوو:

| ڕستە | مـــــــۆرفیمی ئێستا | بەرکار | ڕەگـــــی تێپەڕ | مـــــــۆرفیمی داهاتوو | بکەر |
|---|---|---|---|---|---|
| دەیسووتـــێنێ Ø | (ئـ/د) ە | یـ | سووتێنـ | ێ | Ø |

تەنیا جیـاوازی لـە نـێوان ئـەم ڕەگـە لـە ڕابـوردوو ڕانـەبوردوو، گـۆڕانی مـۆرفیمی کاتەکەیە لە ڕابوردوو بۆ داهاتوو، کە لەم بارەدا ڕۆڵی کات ناگێڕن، چـونکە نـوونی چاوگیان بە دوادا هاتووە و ئەمەش چونکە نوونی چاوگ نوونێکی کۆی بـێ لایەنـە و ناگەڕێتەوە بۆ هیچ توخمێك.

**((پەراوێزەکانی بەشی دووەم))**

(١) ئەگەرچی لە هەندێ سەرچاوەی وەك (سینتاکسی ڕستەی تێکەڵ، د. کوردستان موکریانی، لاپەڕە — ٤٥ —)دا ئەم جۆرە ڕستەیە بە تێکەڵ دانراوە، بەڵام ئەم جۆرە ڕستانە لێکدراون و تێکەڵ نین، چونکە:

١– دەتوانرێ، بە لای کەمەوە یەکێ لە ئامرازە لێکدەرەکان لابدرێ:

(ئەگەرچی) هۆنراو زیرەکە، (بەڵام) ناخوێنێ.

ئەگەرچی هۆنراو زیرەکە، ناخوێنێ.

هۆنراو زیرەکە بەڵام ناخوێنێ.

٢– هیچ ڕستەیەك وەسفی بەشێکی ڕستەکەی تر ناکا و لە بنەڕەتدا ڕستە سادەکان بەم شێوەیەن:

هۆنراو زیرەکە.

هۆنراو ناخوێنێ.

(٢) لە ڕێزمانی دێریندا هەڵەیەکی باو کراوە، ئەویش داننان بە بوونی پاڕستەی ناوی. واتە" پاڕستە ڕۆڵی ناوێکی شاڕستە دەگێڕێ، ئینجا ناوەکە بکەر بێ یان بەرکار. پاڕستەکانیش ناونراون بە (پاڕستەی جێگری بکەر) یان (پاڕستەی جێگری بەرکار)، وەك: ﴿ پاڕستەی ناوی ئەو پاڕستانەن، کە جێگەی ناوێك لە شاڕستەدا دەگرنەوە، ئەو ناوانەش کە دەشێ، ئەم جۆرە پاڕستەیە جێگەیان بگرێتەوە، یان (بکەر)ن یان (بەرکار)ن، کەواتە پاڕستەی ناوی دوو جۆرە:—

پاڕستەی جێگری بکەر:—

١– ئاشکرایە، (کە) ئیمپریالیزم دژی ئازادیی گەلانە.

٢– دیارە، (کە) هەرێم ئەمساڵ دەردەچێت.

پاڕستەی جێگری بەرکار:—

١– وتم، (کە) توخنی بێگانە مەکەون.

٢– ناتوانم، (کە) ئەم کارە بکەم. ﴾(عەبدوڵڵا–٨١).

لە ڕاستیدا ئەم پاڕستانە جێگەی هیچ ناوێك لە شاڕستەدا ناگرنەوە، بەڵکو هەموویان بەرکارە دەرنەکەوتووەکەی شاڕستە ( کە کەسی سێیەمی تاکە و

ڕاناوەکەی سفرە) ڕوون دەکەنەوە و دەری دەخەن. شارستەکان بەم شێوەیە شی دەکرێنەوە:

| شارستە | فریزی ناوی | ناوبڕ | ڕەگی (بوون) | مۆرفیمی ئێستا | ڕاناوی ك٣تاك |
|---|---|---|---|---|---|
| ئاشکرایە | ئاشکرا | یـ | Ø | ـە | Ø |
| دیارە | دیار | | Ø | ـە | Ø |

لێرەدا پاسەکە بووەتە دیارخەر بۆ ڕاناوە سفرەکەی کەسی سێیەمی تاك.

هەروەها لە ڕستەی ﴿ وتم، (کە) توخنی بێگانە مەکەون.﴾دا شارستەی (وتم،) بەم شێوەیەیە:

وتم = (و) ڕەگی کار + (ت) مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو +Ø ڕاناوی ك٣تاك بەرکار + (م) ڕاناوی بکەر.

دیسان لێرەدا پارستەکە بەرکارە سفرەکەی کەسی سێیەمی تاکی ڕوون کردۆتەوە، کە چی وتووە؟ و بووەتە دیارخەری بەرکار.

هەروەها لە ڕستەی ﴿ناتوانم، (کە) ئەم کارە بکەم ﴾دا شارستەی (ناتوانم) بەم شێوەیەیە:

ناتوانم = (نا) ئامرازی نەرێیە + (ی)ی ڕاناوی بەرکار سواوە + (توان) ڕەگی کار + (ێ)ی مۆرفیمی کاتی داهاتوو دەرنەکەوتووە + (م) ڕاناوی بکەر.

لێرەشدا پارستە بەرکاری شارستەی ڕوون کردۆتەوە، کە ئەو شتەی ناتوانێ بیکا چییە؟.

## ((پەراوێزەکانی بەشی سێیەم))

(١) شایانی باسە، کە زمانی کوردی زمانێکی زۆر زۆر پاکە لە زاراوەکانی جنێودان و هیچ جنێوێکی ڕەسەن و یەك وشەی سادەی تیادا نییە. ئەمەش بەڵگەی ڕەوشت بەرزی کۆمەڵگای کوردەواری دەگەیێنێ، هەروەك پێش ئیسلامیش پەیڕەویکردنی فەرموودەکانی زەردەشت (وتەی باش، ڕەوشتی باش، کردەوەی باش) ڕەفتار و ڕێسای کوردەواری بووە.

ئەو جنێوە باوانەی لە کوردیدا هەن، بە هۆی ئامرازێکی ناکردن یان هەر ئامرازێکی تر کە واتای لادان و نێگەتیڤ بگەیێنێ، وەك:

ئاوەڵناوی (بەد – Bad ) لە زاراوەکانی: بەدکار، بەدڕەوشت، بەدڕەفتار، بەدخوو .....

ئامرازی (بێ): بێئابڕوو، بێڕێز، بێبەزەیی، بێهۆش .....

ئامرازی (نا): ناپەسەند، ناڕەسەن، نامەرد، ناپیاو، ناشیرین ......

ئەم جنێوانەش هیچیان سادە نین و هەموویان ناسادەن، بەڵام جنێوە سادەکان هەموویان لە عەرەبی یان تورکی وەرگیراون.

(٢) ئایا (سوێند خواردن) و (تەڵاق خواردن) و (پەیمان دان) و (بەڵێن دان) چاوگی تێپەڕن یا تێنەپەڕ؟

ئەگەر بەراوردی ئەم ڕستانە بکەین:

| ڕستەی تێنەپەڕ | ڕستەی تێپەڕ | ڕستەی ڕاپەڕاندن |
|---|---|---|
| زۆر ڕۆیشتم | زۆر نانم خوارد | زۆر سوێندم خوارد |
| زۆر گەڕام | زۆر خواردنم خوارد | زۆر تەڵاقم خوارد |
| زۆر دانیشتØ | زۆر پارەی دا | زۆر بەڵێنم دا |
| زۆر وەستاØ | زۆر مووچەی دا | زۆر پەیمانم دا |

لە تێپەڕدا دەتوانرێ، بەرکار بسوێ و ڕاناوی لکاوی خاوەنی بچێتە سەر (زۆر)، واتە" (زۆر) ڕۆڵی بەرکار ببینێ: زۆرم خوارد، زۆری دا .....، بەڵام لە تێنەپەڕ و ڕاپەڕاندن ئەمە ناکرێ.

## (ســــــەرچاوەکان)

[١] محمد معروف فتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٠ز.

[٢] عەبدوللا حوسـێن ڕەسول، ناکردن لە کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشـی کـوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سـەلاحەددین، ١٩٩١ز.

[٣] عەبدوللا حوســێن ڕەسـول{ب}، مۆرفیمـە ڕێـزمانییەکانی کـار، نامـەی دکتـۆرا، بەشی کوردی، کۆلێجی پەروەردە، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٥ز.

[٤] وریا عومـەر ئـەمین، ئاسـۆیەکی تـری زمانـەوانی، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤ز.

[٥] کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕسـتەی سـادە لـە زمـانی کـوردی دا، دەزگـای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ١٩٨٦ ز.

[٦] قـیس کاکـل توفیـق، جۆرەکـانی ڕسـتە و تیـۆری کـردە قـسەییەکان، نامـەی ماجستێر، بەشی کوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٥ز.

[٧] کوردستان موکریانی{ب}، سینتاکسی ڕستەی سـادە کـوردی، ، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠ز.

[٨] عەبـدولوەهاب خالـد موسـا، ڕێـزمانی (بـوون و هــەبوون) لـە کوردیـدا، نامـەی ماجستێر، بەشی کوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین–هەولێر، ٢٠٠٠ز.

[٩] سعید صدقی، مختصر صرف و نحوی کوردی، جزء ١، طبع اول، بغداد، ١٩٢٨م.

[١٠] یوسف شریف سعید، دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆر و هەنـدێ لایـەنی ڕستەسـازی کوردی، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکـۆی ســەلاحەددین، ١٩٩٠ز.

[١١] ڕەفیق محەمەد محـێدین شـوانی، ئـامرازی بەسـتنەوە لـە زمـانی کوردیـدا، نامـەی دکتۆرا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

[١٢] Randolph Quirk & Sidney Greenbaum, A University Grammar Of English, Longman Group Limited, England, 1983.

[١٣] د. کوردسـتان موکریـانی{ج}، سینتاکسی ڕسـتەی تـێکەڵ، ، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤ز.

[١٤] F. S. Scott, C. C. Bowley, C. S. Brockett, J. G. Brown, P. R. Goddard, English Grammar, A Linguistic Study of its Classes and Structures, London, 1978.

[١٥] أبوبکر عمر قادر، پرسیار لە زمانی کـوردی دا، نامـەی ماجسـتێر، بەشـی کـوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سـەلاحەددین، ١٩٩٣ز.

[١٦] ئازاد ڕەمەزان عەلی، لە یاساکانی داڕشتنی ڕستەی مەرجی زمانی کوردی، نامـەی ماجستێر، بەشی کوردی، کۆلێجی پەروەردە، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٩ز.

# لە پەراوێزی دوو قەسیدەی (سالم)دا
## ( تێکست و لێکۆڵینەوە )

د. عوسمان دەشتی
بەشی کوردی / فەکەڵتی زانستە مرۆڤایەتییەکان و پەروەردە
زانکۆی کۆیە

### پێشەکی

دیـوانی شـیعری کلاسـیکی کـوردی، لـە سـۆنگەی هەلومـەرجی. سیاسـی و مێژوویی گەلی کورددا، لەبارودۆخێکی باشدا نەبووەو نییـە. تـا ئێـستاشی لەگەڵدا بێت، دیوانی شیعرو شاعیرانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی بە تەواوی و بـە دروسـتی چاپ و بڵاو نەکراونەتەوە، ئەوانەشی کە چـاپ و بـڵاو کراونەتـەوە، یـا ئـەوەتا بـە تەواوی و بەڕاستی و بە دروستی ساغ نەکراونەتەوە، یا ئەوەتا بە شێوەیەکی وردو زانستی توێژینەوەیان بۆ نەکراوە. بە کورتی کەم وا هەیە دیوانی شـاعیرێکی کـۆن و کلاسیکیمان لەبەر دەستدا بێ، کە لە هەڵەو پەڵە و کەموکورتی بە دوور بێت.

بەم دواییە کتێبێکی مامۆستا محەمـەد عـەلی قـەرەداغی لـە ژێـر سـەرناوی: ((بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سـالم ـــ چـەپکێك شـیعری بڵاونـەکراوەی سـالم ـ پاشکۆیەکی دیوانی نالی)) چاپ و بڵاوکراوەتەوە[1]. لـە سـەرەتادا پێویـستە ئـەوە بگوترێت کە مامۆستا وەکو دابی هەمیشەیی بە شوێن سـۆراغی چـەند کەشـکۆڵ و دەستنووسێکی دێـرین و دانسقەدا چـووە، سـەبارەت بـە چـەند لایـەنێکی ژیـان و بەرهـــەمی شـــیعری یـــەکێك لـــە نـــاودارانی شـــیعری کلاســـیکیمان کـــە ئـــەویش ((عەبدولڕەحمان بـەگی (سـالم)ی سـاحێبقڕانە))، راسـتییەکەی ئەوەیـە مامۆسـتا قـــەرەداغی مـــاوەی نیـــو ســـەدە زیـــاترە فەرهادانـــە تێدەکۆشـــێت لـــە پێنـــاوی زیندووکردنەوەی دەستنووسە کۆنە کوردییەکان و ساغکردنەوەی مێژووی زانایانی کوردو بووژاندنەوەی بیروبەرهەمی کەلەپوورو ڕۆشنبیری گـشتی کـۆنی کوردیمـان،

لەم مەیدانەدا جێ دەستی مامۆستا دیارەو ئاشکراو، بەرهەمەکانیشی شوێنی شیاوی خۆیان گرتوەو کتێبخانەی کوردییان ئاوەدان کردۆتەوە. لەم تەقەللایەی دواییشدا بە گوێرەی ئەو دەستخەتانەی لەبەر دەستی بوون، پەردەی لە ڕووی کۆمەڵێك بەرهەمی تازەو بڵاونەکراوەی (سالم) هەڵداوەتەوە و خوێنەدەوارانی کوردی پێ ئاشنا کردوون.

سەبارەت بە مێژووی ئەدەب، ئێمە ئەو هەواڵ و زانیارییانەی کە لە مەڕ مێژووی ژیان و بەرهەمی ئەدەبیی زانایان و شاعیرانی پێشووماندا، لەبەر دەستدان و تا ڕادەیەك ساغ کراونەتەوە، پێویستە بە دروست و جێ متمانەیان بزانین تا ئەو ساتەی زانیاری وردو ڕاست و دروستی دیکەمان لەسەرچاوەی بەڵگەدارەوە دەکەوێتە دەست، ئەوسا لەڕێگەی بەراوردو هەڵسەنگاندنی زانستییەوە دەتواندرێت باوەڕو قەناعەتی تازە بە دەست بهێندرێت و لە مێژووی ئەدەبدا جێگیر بکرێت. ئەنجا لەم ڕێگایەدا کۆسپ و گرفتی زۆرمان دێتە ڕێگا، کە لە پێشەوەیاندا ئەوە دەبێت: ئاخۆ تا چەند دەبێت پشت بەو بەڵگەو سەنەدو دەستخەتانە ببەسترێت کە لەکەلێن و قوژبنی ئەرشیفخانە و کتێبخانەکاندا دەستمان دەکەون، ئایا هەر پەڕە کۆنەی بەیازو کەشکۆڵ و دەستنووسێك کە شتێکی تازەو نوێ ڕادەگەیەنێ، دەبێ دەستبەجێ و بێ چەندو چوون بەڕاست و بە دروستیان بزانین و کاڵای حەقیقەتیان بەباڵادا ببڕین؟. ئەنجا تەلارو دیواری تازەیان لەسەر هەڵبچنین و شتی تازەو نوێیان لەسەر بینا بکەین؟ یا ئەوەتا لە ڕێگەی بەراوردو کۆڵینەوە و تۆژینەوەی وردو زانستییەوە لە سەنگی مەحەکیان بدەین و ئەنجا لە تۆماری مێژوودا بەنەوەکانی بناسێنین.

بە هەر حاڵ ئەوە بابەت و مەبەستی باسەکەی ئێمە نییە، ڕاستیش ئەوەیە کە لە کتێبی ناوبراودا هەڵوەستە لەسەر دوو قەسیدەی ناوداری (سالم)دا کراوە، یەکێکیان ئەو قەسیدەیەیە کەوا (سالم)لە موژدەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشای باباندا هۆنیویەتەوە، دووەمیش ئەوەیە کە لە بارەی پەرێشانی بابانەکانەوە لە دوای ڕووخانی میرنشین گوتراوە، کە لە کتێبەکەی مامۆستاداو بە گوێرەی دەستنووسێکی بەردەستی بەهی (نالی) لەقەڵەم دراوە. لەم ماوەیەدا لە هەوڵی ئەوەدا دەبین کە بەوردی لەسەر ئەم دوو تێکستە و بە تایبەتیش ئەوەی دووەمیان هەڵوەستە بکەین، کە تاڕادەیەکی زۆر بوونەتە جێگای گەنگەشەو گفتوگۆ.

## تەوەری یەکەم/ سالم و کورتەیەکی ژیاننامەکەی:

سالم ناوی عەبدلرەحمان کوڕی محەمەد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە، بنەماڵەی ساحێبقرانەکانی سلێمانی لەم ئەحمەد بەگەوە دەست پێ دەکات کە بە ئەحمەد بەگی گەورە ناسراوە.[٢] بەگوێرەی مامۆستا حەمەبۆر ئەم ئەحمەد بەگە لەسەر خواست و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خالید پاشادا، کە لە نێوان (١٧٤٧ تا ١٧٦٣) فەرمانڕەوای بابان بووە، لە ناوچەی سنەی ئەردەڵانەوە دەگوێزێتەوە بۆ قەلاچوالان کە لەو ڕۆژگارەدا پایتەختی بابانەکان بووە.[٣]

ئەحمەد بەگ دوو کوڕی هەبووە:

١- محەمەد بەگی (قەرەجەهەنەمی)، کە باوکی سالمە.

٢- مەحموود بەگ کە باوکی مستەفا بەگی (کوردی)یە.

ئەم بنەماڵەیە لە بنەڕەتدا خەڵکی دێی (قەرەجەهەنەم)ی نزیك شاری سنە بوون بۆیە محەمەد بەگ لە سلێمانیش هەر بە (قەرەجەهەنەمی) ناودار بووە، ئەو نازناوی (ساحێبقڕان)یەش لە سەردەمی بابانەکاندا بە باڵایاندا بڕاوە.[٤]

لەگەڵ دامەزراندنی شاری سلێمانی ئەوان دەبن بەدانیشتووی پایتەختی تازە. دیارە بنەماڵەیەکی دەسترۆیشتوو بوون و هەمیشە لە دەسەڵات و لە بابانەکان نزیك بوون، لە پێشانا ئەحمەد بەگ و دوای ئەویش مەحموود بەگی کوڕی (کە باوکی مستەفا بەگی کوردی و مامی سالمە)، سەردەمێك سوپا سالار و وەزیری جەنگی میرنشینی بابان بوون.

سەبارەت بە مێژووی هاتنە دنیا و کۆچکردنی سالم نووسەران و مێژوو نووسانی کورد لە وێنەی (ئەمین زەکی بەگ، ڕەفیق حیلمی، علاءالدین سجادی...) هاوڕا نەبوون، دیارە ئێستا ڕای دروست ئەوەیە کە لە مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەداردا جێگر کراوە.(٥) بەم پێیە سالم لە ساڵی (١٨٠٥)ی زاینی لە سلێمانی هاتۆتە دنیاو هەر لەوێش خوێندەواری سەرەتایی و بەرزی لە حوجرەی مزگەوت و لە زانستەکانی ئیسلامەتیدا پەیدا کردووە، سالم لەگەڵ ئەوەشدا کە خوێندنی تەواو نەکردووەو نەبووە بە مەلا ڕەنگە پێویستی پێی نەبووبێت، بەڵام ئەو دابڕانەی لە خوێندن نەبۆتە کۆسپ لەبەردەم ئەوەی کەوا وەکو کەڵە خوێندەوارو ڕووناکبیرێکی هەڵکەوتە لە ڕۆژگاری خۆیدا دەربکەوێت.

**أ/ شاعیرێتی سالم :ـ**

سالم بە پێی بەرهەم و هۆنرەواکانی، دەبێ شارەزایی تەواوی لە بواری زانستە جۆر بە جۆرەکانی، وەکو ئایین و ئەدەبیات و شەریعەت و فەلەکناسی و مێژوو و باری ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی هەبووبێت. لەوە دەچێت هەر چوار زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی زانیبێت، کاریگەر بوونی بە زمان و شیعرو ئەدەبیاتی فارسی بە ناوەرۆك و روخساری بەرهەمە شیعرییەکانییەوە روون و ئاشکران. لە ناو شاعیرانی فارسدا شەیدای شیعرو بەرهەمی کەلیمی هەمەدانی و حافزی شیرازی بووە و گەڵێ جار لە هۆنراوەکانیدا ناوی هێناون، کۆمەڵێك شیعری تێهەڵکێشی لەسەر شیعری حافزدا هۆنیوەتەوە. لە پارچەیەکی چەند بەیتیدا سەر ڕشتەی هونەرمەندانی شیعری کوردی لە سەردەمی بابانەکانا تۆمار کردووە:

**لە یەك لا (نالی و مەشوی) لەلایێ (سالم و وردی)**
**لە هەنگامەی هونەر گەرمی تکا جۆ بوون لە (مەولانا)**
**لە مەیدانی بەلاغەتدا بەسواری مەرکەبی مەزموون**
**بە کوردی هەریەکە تازی سوارێ بوون لە بابانا**

دیوان:٣٥

شانازی بە خۆی و بە شیعری کوردی و بەکوردستانەکەیەوە کردووە:

**زیڕە سەرمایەیە بۆ (سالم)و کرمانی دەبا**
**شیعری کوردی کە بدا جیلوە لەلای شێخی کەبیر**

دیوان:٦٩

**مەهی فارس زەبانەم گوفت سالم شەرحی حاڵت گۆ**
**وتم جانا بەڵەد نیم ئیستیلاحی ئێوە من کوردم**

دیوان:٨٢

**ڕەنگینە هەموو شیعرم وەك نەقشیی تەکەڵتوی زین**
**مەزموون کەشە فیکرم وەك قولاپی دروومانت**

دیوان:٥٠

لە ناو شاعیرانی کوردا نالی و مەولانا خالیدی شارەزووری بە مامۆستای خۆی زانیوە و پێنج خشتەکی لەسەر شیعری ئەوان هۆنیوەتەوە، بەمە سالم بووە بە یەکەمین شاعیری کورد کە هونەری پێنج خشتەکی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا داهێناوە،[٦] سالم یەکەمین شاعیریشە کە پێنج خشتەکی لەسەر شیعری نالی دامەزراندووە، کە دواتر ئەمە لای زۆربەی شاعیرانی کورد لە بەرەکانی پاشتر وەکو دابێکی لێ هاتووە و دووبارە کراوەتەوە.

سالم شیعری مولەمەعی فارسی زۆرن، هەندێك لە مولەمەعەکانی لەسەر شیعری حافزدا هۆنیوەتەوە، لەمانە هەمووی گرینگتر ئەوەیە کە سالم شاعیر و شاسواری غەزەلخوێن و غەزەلنووسی کوردی یەکەمینە لە مێژووی ئەدەب و دیوانی شیعری کلاسیکی کوردیدا، غەزەلەکانی زۆر ڕەوان و پاراو و سوارو ئاوازە دارن، لەگەڵ ئەوەشدا کە وشە و تەعبیراتی بێگانەی تێ کەوتووە:

**بەسەر گوڵدا لە شانەت گوڵ دەبارێ**
**قەزا بۆ دڵ لەسەر سونبول دەبارێ**

**چراغێ ڕوو بەڕووی حوسنت بسووتێ**
**بەدوودی ئەو لە هەورا گوڵ دەبارێ**

**بەرێ با گەر غوباری کوشتەیی ڕووت**
**بەسەر باغی سەحەر بولبول دەبارێ**

**لە دڵتا ناڕوێ تۆوی موحیبەت**
**لە چاوم ئەشکی بێ حاسڵ دەبارێ**

دیوان: ١٤٤

لەگەڵ ئەوەشدا کە کتێبخانەی کوردیمان تا ئێستا خاوەنی دیوانێکی تەواو و ڕێك و زانستیی سالم نییە، بەڵام هەر چاوگێڕانێکی خێرا بە دیوانەکەی چاپی هەولێردا ئەم ئامارانەمان بۆ پشتڕاست دەکەنەوە:

(٢٠٤) پارچە غەزەلی جۆربەجۆر کە کۆیان (١٥٠٦) دێڕە هۆنراوە یە.
(١٠) قەسیدەی کورت و درێژ کە سەرجەمیان ( ٢٧٥) دێڕە

(٢) پارچە پێنج خشتەکی کە یەکێکیان لەسەر شیعرێکی نالی و ئەوەکەی تریش لەسەر شیعرێکی مەولانایە، ئەنجا بە گوێرەی ئەم ئامارە دیوانی سالم سەرجەمی بریتی دەبێ لە لە (١٨٢٩) دێڕە هۆنراوە، دڵنیاشین کە ئەمە کۆی بەرهەمە شیعرییەکانی نییە ئەنجا چ جای شیعرە فارسییەکانی.(٧)

سالم لە سلێمانی هاتۆتە دنیاو هەر لەوێش خوێندوویەتی و پێگەیشتووە. بنەماڵەکەی ئەوان لە سایەی دەسەڵات و لە پاڵ بابانەکاندا خاوەن پلە و پایەو دەستڕۆیشتوو بوون. لە هۆنراوەکانیدا ئەوە بەدی دەکرێت کە وڵاتەکەی خۆی زۆر خۆش ویستووەو بە دڵ و بە دەروون عاشقی بووە، بەڵام لەلایەك بە هۆی باری نالەباری ناو میرنشینەکەو دوو بەرەکی بەردەوامی بابانەکان لە ناو خۆیانداو، لە لایێکی دیکە بە هۆی ئەوەی بەشێکی خانەوادەکەیان لە ئێران بوون، سالم بەناچاری دووچاری کۆچ و ڕەو و دوورکەوتنەوە لە وڵات هاتووە کە ئەمە زۆر ئازاری پێگەیاندووە، ڕۆژگارێك بە ناچاری و بە نا بەدڵی پشتی لە شارەکەی کردووەو بۆ ئێران سەری هەڵگرتووە. ماوەیێك لە سنە گیرساوەتەوەو لەویش هەر ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە، ماوەیێکیش ڕەهەندەی تاران و دەشتی ڕەی بووە. ئەمانە بەڕوونی لە هۆنراوەکانیدا بەدی دەکرێن:

**ئەلویداع ئەی موڵکی بابان ئەلویداع**
**ئەلویداع ئەی جانی جانان ئەلویداع**
**موستدعیدم بۆ بیلادی رافیزی!**
**ئەلویداع ئەی ئەهلی ئیمان ئەلویداع**
**وەك ئەسیری تورکمەن دەمبەن بەزۆر**
**ئەلویداع ئەی شاهی خوبان ئەلویداع**

دیوان:٧٤

* * *

**بەبێ ڕووی تۆ فەزای باغی سەنەندوج**
**لەناو دڵما وەکو ناری سەقەر بوو**

دیوان:١١٠

* * *

**دەلێــێ فیردەوســە گــوڵزاری ســەنەندوج**
**وەڵێ بــــێ تــۆ لەلای من وەك دەرەك بوو**

دیوان:١١٠

* * *

**چ بڵــێم حاڵــەتی دڵ چــۆنە لــە هــەجرا ســالم**
**سەحنی گوڵزاری سەنەندوج وەکو زیندانی منە**

دیوان:١٣١

**پێ دەچێ بە هۆی لایەنگیری بنەماڵەکەیان بۆ یــەکێك لــە باڵــەکانی ململانێــی نێــو بابانــەکان دووچاری ئاوارەیی و گێر خواردن بــووبێت لە**

تاران، بۆیە زۆر بێزاری لەم بارەوە دەربڕیوە:

**شــۆڕەزاری خــاکی (ڕەی) ئــەمجارە دامەنگیرمــە**
**ڕوو لــە هــەر وادی دەکــەم خــاری وەکــو زنجیرمــە**

**ئیبتیدا بۆ ڕەی کە هاتم فیکری عەقلیم لێ نەکرد**
**حەپســـی تارانم گـــوناهی کـــاری بێ تەدبیرمە**

دیوان: ١٢٨

* * *

**لەگــەڵ دڵ شــەرتە ســالم گــەر نــەجاتم بــێ لــە تارانــا**
**بەهەشت گەر بێتە دەشتی (ڕەی) بەتارانا گوزەر ناکەم**

دیوان: ٨٥

* * *

**خۆزگــە دەمزانـــی لــە تارانــا نــەجاتم کــەی دەبــێ**
**کۆیـــی یـــــارە مەشهەدم یــا مەدفەنم هەر (ڕەی) دەبێ**

دیوان: ١٤١

دەسەڵاتی عوسمانی ڕۆژگارێکیش بۆ خوارووی عێراق و بۆ شاری (حیللـە) دووری خستۆتەوە، وا دیارە لەوێش هەر بە دادو گلەیی بووە:

**حــەسرەتــا دڵ غافڵە نازانی قیسمەت چی دەکــا**
**ئەمڕۆ ئێرەم بوو بە مەسکەن ئاخۆ فەردا کوێم دەبا**
**شاطری تەقدیر کە پێشکەوت ڕائەکێشێ و تۆ دەڕۆی**
**کــاتێ دەیزانی ئــەوا خستووتیە نێو دامی بــەڵا**

دیوان: ٤١

**ب/ سالم و بابانەکان:**

له ناو میرو پادشاکانی باباندا سالم هاوچەرخی مەحمود پاشا، سلێمان پاشا، برایان" ئەحمەد پاشاو عەبدوڵڵا پاشا بووە، ئەنجا لە نێو کۆنگەرەی ململانێکانیش دابووە، بەڵام لە هۆنراوەکانی شتێك لە لایەنگیری بۆ باڵێك و دژایەتی باڵێکی دیکە بـەدی ناکرێـت، تـەنها ئەوەنـەبێت کـە ئـەو خۆشەویستی و دڵسۆزی تـەواوی بـۆ وڵاتەکەی و بۆ بابانەکان هەبووە، شمشێری ڕەخنەو نەفرەتیشی لە ڕووی هـەردوو زلهێـزی داگیرکـاری ڕۆم و عەجـەم هەڵکێـشاوە، ئـەو لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ کەسایەتییەکان و ڕووداو و هەلومەرجی مێـژوویی و سیاسـی میرنـشینەکەدا چـەند قەسیدەیەکی شاکاری هۆنیوەتەوە، کەوا یەکێتییەکی پتـەو و ئۆرگانیـك لـە بـاری فۆرم و ناوەرۆکەوە لە نێوانیاندا هەیە، لەم قەسیدانەدا سالم وەکو شاعیرێکی بـاڵا دەستی شیعری داستانی قارەمانی و چیرۆکی مێژوویی و سوار چاکی، گەیـشتۆتە پلەیـەکی بـەرز لـە توانـا و داهێنـانی شـیعری، هـەر ئەمەشـە کـە لـە پاشـان بۆتـە سەرامەدێکیش بۆ شیعری سیاسی و نیشتمانی لـە قوتابخانـەی شـیعری کرمـانجی ناوەڕاست، قەسیدەکانی لەگەڵ ئەوەدا کە بە زمـان و شـێوازێکی سـەخت و ئـاڵۆز هۆنراونەتـەوە بـەڵام کاتێـك خوێنـدەواری کارامـەو شـارەزا لەگـەڵ بـیرو سـەبك و شێوازەکەی ڕادێت، ئیدی کلیلـەکانی تێگەیـشتنی دەکەوێتـە دەسـت و دەتوانێـت بەهرەو چێژی زۆریان لێ وەربگرێت.

وەکـو گـوترا قەسـیدەکان پەیوەسـتن بـە مەسـەلەکانی ئـەو سـەردەمە بـە تایبەتیش جەنگ و شـەڕو شـۆڕو کارەسـات و نەهامەتییـەکان، لێـرەدا بـەگوێرەی

شوێن و بایەخی زۆری ئەو قەسیدانە لە مێژووی ئەدەبی کوریدا، لە خوارەوە ناساندنێکی خێرا بۆ هەریەکێکیان دەخەینە ڕوو:

١ـ **شین و لاواندنەوەی سەلیم بەگ:** قەسیدەیەکی (٤٥) بەیتییە، شینگێڕییە بۆ سەلیم بەگی شیوەکەل، تا ئێستا ئەو قەسیدەیە شتێکی لەبارە نەزاندراوەو لەگەڵ ئەوەدا کۆمەڵێك ناوو ناونیشان و وەسفی تیایە کە دەشێت لەم ڕێگەیەوە بۆ بۆنەی گوتنی تێکستەکە بچین.(٨)

٢ــ **شەڕی بابان و عوسمانییەکان:** قەسیدەیەکی درێژو ناوداری (٩٨) بەیتییە، چەند جارێك ساغ کراوەتەوە و شتی لەسەر نووسراوەو بڵاوکراوەتەوە، ناونیشانە ڕاستەکەی بەم جۆرەیە: (ذكر محاربه مير جليل الشأن عزيز بيگ بابان با طائفه رومى سنة (١٢٦٦/١٨٤٩)و تسخير ولايت بابان بدست رومى اسماعيل پاشا).(٩)

٣ــ **وەڵامناکەی سالم بۆ نالی:** ئەم تێکستە تیشکی زۆر خراوەتە سەرو لێکۆڵینەوەی بۆ کراوە، مامۆستا سەجادی بەرهەمێکی تایبەتی بۆ خستنە روو و لێکدانەوەی قەسیدەکەی نالی و وەڵامەکەی سالم تەرخان کردووە.(١٠)

٤– **لە ستایشی عەزیزبەگی باباندا:** تا ئێستا تەنها (١٦) بەیتی لێ بڵاوکراوەتەوە، لەوە دەچێ قەسیدەکە لەمە درێژتر بێت، سالم وەسفێکی نموونەیی سوارچاکی یەکێك لە قارەمانەکانی بابان دەکات بە ناوی (عەزیز بەگ)، دێڕی یەکەمی تێکستەکە ئەمەیە:

**دەکا دنیایی پڕ شۆڕش بە دایم فیتنەها پەیدا**
**بەنەیڕەنگ و فسوون هەردەم لە هەرسوویێ وەغا پەیدا**

تا دەڵێ:

**پەناهم شەهسوارێکە گوزەرکا گەر بە ئەلبورزا**
**دەکا نووکی سمی ئەسپی لە خارا توتیا پەیدا**

ئەنجا:

**لەدەریای مەعرەکەی تیغی نەهەنگی گەر نمایان بێ**
**لە ناو ئۆردویی تورکانا دەبێ شین و سەدا پەیدا**

دیوان:١٨٠

**٥- مژدەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشای بابان.**

**٦- لە باسی پەرێشانی نۆکەرانی باباندا:** لە بەشەکانی داهاتوودا بە درێژی لەسەر ئەم دوو قەسیدەیە دەوەستین.

سالم ئامۆزای مستەفا بەگی کوردی بووە، هەر ئەم بنەماڵەیە، چەند زاناو پیاوی ناوداری دیکەیان لێ هەڵکەوتووە، کە یەکێکیان (ئەحمەد فەتاح بەگی ساحێبقڕان ـ حەمدی ١٨٧٥ ـ ١٩٣٦) شاعیرە.

سالم هەر لە سلێمانیداو لەساڵی (١٨٦٩) دا کۆچی دوایی کردووە، مەزاری گۆڕەکەی لە گردی سەیوانە، بەم جۆرە بنەماڵەی ساحێبقڕان سێ کەڵە شاعیریان پێشکەش بە مێژووی ئەدەب کردووەو بەمە دیوانی شیعری کلاسیکی کوردییان ئاوەدان کردۆتەوە.[١١]

**٢ـ تەوەری دووەم/ قەسیدەی یەکەم: مژدەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشا**

**أ- <u>چەند سەرنجێك:</u>**

١- ئەم قەسیدەیە د. کەمال فؤاد دۆزیویەتەوە و هەر ئەویش بۆ یەکەم جار، بە پشت بەستن بە دوو دەستخەنی کۆن، لە دوای ساغکردنەوەو لێکدانەوەی هەندێ لە وشە گرانەکانی لە گۆڤاری (چریکەی کوردستان)دا بڵاوی کردۆتەوە.[١٢]

لە دەستخەتی یەکەمدا ناونیشانی قەسیدەکە بەم جۆرەیە: (در ذکر آمدن عبدالله پاشای بابان از دربار همیون بسوی عیراق و روم و نظم سەرحدات بین روم و ایران از گفتە سالم). واتە (لە باسو خواسی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشای بابان لە دەربـاری هەمایۆنەوە بەرەو عێراق و ڕۆم، بە مەبەستی ڕێکخستنەوەی سنوورەکانی نێوان ڕۆم و ئێران). لە دەستخەتی دووەمدا ناونیشانەکە بەم جۆرەیە: (تهنئة مرخص شدن عبدالله پاشای بابان از قسطنطین و آمدنش به عراق بغداد)، واتە (پیرۆزبایی ڕێگەپێدرانی عەبدوڵڵا پاشای بابان و گەڕانەوەی لە قوستەتینیەوە بۆ عراق و بەغداد).

٢- تێکستی تەواوی قەسیدەکە بۆ جاری دووەم و بە پشتبەستن بەلێکۆڵینەوەو روونکردنەوەکانی د. کەمال فؤاد. لە (میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا) بڵاوکراوەتەوە.[١٣]

٣– کاتێك ئێمە خوێندکاری خوێندنی باڵا ـ ماجستێر ـ بووین، لە بابەتی کورسی ئەدەبی کۆن و کلاسیکی، بە دوورو درێژی لەسەر ئەم قەسیدەیەی سالم وەستاوین و بە شەرح و پەراوێزو لێکدانەوەوە خوێندوومانە.[١٤]

٤– کام عەبدوڵلا پاشا؟!

لە پەنجا ساڵی دوایی حوکمڕانی بابانەکان (١٨٠٠ ـ ١٨٥١) سەرچاوەکان باس لە دوو عەبدوڵلا پاشا دەکەن،[١٥] یەکەمیان عەبدوڵلا پاشای برای ئاوڕەحمان پاشای بابانە، کە هەمیشە لەگەڵ مەحموود پاشای برازایدا لە شەڕو ململانەیەکی سەخت و دژواردا بووە لەسەر دەسەلات،[١٦] ئەنجا لە ڕووداوێکدا کە مستەر ریچ بە درێژی باسی دەکات، لە دوای ئەوەی بۆ دوا جار خیانەت و ناپاکی عەبدوڵلا پاشا لە ئاست مەحموود پاشادا ئاشکرا دەبێ، مەحموود پاشا دەیگرێ و دەیخاتە نێو زیندانەوە، لێرەوەش سەربردەی ئەم عەبدوڵلا پاشایە کۆتایی دێت و سەرچاوەکان لە دوای (تەمووزی ١٨٢٠ )وە لە ئاست ئەم عەبدوڵلا پاشایە بێ دەنگ دەبن، لەوە دەچێت لە دوای زیندانی کردنی مردبێت.[١٧]

دووەمیان عەبدوڵلا پاشای کوڕی سلێمان پاشاو برای ئەحمەد پاشای دوامیری بابانەکانە، ئەمەشیان لەگەڵ ئەحمەد پاشای برایدا بێ غەل و غەش نەبووەو بە کلك گرێدان لەگەڵ والی بەغدا هەمیشە لە هەوڵی لە کارخستنی ئەحمەد پاشادا بووە، تا سەرەنجام والی ئەحمەد پاشا دەکێشێتەوە بۆ بەغدا و (عەبدوڵلا بەگی) برای لە ساڵی (١٨٤٢) دا جڵەوی دەسەلات بە دەستەوە دەگرێت و هەر لەم ساڵەداو لە شەڕێکی نا قۆڵادا لە قزڵجەو لە دەشتی مەریوان لەشکری رەزا قولی خانی والی سنە دەشکێنێ کە بۆ پشتیوانی مەحمود پاشا هاتبوون.[١٨]

دوای ئەم شەڕە دووبارە ئەحمەد پاشا دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر تەختی میرایەتی، ئەوسا عەبدوڵلا پاشا کە کەڵکەڵەی میرایەتی لەسەری دابوو، لە سلێمانی ڕادەکا و دەچێتە لای نەجیب پاشای والی بەغدا و دەبێت بە چاوساغی بۆ هێرشکردنە سەر ئەحمەد پاشا. دوای ئەوە ئەحمەد پاشا لە نزیك کۆیە دەشکێ و بە ناچاری بەماڵ و خێزان و دەستو پێوەندەکانییەوە بەرەو مەریوان دەکشێتەوە، والی بەغدا عەبدوڵلا بەگ بە پلەی پاشایەتی لە (١٨٤٨)دا بە حاکمی سلێمانی دادەمەزرێنێت.[١٩] ساڵی (١٨٤٩) نامیق پاشا دەبێتە والی بەغدا، بە دوای

عەبدوڵڵا پاشادا دەنێری و لای خۆی گلی دەداتەوە، لە جێگەکەیدا ئیسماعیل پاشای میسری دەکرێت بە موتەسەریفی سلێمانی و بەمەش کۆتایی بە میرایەتی بابان دێت.[٢٠] عەبدوڵڵا پاشا ماوەیەك لە بەغدا بە دەستبەسەری دەمێنێتەوە دواتر ڕەوانەی ئەستەمبۆڵ دەکرێت. لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی (قرم)دا لە نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٨٥٤)دا، ڕێگەی پێدەدرێت کە بگەڕێتەوە بەغدا، تا بێتەوە کوردستان و بە ناوی جیهادەوە لەشکر کۆ بکاتەوە بۆ پاراستنی سنوورەکانی عوسمانی، نەبادا ئێران کەلك لەم هەلە وەربگرێت و پەلاماری خاکی دەوڵەتی عوسمانی بدات لە ڕۆژهەلات. هەندێ لە بابانەکان بەگوێرەی ئەو دەنگۆیەی وا بڵاو دەبێتەوە، کە ئەو جارێکی دیکە دەبێتەوە بە حاکمی سلێمانی، هەر لە ڕێگادا خۆیانی دەگەیەننێ و دەچنەوە پاڵی، بەلام ئەم خەیاڵەیان پووچ دەردەچێ، ڕەشید پاشا گوێزلگلی (عەینەك لە چاو) والی بەغدا، لای خۆی گیری دەکاو لە پاشان دووبارە دەینێرێتەوە بۆ ئەستەمبۆڵ و ڕێگە نادات ئەم خەونەی بهێتەدی.[٢١]

سالم لەو ئان و ساتەدا لە سلێمانی دەبێت و هەواڵی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشای بەر گوێ دەکەوێت، ئەم قەسیدەیە وەکو نوقلانەیەك بۆ موژدەی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشا بۆ سەر موڵکی بابان دەهۆنێتەوە، لە کاتێکدا ڕۆژگار نەیهێشتووە هیوا گەورەکەی سالم بێتە دی.

ئەنجا مامۆستا قەرەداغی ئەم دوو عەبدوڵڵا پاشایەی لێ تێکەڵ بووە، یا ڕاستتر وایە لێی بوون بە یەك کەس، لە کاتێکدا حەقیقەت وایە کە نزیکەی دوو نەوە لە نێوان ئەم دوو عەبدوڵڵا پاشایەدا هەبووە، سەرچاوەکانی مێژووی میرنشینی بابان ئەم ڕاستییە نیشان دەدەن، بەلام دیارە مامۆستا وەکو خۆی دەڵێ، چنگی نەکەوتوون!، بۆیە لە مەلەسەی عەبدوڵڵا پاشاکاندا تووشی ئەم گرێ کوێرەیە بووە، کە بۆی چارەسەر نەکراوەو ناچار تێکەڵاوی کردوون.

ـ ناوی گوندو دێهات و ناوچەکانی قەڵـەمڕەوی میرنـشینی بابـان بـە چـڕی لـە هۆنراوەکانیدا بەدی دەکرێن.

ـ داب و دەستوور و ژیانی چینی خوارەوەی کۆمەڵگـەی بابـان، کاسـبکاران و پیــشەوەران و وەرزێــرو دێهــاتی و گوندنــشینەکان لــە قەســیدەکانیدا ڕەنــگ دەدەنەوە.

– ئـەنجا ڕێوڕەسـم و عەنعـەناتی پاشـایان و بنەماڵـەی حـوکمڕان و چـینی سەرەوەو دەسەڵاتداران، بە هەمان شێوە هۆنراوەکانیان تەژی کردووە، ئـەنجا بـا نموونـەکان تـەنها لـەم قەسـیدەیە بێنینـەوە کـە لـە قەسـیدەکانی هاوکوفیـشیدا دەیانبینین:

ـ لەم قەسیدەیە ناوی هۆزو ناوچەکانی وەکو (دەشتی شـارەزوور، هـەورامی، کورد، میری جافان، هەوشار، قۆپی، مەریوان)ی هێناوە، جگە لـە نـاوی دروسـتی (٢٣) گوندی بناری قەرەداغ و دۆڵی مێرگەپان و دەوروبەری سلێمانی، بەو پیـشەو کەسابەتەیشەوە کـە لـەو دێیانـەدا بـاون، ئـەنجا خـودی پیـشە و کەسـابەتەکانی خەڵکی دێهات: وەرزێری، شوانی، گاوانی، جۆچـێنی. لـە کاتێکدا نـالی لـە هـەموو دیوانەکەیدا تەنها چەند جارێك ناوی شارەزووری هێناوە، ئەویش بە تایبەت (خـاك و خــۆڵ) کــە شــوێنی لــە دایکبــوونی خــۆی بــووە.(٤٦) ئەمانــە هــەموو خــاڵی جیاکەرەوەن، نەك هەر لە نێوان دنیای سالم لەگەڵ نالی، بەڵکو لە وابەستە بـوونی پتەوی ئـەم قەسـیدەیەوە بـە جیهـانی سـالم و دوورکەوتنـەوەی لـە ئەندێـشەو لـە دنیای نالی.

خــاڵێکی دیکــەی تایبەتمەنــدو جیاکــەرەوەی جیهــانی ســالم ئەوەیــە، کــەوا هەمیــشە شمــشێری ڕق و ڕەخنــەی لــە ڕووی (ڕۆم و تــورك)دا هەڵکێــشاوە و بەڕاشکاوی لە دژیان دەدوێ و دەیان کوتێتەوە، ئەوەتا لە قەسـیدەکەی (جـەنگی عەزیز بەگی بابان و ڕۆمەکان)دا، (١٧) کەڕەت بەڕوون و ڕاشکاوی ناویان بـەزڕاوی دەهێنێ و نەفرەتیان لێ دەکات، لەم قەسیدەیەی جێ مەبەسـتی ئێمـەش لـە (١٠) شوێندا نەفرەت لە هەرچی (تورك، ئەتراك، ڕۆم، ڕۆملـی) هەیـە دەکـات و هێرشـی توندیان دەکاتە سەر، کەچی نالی لە هەموو دیوانەکەیدا ناوێکی لـەوان نـەهێناوە و ڕاشکاوانە ڕەخنەیەکی توندیشی ئاڕاستە نەکردوون.(٤٧)

ئیتر نازانم مامۆستا قەرەداغی بە چ هەقێك و بێ وردبوونەوە ئـەم قەسـیدەیە دەداتە پاڵ حەزرەتی نالی، ئاخۆ هەر لەبەر ئەوەی لە کۆنە لاپـەڕەی کەشـکۆڵێکدا شتێکی وا هاتووە و بەس!، ئاخۆ ئەمەند بەسە بۆ ئەوەی شاکارێکی ئـەدەبی کـە وەچەزادەی بێ غەل و غەشی یەکێکە بدرێتە پاڵ یەکێکی دیکە. ئەمـە هـەموو لـە پێنـاوی چەسـپاندنی حەقیقـەتێك و، ڕەوایـی بـە خـاوەن کردنـەوەی بەرهـەمێکی ئەدەبییـە و بـە قـەدەر تۆزقـاڵێکیش لـە شـان و شـکۆی حـەزرەتی نـالی (مـیری شاعیرانی کلاسیکی کورد لە کرمانجی ناوەڕاست) کەم ناکاتەوە.

لە سەرێکی دیکـەوە داسـتانە کۆنـەکانی قارەمـانی و سـوار چـاکی ئـەدەبی کـۆنی ڕۆژهەڵات، بە نموونەش چیرۆك و داستانەکانی شانامەی فیردەوسی و پاڵەوانەکانی وەکـو (پـووری دەسـتان، ڕۆسـتەم، سـام و نـەریمان، ئەفراسـیاب، کەیخوسـرەو، هـەفتخوان، رووبـین تـەن، پیـل ئەفگـەن، شـێرئەوژەن، سـیاوەش، ...) هەمیـشە وێردی سەر زمان و ناودێرە شیعرەکانی سالم بوون، هەر تـەنها لـەم قەسـیدەیەدا، ئەم نازناوە داستانییانەی هێناوەتەوە: (پاشایانی باب ئـۆغلی، شـێراو ژەن، پیـل ئەفگەن، قلب الاسد، رووبین تەن، سامی نەریمان، مەروان، گەرگین)، کـە بەڵگـەی حاشـا هەڵنـەگرن. بـۆ پەیوەسـتبوونی ئـەم قەسـیدەیە بـە جیهـانی سـالم و بـەو ئەندازەیەش لە دنیاو ئەندێشەی ئـەدەبی نالییـەوە دوورن. لـەلایێکی کـەوە سـالم بەوە ناسراوە کە هەمیشە گلەیی لە بەخت و لە ڕۆژگار کردووە و لە چـنگ جـەورو ستەمی (چەرخی چەپگەردش!) هاواری لێ هەڵستاوە. هەر سالم لە سـۆنگەی ئـەو شکستەی دووچاری عەزیز بەگ و لەشکری بابان هات لـە جـەنگی دژی داگیرکـەری تورکـا، دیـسان گلـەیی و سـکالاّ لـە چـنگ ڕۆژگـار دەکـات و ئـەم وشـەو زاراوانـە چـەندبارە لـە قەسـیدەکەیدا دوو پـات دەکاتـەوە: (فەلـەك، گـەردوون، ئاسمـان، دەهری دوون، گۆشەگیر، دەسـتەو ئـەژنۆ، ئـاگری نەگبـەت، ڕۆژگـار، هـەوری بـەد بەختی، بەردەباران، زولمەت، نالەو فوغان، بای موخـالیف، حەسـرەتا، ... تـاد). هەر لەم قەسیدەیەی مەبەستی ئێمەشا، کە باس لە پەرێشانی بابانـەکان دەکـات، هەمان فەرهەنگی وشەو زاراوەی ئامادەیە: (باری غەم، سـیەه بـەختان، بـێ دادی فەلەك، گرفتار، چەرخی دوونپەروەر، طولی ڕۆزگاران، پەرێشان خاطر، مـەجنوونی صەحرایی، جەوری چەرخی گەردوون، درێغا، حەسرەتا، دادا...). سالم لە وەسف

و ستایشی میرو پاشاکانی باباندا لە قەسیدەکەی جەنگی عەزیز بەگ، بەم گرێ وەسفیانە ناویان دەهێنێ:

- نەجیبانی ویلایەت.
- شێری بێشەی موڵکی بابان.
- میری بازیان.
- جانشینی سیلسیلە.
- شەهباز.

لەم قەسیدەیەی لە باسی پەرێشانی نۆکەرانی بابانیشدا، هەمان ڕەوت و ڕێباز، لە داتاشین و سازکردنی گرێی وەسفی تایبەت بە شێوازی خۆی بەمەستی هەڵنان و بەرز ڕاگرتنی شانوشکۆ، یان پەرێشانی و تەنگو چەڵەمەی میرو پاشاکانی بابان بەردەوام دەبێت بەم شێوەیە:

- سەخی تەبعانی حاتەمدڵ.
- پاشایانی باب ئۆغلی.
- سیەه بەختانی بێ دەوڵەت.
- حەیادارانی بێ حورمەت.
- هونەرمەندانی شێراوژەن.
- قەوی دەستانی پیل ئەفگەن.
- ملووکانی گەدا پەروەر.

ئەنجا هەر لە درێژەی پێکهاتەسازی ئەم گرێ وەسفیانەی کە سالم بۆ بابانەکانی ساز کردووە فەرهەنگێکی تایبەت پێکهاتووە کە فەرهەنگی پێکهاتەسازی خودی سالمە و لە داتاشین و داهێنانی خۆیەتی و مافی هیچ شاعیرێکی دیکەی بەسەرەوە نییەو نابیندرێت:

(جەوانانی سەهی قەد، تورمەپۆش و شەهدنۆش و ناز پەروەر، خانە بەردۆش، جێ نشیمەن، غوولی بیابان، کۆنەخەزپۆشان، چوماغ دەرکەف، ئاغایانی بێ بەش، وەکو ئەصحابی پێغەمبەر، سیەه بەختانی بێ دەوڵەت، ئەهلی زەنگان، گاگەل چەرێنی میری جافان، فەقیری موڵکی هەوشار، غەریبی شاری تاران، حەیادارانی بێ حورمەت، نەدیمانی قەدیمی، تەنپەروەری ناز، هیزەم فرۆشان، رووبین تەنی

عەهد، نیزامـانی مـولازم مەنـسەب، خیانـەت پیـشەگان، بـەڕووتی جوملـە گـاوانن، سوارەی خاصصی پاتەختی سلێمانی، نوطفەیی حەیز، جنسی شەیتان).

لێـرەداو لـە کۆتـایی هـەموو شـیکردنەوەکان کـە لـە دەوری زمـان و شـێوازو ئەندێشەو بیرو دەربڕین لە تێکستی ئەم قەسیدەیە دەخولێنەوە، بێ چەندو چوون و دوور لە هیچ چەشـنە گومانێـك ئـەو راسـتییە دەسـەلمێنن، کـە ئـەم قەسـیدەیە سەربە جیهانی بەرهەم و داهێنانی سالمە، بـە هـیچ پێوەرێـك ناشـێت بـە جیهـانی نالییەوە گرێ بدرێت، بام لـە کۆنـە دەستنووسێکیـشدا ئەمـە نووسـرابێت و تۆمـار کرابێت، وەکو دەستنووسـەکەی عـەلی ئەکبـەری سـنەیی کـە مامۆسـتا قـەرەداغی کاری لەسەر کردووە، چونکێ وەکو دیمان ئەم گۆتەیە لە ئاست سـەنگی مەحـەکی بەڵـگە و دەلیلە زانستی و بابەتییەکان خۆی ڕاناگرێت و پووچ دەردەچێت.

ئەمەش نەبە خواهیـشتی ئێمەیـەو نەبـە حـەزی مامۆسـتاش، چـونکێ خـودی تێکستەکە بە لەش و بە گیان و بە خوێن و بە دەمار ئەم ئیدیعایە رەت دەکاتەوە، ئەوەتا کاکەی فەللاح سەبارەت بە تێکستی ئەو شیعرانەی لـە پـەراوێزی چـاپێکی دیــوانی ســالم دا دیــونێتی، بــێ ئــەوەی بەڵگەیــەکی نووســراو و ســەلمێنەری لەبەردەسـتدا بێـت کـە خاوەنـدارێتی سـالم بـۆ هۆنراوەکـان بـچەسپێنێت، لـەم ئاستانەدا دەڵێ: ((بەڵکو بەڵگەی بەهێزم شـێوەی داڕشـتن و جـۆری بیرکردنـەوەو چۆنیەتی بابەت و شەقڵ سیمای سالم، لە ئاوێنەی ئەم شیعرانەدایە، ئەمانەش ئەو کەرەسەو هەوێنانەیە کە شیعرەکانیان پێ گێڕاوەتـەوە)).[٤٨] ئـەنجا ئێمـەش هـەر ئەم باوەڕو ڕێـڕەو و پێڕەوەمـان بـووە لـە سـەلماندنی راسـتییەکان سـەبارەت بـە تێکستی ئەم قەسیدەیە.

لـە سـەرنجێکی دیکـەو پێویستیـشدا بـا سـەیرێکی دوا دێـڕی قەسـیدەکە بکەین لە هەردوو نوسخەدا، لـەوەیان کـە بـە نـاوی (نـالی)یـەوە تۆمـاری دەکـات، لەوەشیان کە بـە نـاوی (سـالم)ەوە تۆمـارکراوە. چـونکێ دوا دێـڕ لـە قەسـیدەدا بەشێکی گرینگ و بایەخـدارە، لای شـاعیرانی بـە توانـاو جوانیناسـانی ئـەدەب بـە شێوەیەکی گشتی و جوانی ناسی شیعر بەتایبەتی. دوادێڕ کۆتایی قەسیدەیە کـە پێویــستە بــە وشــەی رێــك و پــاراو و واتــا بەخــشی جــوان ببڕێتــەوە تــاوەکو شوێنەوارێکی دلگیرو هەستێکی شیرین لای خوێنـەر بـەجێ بهێڵێـت، تـا ئەگـەر لـە

دێڕەکانی پێشەوەدا خلیسکان و هەلەنگوتنێکیش هاتبێت، لێرەدا لە بیری بچێت و دڵپەسەندی شوێنی بگرێتەوە، بەمەش مەرجی (حسن الختام)ی قەسیدە بە تەواوی جێبەجێ دەبێت.[٤٩] دوادێڕی ئەو تێکستە کە بەنازناوی (نالی)یەوە لە دەستخەتی نووسەری سنەیی و کتێبەکەی مامۆستا قەرەداغیدا تۆمارکراوە، دێڕی بە ژمارە (٤١)ەو بەم جۆرەیە:

**لە ظولمی چەرخی چەپگەردش درێغا! حەسرەتا! دادا!**

**بە میثلی (نالی) بێکەس، کەسی دیلی شارانن**

دوا دێڕ لە تێکستەکەی ئێمە کە بە ناوی (سالم) تۆمارکراوە دێڕی ژمارە (٤٨)ە، واتە ئەم تێکستە (٧) دێڕی لە تێکستەکەی کابرای سنەیی زیاترەو، بەم جۆرەیە:

**لە ظولمی چەرخی چەپگەردش، درێغا، حەسرەتا، دادا**

**بە میثلی (سالم)ی بێ کەس، گەلێ کەس وێڵی شارانن.**

ئەنجا هەر کەمێك ڕامان، بۆ هەر کەسێ کە تۆزێك چەشەی ئەدەبی هەبێ، سووڕ دەزانێت، کە ئەو نیوە دێڕەی بە ناوی (نالی)یەوە تۆمارکراوە، هەم لە ڕووی کێش و هەم لە ڕووی ڕێزمان و داڕشتن و هەم لە باری واتاوە، هەڵەو کەم و کورت و ناتەواوە، نیشانەی کەمتەرخەمی نووسەرەکەیشی پێوە دیارە، چونکە خوێنەر تیایدا دووچاری گرێ و هەڵەنگووتن و سەرەدەری دەرنەکردنێکی خراپ دەبێت، ئەمەش دیسان هەڵەیەکی زەق و حاشا هەڵنەگری دەستخەتەکەیە.[٥٠] دوا قسەشمان سەبارەت بەدوو ڕستەی ناونیشان و سەروبەری تێکسەکەیەوەیە کە مامۆستا قەرەداغی وەکوخۆی بۆمانی گواستۆتەوەو بێ ئەوەی ئاماژەیەك بۆ ئەو ناکۆکی و دژبەرییە بکات کە نووسەری دەستخەت لە سەرەتاو کۆتایی تێکستەکەدا تیێ کەوتووە. لە سەرەتای تێکستی قەسیدەکەدا نووسراوە:

(ذکر پریشانی نجبای بابان أز کفتە نالی در ولایت سلیمانیە انشاکردە).(٥١) مامۆستا قەرەداغی بەم چەشنە لە پەراوێزدا کردوویەتی بە کوردی: (باسی پەرێشانی نەجیبەکانی بابان لە زمانی نالییەوە لە ویلایەتی سلێمانی دای ناوە). لە کۆتایی تێکستەکەشدا ئەم ڕستەیە هاتووە: (تمت شد از کفتە نالی در طهران انشا کردە است).(٥٢) ئەنجا بەم جۆرە کراوەتە کوردی: (تەواو بوو لە وتەکانی

نالی (ئەم شیعرانەی) لە تاران داناوە). دیارە کابرای سنەیی خۆیشی ئاگاداری ئەو ناکۆکی و تێك نەکردنەوەیەی گوتەکانی خۆی نەبووە، دەنا چۆن دەبێت جارێ بڵێ لە سلێمانی دایناوەو جارێکیش بڵێت لە تاران دایناوە!.

مامۆستا دیارە دەرکی بەو ناکۆکییە کردووە، ویستوویەتی بۆشی پینە بکات، بەڵام چۆن؟، دەڵێ: (سەرەتای پارچە شیعرەکە وا دەردەکەوێ لە سلێمانی ئەم شیعرانەی دانابێت، بەڵام ئەمەیان گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە لە تاران دای ناون).[٥٣] مامۆستاش هەر قسەی کابرا دووپات دەکاتەوە، بە ئیزافەی ئەوەی کە قسەی سەرەتاکەی کابرای بە دڵ نییە، بە گومان و دڕدۆنگییەوە لێی دەڕوانێ، بەڵام قسەی کۆتایی کابرای بە یەقین وەرگرتووە، ئەنجا نازانم ئەم یەقینەی لە پای چییەوە هاتووە؟.

ئەنجا ئەو گوتەیەی کابراکە گوتوویەتی: (در طهران انشا کرده است)، لای مامۆستا بۆتە مایەی ئیلهامێکی قووڵ، کە نالی دوای ئەوەی ڕووخانی میرنشین و پەرتەوازەیی بابانیانی بە چاوەکانی خۆی دیوە چۆتە تاران، ئەنجا ئاخۆ دەبێ لەوێ چەند ژیابێ؟ چەند دەفتەرو دەستنووس و شیعرو بەرهەمی لەو جۆرەی لەوێ دانابێ، ئەنجا یا فەوتابێ یا تا ئێستا بە دەست ئێمە نەگەیشتبێ! بۆ ئەوە پێویستە بگوترێ کە هەموو سەرچاوەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە نالی دەبێ بەر لە ڕووخانی میرنشین سلێمانی جێ هێشتبێت.(٥٥) لێرەدا پرسیارێکی دیکەش دێتە پێشەوە، ئەویش ئەمەیە" کە نالی وەختانێك کارەساتی ڕووخانی میرنشین و داڕمانی مەملەکەت و زوڵم و ستەمی ڕۆمیانی بە چاوانی خۆی و بەڕۆژی ڕووناك دیبێت، ئەوسا چ جای ئەوەیە لە نامەکەیدا بۆ سلێمانی، لەوەزع و بارودۆخ و هەلومەرجی بست بەبستی شارو مەملەکەت بپرسێت ئاخۆ چۆنەو چۆن نییە؟، حوجرەو خانەقا و کانی ئاسکان ماوە یان نەماوە؟، مەقامی روخسەتە بێمەوە یا نە نا؟ مەگەر ئەو هەموو شتێکی بە چاوانی خۆی نەدیبوو! پەرێشانی و پەرتەوازەیی و داڕووخانی مەملەکەت!، ئەڵبەتە دیارە ئەقڵ قبووڵی ناکات، ئەم قسانەش کە دەڵێ: نالی لە کاتی ڕووخانی میرنشین لە سلێمانی بووە و کارەساتەکانی بە چاوی خۆی دیوە، ئەنجا چۆتە تاران و لەوێ ئەم قەسیدەیەی گوتووە... بە ڕای ئێمە لەسەر بنەماو بناغەیەکی پتەو دانەمەزراوە، چونکێ

قەسیدەکە هی نالی نییە، لە تارانیش دانەندراوە، هیچ بەڵگەیەکیش لەبەردەستدا نییە نالی دوای رووخانی میرنشین چووبێتە تاران، لەم ناوەدا عەلی ئەکبەری سەنەندوجی لەم مەسەلانەدا زۆر ورد نەبووە، بۆیە ناشێ ئەم قسانەی راستەوخۆ وەربگیرێن دوای ئەوەی لە سەنگی مەحەك دران.

## پەراوێزەکان

١ـ بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم ـ چەپکێك شیعری بڵاونەکراوەی سالم ـ پاشکۆیەکی دیوانی نالی، محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠١٠.

٢ـ بە گوێرەی مامۆستا سەجادی ئەحمەد بەگ یەکێك بووە لە دوانزە سوارەی مەریوان، بەڵام پیرەمێردی نەمر لە داستانەکەیدا (دوانزە سوارەی مەریوان) ناوی دوانزە سوارەکەی یەك بە یەك هێناوەو لە ناویاندا کەسێك بەناوی ئەحمەد بەگەوە وەبەرچاو ناکەوێت. بگەڕێوە بۆ:

ـ مێژووی ئەدەبی کوردی: ٢٥٦.

ـ دوانزە سوارەی مەریوان: ٤.

٣ـ دیوانی کوردی، ب١: ١٣ ـ ١٤.

٤ـ (صاحیبقران)، گرێیەکی وەسفی لێکدراوی عەرەبییە، بەو پیاو مەزن و میرو پاشایانە گوتراوە کە لە کاتی دایکبوونیان دوو ئەستێرەی گەڕۆکی (زوحەل و موشتەری) لە یەك کەلوودا جووت یاخود کۆدەبنەوە کە زۆر بەدەگمەن روودەدات. ئەمەش وەکو هێمایەك بۆ شکۆمەندی و دادپەروەری و بەردەوامبوون لێکدراوەتەوە. ناسرەددین شای قاجاری لە سی ساڵەی حوکمڕانی خۆیدا، ساحێبقڕانی کردە نازناوی و بارەگای فەرمانڕەوایی ناونا ساحێبقڕانییەو ئەو سککە و پوولەی کە ئەویش لێی دەدا سەرەتا ساحێبقڕانی ناوبوو دواتر بەرەبەرە بوو بە قڕان. لەمەوە بە پیاوی خاوەن نگین و سامانداریش گوتراوە ساحێبقڕان، هەروەها ئەگەر کەسێك لە مەیدانداریدا لە پێشەوەی هاوڕێکانی دابێت، ئەویش ساحێبقڕانیان پێ گوتووە، گۆیا ئەحمەد بەگی گەورە لە شەڕدا دەستێکی باڵای هەبووە، بۆیە ساحێبقڕانیان پێ گوتووە، بەڵام ئەو قسەیەی مامۆستا حەمە بۆر دەیڵێ کە (گۆیا خێزانێکی ناودار بوونەو پێنج سەد ساڵ پێشتر لە ئێران بەم ناونیشانە ناسراون)، جێگای بڕواو متمانە نییە.

بڕوانە:

ـ لغت نامە،ج١٠ : ١٤٧٠٧١.

ـ فرهنگ فارسی، ج٢: ٢١٢٢.

ـ دیوانی کوردی، ب١ : ١٣.

٥ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٣ : ١١٧.

٦ـ مەلای جزیری بەر لە سالم پێنج خشتەکی گوتووە، بەڵام ئەو لەسەر شیعری فارسی دامەزراندووە بڕوانە:

ـ دیوانا مەلایێ جزیری: ١٩٣.

٧ـ کاکەی فەللاح لە ژمارەکانی ٢٥ ـ ٣٤ی رۆشنبیری نوێدا ژمارەیەك شیعری بڵاونەکراوەی سالمی بڵاوکردۆتەوە هەروەها مامۆستا قەرەداغیش بە گوێرەی دەستخەتە تازە

دۆزراوەکانی بەردەستی کۆمەڵێك شیعری تازەی سالمی بڵاو کردۆتەوە، کە بەشێکیان شیعری فارسین و بۆ یەکەم جارە بڵاو دەکرێنەوە. د. کەمال فوادیش لە (دەستنووسە کوردییەکاندا) باس لە (١١) پارچە غەزەل و قەسیدەی بڵاونەکراوەی سالم دەکات.

٨- دیداری شیعری کلاسیکی کوردی: ٤٠.

ئەگەر سەرنجی چەند بەیتێکی قەسیدەکە بدەین زۆر شتمان بۆ یەکلایی دەبێتەوە:

**لێم گەڕێن باگریەکەم دیدە بە دیدە خونفشان**

**نایەڵێ یەك دەم بەڕاحەت رابوێرم ئاسمان**

**چونکە سیوەیلی قەدیمن حەق لە پاش عەهدی سەلیم**

**دایە دەست مەحموودی حاتەمدڵ چراغی دوو دمان**

لە درێژایی تێکستەکەدا ئەوە روون دەبێتەوە: سەلیم بەگ ناوێك کۆچی دوایی کردووە و سالم لە تەدارەکی ناشتن و پرسەکەیدا لە (شیوەکەڵ) ئامادەیە. مەحمود ناوێك کە سالم بە حاتەمدڵ ناوی دەبات بۆتە جێنشینی، ئەنجا ناوی (ئەحمەدو رۆستەم و کەریمیش) دێنی کەوا چۆن ئەم کۆچە پەرێشانی کردوون، زۆر وێ دەچێ ئەم مەحمودە، مەحموود ئاغای شیوەکەڵ بێت، کە کاتێ خۆی پیرەمێرد پیەسێکی لەسەر نووسیوە و شاگردانی قوتابخانەی زانستی لەسەر شانۆ پێشکەشیان کردووە. لەپاشانا هەر پیرەمێرد خۆی جارێ لە رۆژنامەی (ژین)و جارێکیش لە شێوەی نامیلکەیەکدا بەناونیشانی (پیەسی تەمپیلێکی راستی تەئریخی لە ولاتی خۆماندا رووی داوە)، لە چاپخانەکەی خۆی و لە ساڵی ١٩٤٢ دا بڵاوی کردۆتەوە.

— بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی پیرەمێرد: ٨.

٩- سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

- مێژووی ئەدەبی کوردی: ٢٧٢.
- شیعرو ئەدەبیاتی کوردی: ٦٢.
- گۆڤاری رزگاری، ژمارە/ ١١،١٢،١٩٧٠،١٠.
- دیوانی سالم: ٩٧.
- میرایەتی بابان:٢٠٣.

١٠- دوو چامەکەی نالی و سالم.

١١ــ مامۆستا قەرەداغی، بەپشت بەستن بەو دەستخەتەی کابرای سنەیی کە ساڵی (١٣٢١/١٩٠٣) نووسراوەتەوە کە بریتییە لە کۆمەڵێك لە غەزەل و قەسیدەکانی سالم، ئەنجا لە کۆتایی دەستنووسەکەدا ئەم دوو دێرە هاتووە: (تمت شد، از گفتە سالم، أصل ئێن شاعیردرولایت سلیمانیە و خاك دولت علیئە عیمانیە است، ئێن شاعیر دائی نالی بودەاست، در تاریخ هجدەهم شهر ربیع الاول سنە (١٣٢١ / ١٩٠٣) حقیر سراپا تقصیر علی اکبرساکن ولایت

سنندج بەتمام رسانید). دەڵێ: بە گوێرەی ئەم نووسراوە سالم خاڵی نالی بووە، بەو پێیەش سالم و کوردی ئامۆزان، کەواتە (سێکوچکەی شیعری بابان خزمی یەکتری و لە یەك بنەماڵە بوون!؟) بەڵام شتی سەیر ئەوەیە مامۆستا وەکو سەر دێڕو وەکو مانشێت ڕای دەگەیەنی کەوا: (سێکۆچکە و سێ پایەی شیعری کلاسیکی کوردی سەردەمی بابان لە بنەماڵەی بابان بوون!). باشە ئەوا گریمان خزمی یەکن، بەڵام بۆ بوون بە بنەماڵەی بابان، ئەوان ڕاستە شاعیری سەردەمی بابانەکان بوون بەڵام لە بنەماڵەی بابان نەبوون. بڕوانە:

ـ بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم: ١٤٦.

١٢ـ گۆڤاری چریکەی کوردستان، ژمارە/٤: ٤١.

١٣ـ میرایەتی بابان: ٢١١.

١٤ـ مامۆستا قەرەداغی یەزدانی مەزن دەست بە باڵییەوە بگرێت هەموو شتەکانی وەکو دەڵێن (ئەوەلبابن!)، بۆ ئەم قەسیدەیەش لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (کەوا بۆ یەکەم جارە کە بەو شێوەیە بڵاوی دەکاتەوە)!. ـ بەر کوتێکی...:٩٩.

١٥ـ سلێمانی شارە گەشاوەکەم: ٨٦ ـ ١٠٠.

١٦ـ تاریخی سلێمانی وە وڵاتی: ١٠٥.

١٧ـ گەشتی ریچ بۆ کوردستان: ١٦٢.

١٨ـ ئەوە هەمان شەڕی عەبدوڵڵا پاشایە کە شێخ ڕەزا عومری خۆی تیادا دەستنیشان کردووە کاتێ دەڵێ:

**کە عەبدوڵڵا پاشا لەشکری والی سنەی شڕ کرد**

**ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنج و شەش تیفلی دەبوستان بوو**

١٩ـ تاریخ و جغرافیای کردستان: ١٦٠.

٢٠ـ سەرچاوەی پێشوو: ١٦٨.

٢١ـ هەمان سەرچاوە: ١٧٨.

٢٢ـ دەستنووسە کوردییەکان: ١١٠.

٢٣ـ چریکەی کوردستان، ژ(٨ ـ ٩): ٥.

٢٤ ـ مامۆستا قەرەداغی هەر پایەدار بێت، زۆر بە شان و باڵی دەستخەتەکانی ژێر دەستی خۆیدا هەڵدەڵێت، بۆ نموونە لە تاریفی دەستخەتی (ئەحمەد ئاغا) ناوێکدا، کە هەر کۆنووسی هەندێ لە هۆنراوەکانی سالمە و بەدانپیانانی خودی مامۆستاش شپرزەو بێ سەرو بەرە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ: (ئەمە یەکەم نوسخەی کۆنی دیوانێکی سەربەخۆی یەکێك لە گەورە شاعیرانی کوردە!)، هەروەها لە مەڕ ئەم دەستخەتەی کابرای سنەییش دەڵێ: (ئەم دەستخەتە یەکێکە لە بەمتمانەترین دەستخەتی ناو کتێبخانەی کوردی)!، کەواتە لە ئاست ئەم دەستنووسەی دیوانی سالم کە لە ژێر چاوەدێری و

سەرپەرشتی خودی شاعیرداو کە هێشتا خۆیشی لە ژیاندا بووە ئامادە کراوە، دەبێ بڵێین چی؟ مەگەر هەر قسەکانی مامۆستا بە بالاّی ئەم دیوانە دەستنووسەدا ببڕین. بڕوانە:
- هەنگاوێك لە ڕێگەی لیکۆڵینەوەی دیوانی سالم: ٦.
- بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم: ١٤٤.
٢٥- ڕۆژنامەی ژین، ژ ٣٥، ١٢/٨/١٩٧١.
٢٦- دیوانی سالم: ١٠٢ - ١٠٧.
٢٧- میرایەتی بابان: ١٩٤.
٢٨- بەرکوتێك لە شیعری سالم: ١٤٢ - ١٥٨.
٢٩- لە گەرمەی خەبات و شۆڕشی چەکداری کورد ساڵی ١٩٧٤، شەوانە پێشمەرگە دەڕژانە نێو شارەکان و دەستیان لە بنکە و بارەگاکانی دوژمن دەوەشاند، جەللادەکانی بەعس لە بەرامبەر بێ دەسەلاّتی و وەکو رقێکی شۆڤینیستی، لەشاری کۆیە کۆتەڵەکەی حاجیان دابووە بەر دەستڕێژی گوللە و چەند جێیەکیان ڕووشاندبوو، هێمنی شاعیر کە بەم مەسەلەی زانیبوو، دەڵێ:

**بەمردووییش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕ شۆڕە**

**ئەوێستاش دەرسی سەربازی دەڵێ ئەو شاعیرە ڕەندە**

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش لەگەڵ ئەوەدا بۆ دوو ساڵ دەچێت دیلی نەخۆشییەکی سەخت و گرانەو لە نێو جێگادا کەوتووەو تەنانەت ناتوانی داشبنیشێ، کەچی هەر بە ڕاکشاوی لەسەر جێی و بالینگانی نەساغیدا لە بەخشش و خزمەتکردن بەردەوامە و بەو حاڵەشەوە لەگەڵ کاك سەدیق صالح دا خەریکی تەواوکردنی دیوانەکەی سالمن.
٣٠- دەستنووسی ژمارە (٦٨)، دەستنووسە کوردییەکان: ١١٠.
٣١- شێواز لە شیعری کلاسیکی کوردیدا: ٨٧.
٣٢- شێوازی شیعری گۆران: ٤٠.
٣٣- الاسلوبیة و الاسلوب: ٦٠.
٣٤- الاسلوبیة:١٣.
٣٥- شێواز لە شیعری کلاسیکی کوردیدا: ١١١.
٣٦- بیدل وسپهری و سبك هندی: ١٨.
٣٧- مامۆستا قەرەداغی خۆیشی باس لە جیاوازی جیهانی شیعری لە دیوانی نالی و سالم دا دەکات و بەڕوونی دەرکی پێ کردووە، باسی لە هەندێ هێڵی گشتی جیهانی هەر یەك لە نالی و سالمیشی کردووە، بەلاّم کە دێتە سەر پەراوێز و بۆچوونەکانی کابرای سنەیی، ئەم ڕاستییانەی کە خۆی دەرکی پێی کردوون فەرامۆش دەکات. بڕوانە:
- هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی لێکوڵینەوە...: ٥.
٣٨- مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٣: ١٢٥.

٣٩ـ شێوازی شیعری جزیری: ١٢٦.
٤٠ـ فرهنگ فارسی، ج١: ٥٣٥.
٤١ـ بیدل و سبکی هندی: ٥٢.
٤٢ـ شێوازی شیعری جزیری: ١٢٧.
٤٣ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٣: ١١٩.
٤٤ـ مێژووی بیری کوردی: ٢٩٦.
٤٥ـ هەنگاوێك لەسەر رێگەی...: ٥.
٤٦ـ مێژووی بیری کوردی: ٣١٥.
٤٧ـ هەمان سەرچاوە: ٣٩٤.
٤٨ـ رۆشنبیری نوێ، ژ/٢٥، ١٩٧٤/٧/٢١.
٤٩ـ صناعات ادبی: ١٥٩.
٥٠ـ بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم: ٢٤٣.
٥١ـ هەمان سەرچاوە: ١٥٤.
٥٢ـ هەمان سەرچاوە:١٥٨.
٥٣ـ هەمان سەرچاوە:١٥٨.
٥٤ـ هەمان سەرچاوە:١٤٦.
٥٥ـ بڕوانە:
ـ نالی لە دەرەوەی کوردستان دا: ٨.
ـ مێژووی بیری کوردی: ٣٢١.
ـ چەپکێك لە گوڵزاری نالی: ٣٨.

## ئەنجام

لە کۆتایی ئەم تۆژینەوەیە کە بە شێوەیەکی فراوان سەبارەت بەتێکستی دوو قەسیدەی شاکاری (سالم)ەوە بە ئەنجام گەیەندراوە، وەکو کۆبەندێکیش بۆ سەرجەم ئەو بیرو بۆچوونانەی لەم بارەیەوە لە دووتوێی باسەکەدا خراونەتە ڕوو، دەتوانین کورتەیەکی ئەنجامەکانی باسەکە لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا بخەینە ڕوو:

١ـ دیوانی شیعرو شاعیرانی کلاسیکی کوردی، بەهۆی هەلومەرجی تایبەتی گەلی کوردەوە، نەتواندراوە تاوەکو ئەمڕۆ، بە تەواوی و بە شێوەیەکی وردو زانستی لیکۆڵینەوەی تەواویان لە بارەوە بکرێت، تاوەکو تێکستی دیوان و بەرهەمەکانیان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و ساغکراوە، لە چاپ بدرێت و بڵاوبکرێتەوە.

٢ـ زۆرێك لەو تێکست و بەرهەمە شیعرییانەی شاعیرانی کۆنمان کە لە کۆبەرهەم و دیوانەکانیاندا چاپ و بڵاوکراونەتەوە نا دروست و نا تەواون، بە هۆی تۆژینەوەی وردو زانستییەوە پێویستییان بەڕاستکردنەوەو ساغکردنەوە هەیە.

٣ـ سالم یەکێکە لە کەڵە شاعیرانی کلاسیکی کرمانجی ناوەڕاست، کە ڕەنگە لە هونەرەکانی غەزەلخوانی و قەسیدە وێژیدا کەم نموونە بێت، بەڵام تاوەکو ئێستا دیوانێکی تەواو و ڕێك و زانستی و متمانە بەخشی لە کتێبخانەی کوریدا نییە.

٤ـ ئەو لە وێنەی شاعیرێکی هونەروەرو باڵادەستی ئەدەبی کلاسیکی، لە ڕووی زمان و شێوازو بیرو تەعبیرو جیهانبینی شیعرییەوە، خاوەنی تەرزو هونەرو تایبەتمەندی خۆیەتی، کە بەوە هەم لە شاعیرانی دیکە جیا دەکرێتەوە، هەم دەتواندرێت بەرهەمی شیعری بەسەر بکرێتەوە و بناسرێتەوە.

٥ـ قەسیدەیەك کە لە ژێر سەرناوی (لەباسی پەرێشانی بابانەکاندا) یە، بەم دواییە بە پشتبەستن بە کۆنە دەستخەتێکەوە دراوەتە پاڵ (نالی). ئەم مەسەلەیە کە لەم باسەدا لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی زانستی شێوازناسی و مێژووییەوە خراوەتە ڕوو، ئاشکرا دەبێت کەوا نییە. وەناشبێت هەر بۆچوونێك کە لە کۆنە بەیازو کەشکۆڵ و دەستخەتێکەوە خرابێتە ڕوو، بێ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی زانستی بەڕاست و دروست وەربگیرێت و کاڵای حەقیقەتی بکرێت بە بەردا.

٦ـ ئەم تێکستە شیعرییە، بەسیماو بەڕوخسار و بە کرۆك و ناوەڕۆك سەر بە دنیای شیعری (سالم)ەو لە چوارچێوەی ئەو چەند بەرهەم و شاکارە ئەدەبیانە دانابڕێت، کە شاعیر بە پەیوەندی لەگەڵ بابانەکان و میرایەتی باباندا هۆنیویەتەوە.

## سەرچاوەکان

**١. کتێب / أ. کوردی:**

١- ئەنجوومەنی ئەدەبیان، ئەمین فەیزی بەگ، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق"دەستەی کورد"،بەغدا، ١٩٨٣.
٢- بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم، محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠١٠.
٣- بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی پیرەمێرد، محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.
٤- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی، محەمەد ئەمین زەکی بەگ، ئامادەکردنی: رەفیق سالح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٥- چەپکێك لە گوڵزاری نالی، مەسعود محەمەد، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
٦- دیوانا مەلایێ جزیری، تحسین ابراهیم دۆسکی، وەزارەتا ڕەوشنبیری، چاپخانەیا هاوار، دهۆك، ٢٠٠٠.
٧- دوانزە سوارەی مەریوان، پیرەمێرد، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئازادی، سلێمانی، ١٩٥٩.
٨- دیداری شیعری کلاسیکی کوردی، حەمە سەعید حەمە کریم، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٦.
٩- دەستنووسە کوردییەکان، د. کەمال فؤاد، ڤیزبادن، ١٩٧٠، (بە ئەڵمانی).
١٠- دیوانی سالم، چاپخانەی کوردستان، چاپی دووەم، هەولێر،١٩٧٢.
١١- دیوانی کوردی، محەمەد مستەفا (حەمەبۆر)، ب١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠١٠.
١٢- دوو چامەکەی نالی و سالم، علاءالدین سجادی، بەغدا، ١٩٧٣.
١٣- سلێمانی شارە گەشاوەکەم، جەمال بابان، ب١، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٢.
١٤- شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، رەفیق حیلمی، مطبعة التعلیم العالي، أربیل، ١٩٨٨.
١٥- شێوازی شیعری جزیری، شعبان أحمد، دەزگای سپیرێز، دهۆك، ٢٠٠٦.

١٦ـ شێوازی شیعری گۆران، پەخشان عەلی، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٩.
١٧ـ شێواز لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، حەمە نوری عومەر کاکی، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٨.
١٨ـ گەشتی ریچ بۆ سلێمانی، و/ محەمەد حەمە باقی، ئێران، تەورێز، ١٩٩٢.
١٩ـ لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، د. مارف خەزنەدار، المؤسسة العراقیة اللدعایة والطباعة، بەغدا، ١٩٨٤.
٢٠ـ میرایەتی بابان، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٨.
٢١ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، علاءالدین سجادی، چ٢، چەپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧٢.
٢٢ـ مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، ب٣، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٣.
٢٣ـ مێژووی بیری کوردی، مامۆستا جەعفەر، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٢٤ـ نالی لە دەرەوەی کوردستاندا، د. عەبدوڵڵا حەداد، هەولێر، ٢٠٠٠.
٢٥ـ هەنگاوێك لە سەر ڕێگەی لێکۆڵینەوەی (دیوانی سالم) دا، محەمەد عەلی قەرەداغی ، بڵاوکراوەی
ئەکادیمیای کوردی ، هەولێر، ٢٠٠٩.

**ب / عەرەبی :**

٢٦ـ الاسلوبیة، د. فتح الله احمد سلیمان، دارالاوقاف العربیة، القاهرة، ٢٠٠٨.
٢٧ـ الاسلوبیه والاسلوب، د. عبدالسلام المسدي، ط٤، دار سعاد الصباح، الکویت، ١٩٩٣.

**ج / فارسی:**

٢٨ـ بیدل و سپهری و سبك هندی، حسن حسینی، چ٤، انتشارات سروش، تهران، ٢٠٠٨.
٢٩ـ تاریخ و جغرافیای کردستان (سیرالاکراد)، عبدالقادر ابن رستم بابانی، چاپخانه ارژنگ، تهران، ١٩٨٧.
٣٠ـ صناعات ادبی، استاد جلال الدین همایی، انتشارات مؤسسة مطبوعات علمی، تهران، ١٩٦٠.

٢/ فەرهەنگ:
٣١ـ فرهنگ فارسى، د. محمد معين، ج٤، چاپخانه سپهر، تهران، ١٩٨١.
٣٢ـ لغتنامه دهخدا، على اكبر دهخدا، ج١١، چ٢، تهران، ١٩٩٨.
٣/ گۆڤارو ڕۆژنامە:
٣٣ـ جەنگی بابان و عوسمانی، محەمەد مستەفا کوردی، گ/ ڕزگاری، ژ/(١٠ ـ ١١ ـ ١٢)، ١٩٧٠.
٣٤ـ أ – لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم، د. کەمال فـؤاد، گ/ چـریکەی کوردستان، ژ(٤)، لەندەن، ١٩٨٠.
ب – شینی ئەدیبانی کورد، د. کەمال فـؤاد، گ/ چـریکەی کوردستان، ژ/(٨ ـ ٩)، لەندەن، ١٩٨٥.
٣٥ـ لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم، کاکەی فەللاح، گ/ ڕۆشنبیری نوێ، ژ/(٢٥)،١٩٧٤.
٣٦ـ لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم، کەمال فؤاد، ڕ/ژین، ژ/(٣٥)، ١٩٧١.

## على هامش قصيدتين للشاعر سالم
### ( دراسة و نص )

أثار صدور كتاب للاستاذ محمد على قرداغي حول تحقيق بعض النصوص من قصائد الشاعر عبدالرحمن بگ صاحبقران (سالم / ١٨٠٥ - ١٨٦٩)، جدلاً بين الاوساط الثقافية المهتمة بالاثار الادبية الكلاسيكية، وبالاخص قصيدتان مشهودتان من آثار الشاعر سالم، حيث اسند الاستاذ القرداغي مناسبة نظم احدى القصيدتين الى احد الامراء البابانيين ولم يكن صائبا في ذلك تماماً. و أسند قرداغي القصيدة الثانية الى الشاعر (نالى/١٨٠٠ - ١٨٧٣) خلافا للمعهود وذلك بناءً على ما جاءَ في احدى المخطوطات التي قام الاستاذ الفاضل بتحقيقها ونشرها في كتاب صدر عام ٢٠١٠.

وتقوم دراستنا هذه اولاً بتصحيح ما ذهب اليه الاستاذ القرداغي بصدد القصيدة الاولى بالاستناد الى المصادر التاريخية المتعددة، الى جانب تحقيق ونشر نصها الكامل والنهائي تقريباً مع شرح مفرداتها المستعصية، ومن ثم تناول القصيدة الثانية عن طريق دراستها دراسة لغوية اسلوبية واحصائية علمية، بعد تحقيق نصها الكامل وشرح واف لمفرداتها ومعانيها ورموزها، والتثبيت بالدليل القاطع على أن القصيدة تنتمى نصاً وروحاً الى عالم ومخيلة واسلوب (سالم) الشعرية، وهي بعيدة كل البعد عن (نالى) وعالمه ومنهجه الادبي.

تتالف الدراسة اجمالاً من ثلاثة محاور رئيسية مع تفرعاتها على الوجه الاتي:

المحور الاول/ نبذة عن حياة الشاعر سالم:

أ - شاعريته ب - علاقته مع البابانيين

والمحور الثاني/ ويدور حول القصيدة الاولى التي نظمت بمناسبة نبأ عودة عبدالله پاشا البابانى.

اما المحور الثالث/ فتتناول القصيدة الثانية الحالة البائسة والمزرية للبابانيين بعد انهيار امارتهم.

وتلي ذلك أهم النتائج التي توصل اليها الباحث من خلال الدراسة مع مختصر باللغتين العربية والانگليزية. واخيراً تأتي قائمة بالمصادر والمراجع التي استفاد منها الباحث خلال الدراسة .

## Abstract

### (On the margin of two poems of Salim)

Mr mohammed Ali Qaradaghi aroused a wide controvery intellectual medias through his publication of a book about some texts of the poet Abdul-Rahman Beg Sahibqran ( Salim, ١٨٠٥-١٨٦٩), especially a two widely-known poems. Qaradaghi ascribed versing one of the to one of Baban Emirs but he did not succeed in this; and ascribed the second poem to our poet (Nali,١٨٠٥-١٨٧٣) contradicting what is traditionally known and published previously.

Our study makes correction to what Mr Qaradaghi has ascribed about the first poem. We did this depending upon different historical sources as well as displaying its final and complete test with explaining all its vocabularies, then the second poem's study linguistically, stylistically and statically after investigating its text comprehensively with explaining its vocabularies and their meanings and symbols, moreover, proving with explicit evidences that the poem belongs textually and spiritually to the world and imagination and poetic style of Salim. The poem is very far from Nali's world and his literary method.

The study consists in three axes with their branches as following:
a-his poeticalness.
b- his relation with Babans.

The second axis takes the second poem which exhibits the harsh condition of Babans after their Emirte's collapse.

At the end most important conclusions that he researcher had come to with an abstract in Arabic and English are presented. Finally a list of resources and references are shown which helped the researcher in the study.

# شیعری زیندان لە نێوان واقیع و ئەدەبدا

## ( لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە
## لەنێوان هەندێ شیعری عەرەبی و کوردیدا )

د. پەخشان سابیر
زانکۆی سۆران/ بەشی زمانی کوردی

م. ی. جوان عەبدولقادر
زانکۆی سۆران/ بەشی زمانی عەرەبی

### پێشەکی

ئەزموونی زیندان بە هۆی بارودۆخی رامیاری لای بەشێك لە شاعیرانی کورد بۆتە پاڵنەرێك بۆ بەرهەمهێنانی بابەتی شیعری بەرەنگاربوونەوە، کە دەشێ بەشێك لەم بەرهەمانە جیا بکەینەوەو ناوی بنێین (ئەدەبی زیندان) چونکە تایبەتن و کەشی نووسینیان پەیوەستە بە دیوارەکانی زیندان و یادکردنەوەی ژیانیان لەم چوارچێوەیەدا و داڕشتنیان لە نێو تێکەڵەی بەرگری و خۆشەویستی نیشتیمان و دەربڕینی ئێش و ئازار و هەستە پڕ لە تووڕەیییەکانیان، هەرچەندە ئەم جۆرە بابەتانە ئەزموونی تاکە کەسین، بەڵام خەسڵەتی تاکە کەسی زیندانییەکە دەگۆڕێت بۆ خەسڵەتی کۆ و گوزارشتکردن لە بری ویستی زیندانیکراوان.

لەبەر ئەوەی شیعر بەهایەکی پڕ بایەخی هەیە، بۆیە ئەو بابەتانەی بە شیعر دەردەبڕێت زووتر دەگەن و بلاوتر دەبنەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئەم شیعرانە بە نهێنی و لە نێو دیوارەکانی زیندان نووسرابن، گیانی نەتەوەیی زیاتر لەم جۆرەدا بەدی دەکرێت. دەشێ ئەمە بخەینە چوارچێوەی پرسیارێکی داهاتوویی کە ئەدەبی ڕاپەڕین و زیندان لە نێو ئەدەبی کوردی و عەرەبیدا بوونەتە ئەدەبێکی سەربەخۆی خاوەن سیما و تایبەتمەندی دیاریکراوی خۆیان و سنوورێکی دیاریکراو جیایان دەکاتەوە، یان هەروەك بەشێکی پەیوەست لە نێو جۆرەکانی تری شیعر

نموونەی شیعری بەرەنگاری و نیشتیمانی و ڕامیاری و ...... هتد بەدی دەکرێن، سەلماندنی ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و باسی زیاتر هەیە.

لە بەرئەوەی پەیوەندییەکی بەتین کورد و زیندان بە یەکترییەوە دەبەستێتەوە، بە تایبەتی کە ئەم بابەتە پەیوەستە بە بارودۆخی کوردستان بە پێی قۆناغە مێژووییەکان و حکومەتەکانی عێراق و چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ کورد و عەرەبە یاخییەکان شاعیرانیش کە لە نێو چینی ڕۆشنبیریدا هەڵکەوتوون، هەڵوێستی دیار و ئاشکرایان هەبووە، ئەمە بۆتە مایەی زیندانیکردن و ئازاردانی هەندێکیان و تەنانەت گەیشتۆتە لەسێدارەدانی هەندێکی تر و بزرکردنیان نموونەی (مارف بەرزنجی و دڵشاد مەریوانی) دوو شاعیری دیاری قوربانیدان و کۆڵنەدانن، هەر بە هۆی هەڵوێستی شاعیرو ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دەسەڵات ، گەلێك شاعیری عەرەبیش دووچاری گرتن و ئازار و ئەشکەنجە بوونەتەوە، تەنانەت بەشێکیان تاراوگەیان کردبووە وڵات نموونەی (مزەفەر نواب) و( محەمەد مەهدی جەواهیری) و چەندینی تریش دووچاری ئازارێکی زۆر بوونەتەوە نموونەی (مەحمود دەروێش و سەمیح قاسم).

## بەشی یەکەم ـ زیندان و ئەزموون و ئامانجەکانی شیعری زیندان

### ١. چەمك و سنووری شیعری زیندان

لە نێو شیعری نوێی کوردی و عەرەبیدا شیعری تایبەت بە زیندان پانتاییەکی گرتووە، ئەم پانتاییە لە دوو ڕوانگەوە گوزارشتی لێ کراوە:

یەکەمیان/ لە ئاکامی ئەزموونی واقیعی خودی شاعیر خۆیەوە هەستی زیندانیکردن گوزارشتی لێ کراوە.

دووەمیان/ گوزارشتکردنەکە خوازەییە و لە ئاکامی پاڵەپەستۆکانی سەر شاعیر سەر هەڵدەدا یا لە ئاکامی سوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی تر جا شاعیر بن یا کەسانی ڕامیاری و نەتەوەیی و پاڵەوانی نێونەتەوە بن.

لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا ئەدەبێك بەناوی (ئەدەبی زیندان) بە تایبەتی لە نێو ئەدەبی کوردیدا دیاری نەکراوە، لە کاتێکدا (زیندان دەزگایەکە لەگەڵ دەرکەوتنی یاسا و سیستم و دەستووورە بڵاوکراوەکانی ماف و دیاریکردنی

ئەرکەکان هاتۆتە ناو ژیانی گشتی و بەمەبەستی پاراستنی مافەکانیان لە لادانە نێگەتیڤەگانی هەندێ کەسانی کۆمەڵگا بلاوبۆتەوە)[1]. زیندان لە نێو فەرهەنگە عەرەبییەکاندا بە واتای زیندانیکردن و داگیرکردنی سەربەستی و وەستان لە کارکردن لە بەر هەر هۆکارێك بێت، دێت.[2] لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژە بە زیندان کراوە*، کەسانێك لەو باوەڕەدان یەکەم کەسایەتی کە زیندانی داهێنابێت، کەسایەتییە ئەفسانەییەکەی (زوحاك)ە، لاشیان وایە کە ئەم کەسایەتییە هەر (نەمروود) خۆیەتی.[3]

جان جاك ڕۆسۆ J.J. Rousseau (١٧١٢ ـ ١٧٧٨) لە وتە بەناوبانگەکەیدا ئاماژەی بەم چەمکە کردووە و دەڵێ: (مرۆڤ بە سەربەستی لە دایك دەبێت، بەلام کۆمەڵگا تێکی دەدات).[4]

شاعیر لە خەڵکی تر زیاتر پەیوەستە بە دەسەلات، لەبەرئەوەی شیعر خۆی هەڵوێستە، بۆیە هەمیشە پاشا و سەرکردە و دەسەلاتە ڕامیارییەکان لەوە ترساون کە شاعیران دژیان بوەستن و هەڵوێست وەربگرن. لە بەر ئەم هۆکارە بایەخی شاعیران لای ئەم پاشاو سەرکردانە دیار و بەرچاو بووە، کە بە یەکێك لەم دوو ڕێگایە مامەڵەیان لەگەڵیاندا کردووە: [5]

١ ـ ڕێگە گرتن و بەستنەوەی سەربەستییەکانیان، یا بە هۆی سووتاندنی بەرهەمەکانیان یا بە هۆی بەندکردنیان ( یا بە هۆی شەهیدکردنیان) * .

٢ ـ سەرنجڕاکێشانییان بە هۆی لایەنی دارایی و بەخشینی پارەو پوول و سامانێکی دیاریکراو** .

شیعری زیندان کە ڕوویەکی شیعری یاخیبوون و بەرەنگارییە، ئەو شیعرەیە شاعیری دیل بە هۆی کاری شۆڕش یان ڕێکخستنەوە لە زیندانی دوژمن[6]. لە ئاکامدا هەندێ جار بەرهەمێکی شیعری دروست دەبێت، (تیایدا ئەوپەڕی ڕق و بێزاری خۆی دەردەبڕێ بۆ ئەوەی لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتووبێ و ببێتە نموونەیەکی بەرخودان و قارەمانێتی، بەرەنگاری هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەك دەبێتەوە و باکیشی لە مردن نییە)[7] ئەم جۆرە شیعرە ڕەگ و ڕیشەی لە نێو مێژووی مرۆڤایەتیدا داکوتاوە و لە گەشەسەندن و بوونی بە ئەدەبێکی سەربەخۆ بەردەوامە، گرنگترین تەوەرەکانی ئەم ئەدەبە:[8] .

١ ـ وێنەگرتنی ئەو ئازارە قورسانەی کە زیندانییەکە لە ئازارە هەستی و مەعنەوییەکاندا دەیچێژێ.

٢ ـ وێنەگرتنی هەندێ نموونەی مرۆیی کە لە نێو زیندااندا چاودێرییان دەکات، بە تایبەتی کەسایەتییە (سایکۆباتییەکان)* .

٣ ـ بەستنەوەی ژیانی زیندان و بارودۆخی ڕامیاری و ئەو زوڵم و زۆرداریی و گەندەڵییانەی کە لە نێویدا دەبێتە هۆی گەیشتنی قەڵەم بەدەست بۆ زیندان.

٤ ـ لە لایەنی تێڕوانینی دەروونی پاشەڕۆژی، نیگای نووسەر لە نێوان ئومێدی بێ سەربەستی و نائومێدی کە وشەکانی بە ڕەنگێکی تاریك دادەپۆشێ. (فایز أبو شمالة) لە کتێبی (السجن في الشعر الفلسطيني) دا دەڵێ: (شیعری زیندانییەکان بە بەرپرسێتی و هاوسەنگی دەناسرێت.لە پاڵ قووڵی بیرکردنەوە و ڕاستگۆیی هەستەکان و بەهێزیی دەستەواژەکان و سادەیی لە لاساییکردنەوەی واقیعدا)[٩] .

(فایز أبو شمالة) جەخت لە سەر ئەوەش دەکاتەوە کە ئەوانەی لە دەرەوەی زیندان شیعرییان نووسیوە تەنیا وێنەی دەرەوەی زیندانیان وەکو ئێش و ئازارێك گرتووە، وەك ئەوەی زۆر نالاَنەوە و سکالاَ و ئێشی تێدا بەدی دەکرێت، بەلاَم ئەوانەی لە ناو زینداندا شیعریان نووسیوە نالاَنەوە و ئێشیان لە سەر دەرنەکەوتووە بەڵکو شۆڕش و تووڕەییان پێوە دیارە[١٠]، چونکە زیندان بۆتە پاڵپشت و هۆکارێك بۆ دەربڕینی تووڕەییەکان، کە زۆر جار تووڕەیی شۆڕش و داهێنان بە ژیان دەبەخشێت. لە کاتێکدا (زیندان لە گۆڕستانی کۆمەڵێ تەرمە زیندووە مردووەکان گۆڕاوە بۆ شوێنێك کە تێیدا زەمەن وەستاوە، بۆ ئەوەی ببێتە هەلێك بۆ یەکگرتن و پێداچوونەوەی خود و وردبوونەوە لە جیهان، بۆیە گەلێك لە بیریار و فەیلەسووف و نووسەرە گەورەکان ماوەی زیندانیکردنیان قۆستۆتەوە، تا بە هێز و توانایەکی زیاترەوە بێنە دەرەوە)[١١]. شیعری زیندان دوو ڕەهەندی لێ دەکەوێتەوە:

یەکەمیان/ ڕەهەندی دەروونی .

دووەمیان/ ڕەهەندی کۆمەلاَیەتی .

بەلاَم ئەم دوو ڕەهەندە کاریگەریی کۆمەلاَیەتی کەمتریان هەیە، چونکە زیندانیکردنەکە دەبێتە مایەی شانازیکردن، چەند ڕێژەی شانازیکردنەکە زیاتر

بێت، هێنده كاريگەريى ئەم دوو ڕەهەنده كەمتر دەبێتەوە، پێچەوانەكەيشى ڕاستە.

هێڵى گۆڕان بە پێى سروشتى كۆمەڵگا دەگۆڕێت، كە شاعيريش كەسێكى نێو ئەم كۆمەڵگايەيە و بارودۆخەكان كاريگەريى زياترى لە سەر دروست دەكەن، بۆيە (سەميح قاسم) بەم جۆرە گوزارشت لە خۆى دەكات:

**أنا قبل قرون**

**ما كنت سوى شاعر**

**لكني بركان ثائر**

**في القرن العشرين** ..........[١٢]

لە نێوان (شاعير) و (شاعيرێكى ياخى) جياوازييەكى زۆر هەيە، خستنە سەر وشەى (ياخى) بە تەواوى ئەركى شاعيرى ئاسايى گۆڕيوە، ئەگەر شاعير پەيوەندى بە شتەكانەوە هەبێت، ئەوا شاعيرى ياخى پابەنده بە ڕاميارى و بەرەنگارى و هەڵوێست وەرگرتن .... هتد، بۆيە (بێكەس) دەڵێ:

**من كە زانيم حاڵى زانا نەفيە، حەپسە يا شەقە**

**هەر كتێبێكم هەبوو، دوێنێ لە داخانا دڕيم** ...(ديوانى بێكەس، ل١٨١)

لە ئاكامى ناهاوسەنگى و بوونى بۆشايى و تێنەگەيشتن لە نێوان ڕۆشنبيران و دەسەڵات، ئەم تێڕوانينە لاى (بێكەس) دروست بووە، بەڵام دڕاندنى كتێب لەوانەيە خوازەيى بێت، نەك ڕاستەقينە.

**٢. ئەزموونی زیندان لە نێوان شیعری کوردی و عەرەبیدا**

ئەزموونی زیندان لای شاعیرانی عەرەب هەر لە سەردەمی جاهیلییەوە هەبووە و چەندین شێوەی ئازار و ئەشکەنجەی بە خۆیەوە بینیوە، بەڵام لای شاعیرانی کورد ئەزموونێکی نوێترە، بە تایبەتی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا زیندانییەکان زیاتر توندوتیژییەکی ڕەمزیین و لە ئاکامی ئێش و ئازاری خۆشەویستی و عەشق لە نێو دەروونیاندا دروستیان کردووە.

لە ناخی شیعری نەتەوایەتی و هەستکردن بە ڕزگاربوون لە زوڵمی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و بەدەستهێنانی سەربەستی و ئازادی بوونەتە مایەی زیندانیکردنی هەندێك لە شاعیرانی نێو شیعری نوێی کوردی و سەرهەڵدانی شیعری زیندان و فراوانبوونی تەوەرەی ئەم جۆرە بابەتە لە نێو جۆرەکانی تری شیعردا هەروەك پێشتر ئاماژەیان پێکراوە، هەروەها لە ئاکامی دەربڕینی بیر و هزری ڕزگاربوون کە بۆتە هاندەرو پاڵپشتێك بۆ هۆشیارکردنەوەی میللەت و هاندانیان بۆ خۆپێشاندان و ڕاپەڕین و شۆڕش، ... هتد، بە مەبەستی پاراستنی خاك و نیشتیمان (زیندان ئەزموونێکی تاکەکەسییە، بەڵام ئەو کاتەی بە شێوەیەکی داهێنەرانە، ئەم ئەزموونە تاکەکەسییە دێتە نووسین، لەو چوارچێوەیە دەردەچێ و دەبێ بە ئەزموونێکی گشتی تر)[١٣]. ئەزموونی زیندان لە هەردوو جۆرە ئەدەبەکەدا بەم شێوانەی خوارەوە گوزارشتیان لێکراوە:

١ ـ ئەو دەقانەی بە هۆی ناوەڕۆکەکەیان بوونەتە مایەی زیندانیکردنی شاعیر.

٢ ـ ئەو دەقانەی لە نێو زینداندا نووسراون و گوزارشتیان لەو هەستە کردووە کە لە ئاکامی تەنیایی و ئازاردا چەشتوویانە، ئەم جۆرەیان بە هێز دەبێت، چونکە لە نێو خودی ئەزمونەکەدا نووسراوەتەوە و لێی دوور نەکەوتۆتەوە، واتە بۆشایی لە نێوان نووسین و ئەزموونەکەدا دروست نەبووە.

٣ ـ یادکردنەوەی زیندان و کەشی گشتی زیندان دوای دەرچوونی شاعیرەکە لە زیندان، لەم جۆرەدا ڕەهەندێکی زەمەنی دروست دەبێت. کارێکی سەختە کە نووسەر یا شاعیرەکە دووبارە بچێتەوە نێو بارە دەروونییەکەی کاتی ئەزموونی زیندانیکردنی.

٤ ـ شاعیرانی کورد و عەرەبیش ڕەمزەکانی نەتەوەکانی تریان وەرگرتووە و لە شیعردا بە کاریان هێناوە، بە تایبەتی ئەوانەی ڕۆڵێکی زۆریان لە ڕزگارکردن و خەباتی نەتەوەکانیاندا هەبووە و ئازاری زیندانیان چەشتووە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە کاریگەری بەندکردنی جەستە بۆ سەر گیان درێژ دەبێتەوە بە شێوەیەك هەست و سۆزیش بەند دەکرێن، دواتر چەشنی شۆڕش هەڵدەگیرسێن بە مەبەستی هەوڵدان بۆ گوزارشتکردن لە خودی خۆیان، مەزنترین ئەو هەست و سۆزە، هەست و سۆزی خۆشەویستییە کە زیاتر لە نێو دیوارەکانی زیندانـدا گـڕ دەگـرێ[١٤]. بە مەبەستی دروستکردنی تیشکێکی هیوا بەخش و پەیوەستکردنی دەروون بە یادەوەرییەکانی دەرەوە و گوزەران لە نێو دەرەوەی دیوارەکانی زیندان. (قانیع) (١٨٩٨ ـ ١٩٦٥) ی شاعیر کە لە ئاکامی (ئەو ناکۆکییە خێڵەکییانەی نێوان بنەماڵەکەی و دەرەبەگەکانی ناوچەی مەریوان، ماکێکی لە بیر نەچوونەوەی لە دەروونی شاعیردا خولقاند و لە کۆتایی پەنجاکاندا چەند جارێك تووشی ئالۆزی و ناڕەحەتی بووە، بە حەپسی بردوویانە بۆ بەندیخانەی بەسرە و لە وێوە بۆ عەمارە و هێناویانەتەوە بۆ بەغدا)[١٥].

بۆیە گەیشتۆتە ئەو ڕاستییەی کە بە گوێی نەتەوەکەیدا بچرپێنێ و لەم تاکە شیعرەدا بڵێ:

**قەت لە بیرت نەچێ کوردە زڕەی زنجیری پێت**
**تۆ تەماشا کە لە دەس بێگانەکان چی هاتە ڕێت** ......( دیوانی قانیع، ل٥٧٦)

یا (مارف عومەر گوڵ / ١٩٥٦ ) دەڵێ:

**وێنەی تەڵخی زیندان بگرم**
**یاخود وێنەی دڕندانەی جەللادەکان**
................................
**وێنەی ژێر پێی بریندارى ڕوو لە بنمیچ هەڵواسراو**
**یاخود سەری بژ و چڵکن**
**لە بەر ئاوی ساردا لە تاو**
**دەنگی شیعری کپکراوەی دەروونی خۆم بگێڕمەوە**

**یا هاواری پیرەمێردێك**
**دەیویست خەڵکی گوندە چۆڵ و وێرانەکەی**
**بێنە فریای ..........** (خۆری زیندان، ل٣٣ )

زیندان و مانەوە لە چوارچێوەی دیوارەکانی زیندان ئـەزموونێکی مرۆڤایـەتی تاڵی لای شاعیران دروست کردووە، بۆیە لە یادەوەرییان تۆمار بووە و ناسرێتەوە، چونکە ئەو ئامانجەی لە پێناویا زینـدانی کـراون، لـە هـەموو ئـازارێکی دەروونـی و جەستەیی گەورەتر بووە ، تەنانـەت بۆتـە پاڵنـەر و هێزێـك بـۆ نووسـینی شـیعری بەرگری و نیشتیمانی و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان، بۆ ئەوەی نیشانی بـدەن کـە زینـدان و ئـازاردان نابێتـە مایـەی ئـەوەی واز لـە ئامانجـەکانیان بهێـنن، بۆیـە (شاعیرانی کورد بە هۆی ئەو بارودۆخە نالەبارەی تیایـدا ژیـاون و ئـەو پێوەندییـە سیاسی و ڕێکخراوەییەی بوویانە، زۆربەیان بەشـێك لـە ژیانیـان لـە گرتووخانـە و زیندانەکاندا بـە سـەر بـردووە و نموونـەی بـەرزی خۆڕاگرییـان نیـشان داوە و ئـەو هەڵوێستەیان خستۆتە نێو چوارچێوەیەکی هونەرییەوە)[١٦].

ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان شاعیران و دەوڵەتـدا، یـا لـە نێـوان شـاعیر و کۆمەڵگادا بەدی دەکرا، چ شاعیرە عەرەبەکانی چوارچێوەی دەوڵـەتی عێـراق ، چ شـاعیرە کوردەکـانی کوردسـتان یـەکێ لـەو چـوار بـارە دیـاریکراوە بـە یـەکیانی دەبەستەوە:[١٧]

١ ـ یا ئەوەتا شاعیرەکە بە شێوەیەك لە شێوەکانی پابەندیی پەیوەست بووە بە دەسەڵاتی دەوڵەت.

٢ ـ یـا ئـەوەتا شـاعیرەکە پەیوەنـدی بـە کۆمـەڵگا پـچڕیوە و لـە دوورەپەرێزییـەکی تـەواودا ژیـاوە، لـە ڕێگـەی بێـدەنگبوون بەرامبـەر کاروبـاری گـشتی و ڕووداوە ڕامیـاری و مافـە هەمـەجۆرەکانی کـە بـە سـەر کۆمـەڵگادا سەپێنراوە.

٣ ـ یا ئەوەتا شاعیرەکە وڵاتی جێهێشتووە و چۆتە دەرەوەی وڵات.

٤ ـ یا ئەوەتا بۆتە زیندانییەکی ڕامیاری بە هۆی سووربوونی لە سەر نووسین، لە بارەی بارودۆخە سەرکوتکراوەکانی کە دەوری هاوڵاتیانی دابوو.

(بە شێوەیەکی گشتی ئەدەب و سەربەستی هاوشێوەن، بەرهەڵستی زیندان و پاسەوان و ئێشکگری زیندان دەکەن، سەربەستی بەهایەکی ڕامیارییە کە زیاتر پەیوەستە بە ئەدەب، تەنانەت هەندێ لە ڕەخنەگران ئەدەب و سەربەستی بە هاوواتای یەکتر دادەنێن. لەو ڕوانگەیەی کە پەیامی هەر نووسەرێك پێویستە پتەوکردنی لایەنەکانی سەربەستی بێت ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە کاری داهێنراو کارێکی سەربەستە، ئەنجامدانی سەربەستی بمانەوێ یا نەمانەوێ دەمانگەینێتە ڕەفتارێکی داهێنراو)[18]. ئەم جۆرە ئەدەبە بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لە ئاکامی دیلکردنی سەربەستی هاتۆتە ئاراوە، نموونەی ئەم ( ئەدەبە عەرەبییەی کە لە جیهانی عەرەبیدا زۆرانبازێ لەگەڵ سەهیۆنیزم دەکا، ئەدەبێکی شۆڕشگێڕی مرۆڤایەتییە. ئەو ئەدەبەی کە تەوفیق زیاد و سەمیح قاسم و مەحمود دەروێش و ئەمیل تۆما و ئەوانی تر لە خاکی داگیرکراودا دەینووسن ئەدەبی بەرگرییە)[19]، بەلاّم بەشێکی گرنگی نێو ئەم ئەدەبە (شیعری زیندان) ە، کە ساردی و دوورەپەرێزی و باری دەروونی و جەستەیی و ئازار و چەوسانەوەی زیندانییەکان دەخاتە ڕوو، هەر ئەم خەسڵەتانەشە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی هەستی نامۆیی لای زیندانییەکان، هەرچەندە ناشێ زیندانیکردن و نامۆبوون یەکسان بکرێن، بەلاّم یەکێ لە ئەنجامەکانی زیندانی سەرهەڵدانی هەستی نامۆبوونە لە دەروونیاندا، واتە بەشێکی نامۆبوون پەیوەندی بە زیندان هەیە، نەك هەمووی، چونکە کەسی نامۆبوو مەرج نییە بە ئەزموونی زیندان تێپەڕ بێ. ئەم چەمکە لای ( سەمیح قاسم ۱۹۲۹ / ۲۰۰۹) لە پارچە شیعری (تغریبة) کە پێشکەشی هاوڕێی شاعیری بەرەنگاری و خەبات (مەحمود دەروێش ۱۹٤۱ / ۲۰۰۸) ی کردووە و تێیدا دەڵێ:

**لبیروت وجهان**
**وجه لحیفا**
**ونحن صدیقان**
**سجناً ومنفى**
**قطعنا بلاداً وراء بلاد**
**وها نحن في تعتعات الدوار** ... ( الأعمال الشعریة الکاملة، ص٤٥٢)

لای (سەمیح قاسم) زیندانیکردن و نامۆبوون دووانەیەکن بێ یەکتر هەڵناکەن و هەردووکیان یەك مەدلولیان هەیە، هەرچەندە یەکێکیان دیواربەند و ئەوی تریان بێ دیوار بێت، بەڵام لە رووی کاریگەری دەروونی و هزری لە سەر شاعیر یەکن، بەشێوەیەکی کارەکی هەردوو شاعیرەکە خاوەن هەڵوێست و زۆر بابەتی هاوبەشن، تەنانەت زیندان و تاراوگە هەردووکیانی کۆکردۆتەوە، بۆیە ڕەشماڵی شیعریشیان هاوبەشن، ئەم بارە لای (مەحمود دەروێش) * گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی ئەوە بدرکێنێ کە (جیهانەکەی لە نێو وێنەی ولات، تاراوگە، لە (( ولاتێك لە ئاخاوتن )) دایە و لای عەرەبێکی بێ زەوی و خاك، ولاتێکی لەم چەشنە جگە لە نێو پەرژینی شیعردا نەبێت، بەدی ناکرێت)[٢٠]. ئەزموونی زیندان بە شێوە گشتییەکەی لای شاعیران بەرجەستە کراوە، شاعیرەکان دوو بابەتیان لە یەکتر جیا کردۆتەوە، کە ئەوەی رژێمەکان بەرامبەر کەسی شاعیر دەیکەن وەك رۆشنبیر و خاوەن رۆڵێکی چالاك و کاریگەر لە کۆمەڵگادا تەنیا زیندانیکردنی جەستەیانە نەك بیرو هزر و بیروباوەر ، چونکە ئەمانە بەند ناکرێن، (لەتیف هەڵمەت/ ١٩٤٧) ** لە شیعری (هۆنراوە کۆت ناکرێ) دا دەڵێ:

**حەسحەسەکان جانتاکانم دەپشکنن**
**دەگەڕێن بۆ، بۆ هۆنراوە**
**حەسحەسەکان بەستەزمانن**
**هەتا ئێستاش هەر نازانن**
**گوایە پێیان نەوتراوە**
**گشت هۆنراوە تووڕەکانم**
**لە مێشکمدا حەشارداوە** ... (دیوانی لەتیف هەڵمەت، ب١، ل١٧١ ـ ١٧٢)

( هۆنراوەی تووڕە) ڕەمزی هۆنراوەی یاخی و نیشتیمانی و هەڵوێست ئامێزە، بۆیە مێشك دەکاتە کۆگایەکی بەتین و تێیدا هەڵیاندەگرێت، کە بە هیچ جۆرە پشکنین و گەڕانێك نادۆزرێنەوە، چونکە کەرەستەکانی ماددی نین، بەڵکو مەعنەوین. چەمکی ئەمە لای (هێمن _ ١٩٢١/١٩٨٦ ) لە شیعری (ڕۆژگاری ڕەش) دا دەبێتە مایەی:

**دڕان کاغەز و دەفتەر**
**گیران شاعیر و نووسەر**
**کۆمەڵێك بوون دەربەدەر**
**کۆمەڵێکیش دەسبەسەر** . ........ (تاریك و ڕوون، ل٩٧)

ڕۆژگارەکە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی تەنانەت کاغەز و دەفتەری شیعر و نووسینەکانیشی لە ناو بچن، کە مەبەست لە ناوچوونی ئەو بابەتانەیە کە چاویان هەڵهێناوە و تۆمار کراون، بەڵام لای (لەتیف هەڵمەت) مەبەست تۆمار نەکراوەکانە.

(سەمیح قاسم) لە زیندانیکردنی شاعیردا بە هەمان شێوە پێی وایە کە تەنیا بەندکردنی جەستەیە نەك شتێکی تر، لە شیعری (الشاعر السجین) دا دەڵێ:

**سجنوك ولكن هل سجنوك؟ أيشنق اشراق الفجر؟**
**سجنوك ولكن هل تقوى الجدران على خنق الشعر**
**هل نكبت أرواح ثارت، لتحطم أغلال الأسر**
**هل يخمد بركان النور المتدفق في درب النصر؟**
**فاهتف بالسجان الهاي، جرُ، الهب بسياطك ظهري**
............................................................
**والسجن سيضحى بركاناً يحتاج السراديب الكفر**
**وسامضي كي اطلع فجري، جدرانك لا تنسى سيري..**

(الأعمال الشعرية الكاملة، ص٥)

دێڕەکانی (سەمیح قاسم) هەمووی پرسیاری ڕەوانبێژین، پێویستییان بە وەڵام نییە، چونکە وەڵامەکان لە نێو خودی پرسیارەکان خۆیاندان، دروستکردنی هاوکێشەیەکن بۆ سەلماندنی بێ هێزی زیندان و نەتوانین لە سەر ئەوەی بتوانێ بە تەواوی شاعیر وەك کەسێکی تووڕە و یاخی لە خۆبگرێت و بتوانێ ورەی پێ نەهێڵێ یا بیرو باوەڕەکانی کز بکات.

ئەم سیمایەی شاعیر لە بەرامبەر زیندانیکردن و ئازارەکانی سیمایەکی چەسپاوە و بەهایەکی مرۆڤایەتی و نەتەوەیی لە خۆ دەگرێت و دیوارەکانی زیندانیش دەکاتە شایەدحاڵی خۆی و هاوکێشە و باوەڕە پتەوەکەی. ئەم

ئەزموونە لای (مارف عومەر گول) لە شیعری (لاپەڕەیەك لە پەیامی زیندانییەك)دا كە بیرەكەی لە زیندانا لە ١٩٨٢ لە كەركوك داڕێژراوە، ئەوەی ئەم دەقە لە دەقەكانی تر جیا دەكاتەوە ئەوەیە كە شاعیر لەم دەقەدا گشتگیرییەكی بە چەمكی ئەزموونی زیندان بەخشیوە، بە هۆی ڕاناوی كەسی سێیەمی تاك (ئەو)، لە ڕاستەوخۆیی و شێوازی دواندەری دووری خستۆتەوە و دەڵێ:

**ئەوەی بە ڕووی سبەینێدا پێ بكەنی**
**ئەوەی لە ڕووی بێدادییدا دەس هەڵبڕێ، بچریكێنی**
**پێی دەزانن، بە ڕۆژ بە چ شەقامێكدا دێت و دەچێ**
**بە شەو لە كوێ، ئارام دەگرێ،**
**ڕۆژێك بۆی دێن،**
**دەستەكانی لە كەلەبچە و زنجیر دەنێن**
**لە زیندانا لە پێخەفی ئێشی دەگرن**
**وای لێ دەكەن،**
**دەست و قاچی وەك یەك بمرن** .......... ( خۆری زیندان، ل١٣ )

ئەمانە دەربڕینی ڕاستەقینەی ئەو كەشە گشتییەن كە لە ژێر حوكمی بەعسدا كوردستانی تێدا دەژیا، كەسی كورد لە نێو ترس و تۆقین و گرتن و كوشتن و ..........، هتددا بوون، بۆیە شاعیر واقیعی نێو كوردستان بە گشتی و كەركوك بە تایبەتی خستۆتە نێو دێڕەكانی، دڕندەیی مامەڵەكردنی دەسەلآت بە میللەت دەناسێنێ. هەندێ جار ئەزموون و هەنگاوەكانی زیندانیكردنەكە زیاتر بە شێوەیەكی نامرۆڤایەتی ئەنجام دراوە و دەدرێت، خراوەتە چوارچێوەی شیعر و گوزارشت لە بارەی دەروونی و جەستەیی و پاڵەپەستۆكان كراوە.

(سەمیح قاسم) لە شیعری (الذي قتل في المنفى كتب لي ) دا دەڵێ:

**ذات يوم فاجأوني**
**دفعوا امي واختي جانباً**
**واعتقلوني**
**كالتماثيل الترابية كانوا**
**بوجوه فقدت ضوء العيون**

**يوم جاؤوا فجاة**

**واعتقلوني**

**والدى كان يصلي**

...........................

**وبعيداً اخذوني**

**ومع القمة فى بعض السجون**

**ضفروا لي الشوك**

**لكني**

**ظل مرفوعاً جبيني**

**فركوا بالرمل والملح جراحي**............ ( الأعمال الشعرية الكاملة، ص٩٢ )

زنجیرەی گێڕانەوەکانی شاعیر لەم دەقەدا پلەییە، هەموو هەنگاوەکانی ئەزموونەکەی خستۆتە ڕوو، ناونیشانی شیعرەکەی (ئەو کەسەی لە تاراوگەدا کوژرا بۆمی نووسی) هەر شاعیر خۆیەتی کە بەشێکی ژیانی لە تاراوگەدا بووە، بەڵام بۆ ئەوەی جوانییەکی زیاتر بە دەقەکە ببەخشێ، گێڕانەوەکەی خستۆتە قاڵبی (ئەو)، ئەمە لای ( لەتیف هەڵمەت ) ڕاستەوخۆ بە هۆی (ئەگەر) دەربڕاوە، بەڵام ئەو ئەگەرە پێشینەیەکی ئەزموونی لە خۆ گرتووە ئەویش بریتییە لەوەی شاعیر ئەم جۆرە مامەڵەکردنەی لەگەڵ ڕۆشنبیر و شاعیر و کەسانی کوردی نێو نەتەوەکەی کردووە، ئەم دەربڕینانەی شاعیر لە بۆشاییدا دروست نەبوون، بۆیە لە شیعری (سێدارە) دا دەڵێ:

**ئەگەر بڵێم : شارەکەمم خۆش دەوێ**

**دەمدەن لە دار**

**ئەگەر بڵێم : یارەکەمم خۆش دەوێ**

**دەمدەن لە دار**

**هەموو ڕۆژێ فیرعەونی شار**

**هەزاران جار**

**دەمدەن لە دار** .......... (دیوانی لەتیف هەڵمەت، ب١، ل٢٧٢)

بارودۆخی کورد شاعیری گەیاندۆتە ئەم ئەنجامە، لێرەدا (ئەگەر)ەکە وەکو ئەگەرەکانی تر نییە، بەڵکو ئەگەرێکی جەخت لەسەر کراوە و شاعیر دڵنیایە لەو سزادانە کە گەورەترین سزایە لە کاتی دەربڕینی سادەترین گوتنی خۆشەویستی بۆ ووڵات و یارەکەی بە سەریدا دەسەپێنرێت. لە کاتێکدا شار و یار لە تایەکی تەرازوودان و خۆشەویستیش لە تایەکەی تر. ئەستەمە ئەم دوو خۆشەویستییە لە یەکتر جیا بکرێنەوە، کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترین، بۆیە (فەلەستین) لای (مەحمود دەروێش) ئەو شوێنەیە کە سەرچاوەی داهێنانەکانیەتی، ئەویٚ وڵات و نامۆییە، خۆشەویست و تاوانبارە، زیندان و سەربەستییە، وڵات و تاراوگەیە[٢١].

لای (هەڵمەت و دەروێش) و شاعیرەکانی تریش وڵات وەکو شوێن جێگەی هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانیانە، بە تایبەتی کە شوێنی هەردووکیان پەیوەستە بە ئازار و چەوسانەوە و داگیرکردن، بۆیە دەبیٚ جەخت لە سەر ئامادەبوونی شوێنی ئەم شاعیرانە بکەینەوە، لە کاتێکدا هەر خۆی بوونیان لەم شوێنانەدا واتە (کوردستان و فەلەستین) بۆتە مایەی بەستنەوەیان بە ئێش و ئازار و نەهامەتی.(مەحمود دەروێش) لە شیعری ( ضباب علی المراة) دا دەڵیٚ:

**لست جندياً**
**كما يطلب مني**
**فسلاحي كلمة**
**والتى تطلبها نفسي**
**اعارت نفسها للملحمة**
**والحروب انتشرت كالرحل والشمس وآه** ......... (انترنيت)

چەکی شاعیر وشەکانێتی، بە تایبەتی کە تاراوگە لە ناخی شاعیردایە، هەرچەندە خۆیشی لە سەر خاکی فەلەستین دۆزیبێتەوە، تەنیا وشە شک دەبات بۆ ئەوەی لە شیعردا دایبڕێژیٚ و بیکاتە ئامرازێکی کاریگەر و پەسەندکراو، بۆ ئەوەی لە بواری ئەو وشانە هەموو شتێك بدرکێنیٚ وەك: تووڕەیی، شکستی، خۆشەویستی، .....هتد.

ئەم چەمکەی (مەحمود دەروێش) لای (قانیع _ ١٨٩٨ / ١٩٦٥) ی شاعیریش ڕەنگی داوەتەوە، کاتیٚ شاعیر لە شیعری (لە بەندیخانەدا) دەڵیٚ:

**چەکی شۆڕشگێڕی من نووسین و بیر و باوەڕە**
**ڕاپەڕینە، هەڵمەتە، پڕ نەعرەتەی کوردانەیە** ...... (دیوانی قانیع، ل٢٨٩)

هەمان کەش و بارودۆخی هاوبەش و نزیک لە یەکتر زەمینەیان بۆ هەردوو شاعیر خۆش کردووە بنیادێکی نزیک لە یەکتریان هەبێت. زیندان بۆتە سەرچاوەیەك بۆ شیعر وتنیش وەك لای (مارف عومەر گوڵ) لە ئاکامی ئەزموونی دوور و درێژی لەگەڵ زیندانلدا بەدی دەکرێت، گەیشتۆتە ئەوەی بڵێ:

**بەڵام خەمی بەندیخانە**
**وای لێ دەکا جار جار شیعرێ بۆ خۆی بڵێ**
**جار جار ستران**
**لە پەناوە بنیشێتە سەر دوو لێوی**
**نەوەك دڵ بە تەنیایی ڕابوەستێ**
**قەت ناتوانێ تاقە شەوێ بە بێ شیعر و بێ گۆرانی**
**چاو لێك بنێ تا بەیانی** .......... (خۆری زیندان، ل١٦)

جۆری ئەزموونە تاڵەکەی زیندان و تەنیایی بەرەو جیهانی شیعر و گۆرانی دەبات، بۆ ئەوەی خەمەکانی برەوێنێتەوە و هەر هیچ نەبێت تۆسقاڵێك ئاسوودەیی بە دەروونی ببەخشێ . ئەمە لای (مەحمود دەروێش) وەکو (لەتیف هەڵمەت) تووڕەیی دەسەلات، نەك تەنیا شاعیر ، شیعریش بەند دەکات ، تا بە جیهانی دەرەوەدا چاو نەکاتەوە، بۆیە لە شیعری (الاغنیة والسلطان)دا دەڵێ:

**غضب السلطان**
**والسلطان مخلوق خيالي**
**قال: ان العيب في المرآة،**
**فليخلد الى الصمت مغنيكم، وعرشي**
**سوف يمتد**
**من النيل الى نهر الفرات**
**اسجنوا هذى القصيدة**
**غرفة التوقيف**
**خير من نشيد وجريدة**........ (روائع من قصائد محمود درويش، ص١٣١)

## بەشی دووەم ـ سیما هونەرییەکانی شیعری زیندان

### ١. فەرهەنگی شیعری زیندان

بزووتنەوەی ئەدەبی زیندان بەگشتی و شیعری زیندان بە تایبەتی بەشداری لە ڕێڕەوی ئەدەبی دەرەوەی زیندان کردووە، بەمەبەستی پێشخستنی ڕۆشنبیری لە هەردوو ئەدەبی کوردی و عەرەبیدا، تەنانەت (سەمیح قاسم) دەڵێ: (سجني وطني، سجني هو عنواني)[٢٢]، بۆیە شیعری زیندان فەرهەنگێکی تایبەت بە خۆی دروست کردووە، ئەم فەرهەنگە لەم تەوەرانە پێکهاتووە:

١ ـ ئەو وشانەی پەیوەندییان بە هەیکەلی زیندان هەیە.

٢ ـ ئەو وشانەی پەیوەندییان بە کەرەستەکانی نێو زیندان هەیە.

٣ ـ ئەو وشانەی پەیوەندییان بە لایەنی دەروونی زیندانییان هەیە.

٤ ـ ناوی زیندانە بەناوبانگ و دیارەکانی جیهان نموونەی (گوانتانامۆ)* و زیندانی عێراق نموونەی (نوگرە سەلمان)** یا ئەو میللەتانەی بە هۆی داواکردنی مافەکانیان چەوسێنراونەتەوە وەك: (کۆنغۆ، ئەریتریا ..... هتد) کورد و عەرەبیش بە تایبەتی فەلەستینی خۆیان بە هاوشێوەی ئەوان زانیوە.

٥ ـ ئەو وشانەی پەیوەندییان بە هێڵی گشتی بابەتەکە هەیە وەك: زیندان، گرتووخانە، بەندیخانە، دیل، دەستبەسەر، کە ئەمانە شایانی سۆز و بەزەیین، یا پاڵەوانێتی نواندن، گەڕانەوە بە سەربەرزی، مانەوە و کۆڵنەدان، ..... هتد. ئەم جۆرە دەستەواژانە کرۆکی گوزارشتکردنی بابەتەکانی زیندانن.

٦_ئاماژەکردن بە هەندێ شاعیر وەك ڕەمزی خەباتی نەتەوایەتی میللەتەکانیان نموونەی (لۆرکا ـ ١٨٩٨/١٩٣٦)و (نازم حیکمەت ـ ١٩٠٢/١٩٦٣)و (بابلۆ نیرۆدا ـ ١٩٠٤/١٩٧٣) کە شیعرەکانیان ڕەتکردنەوەی تێدا بەرجەستە دەکرێت.

هەیکەلی گشتی زیندان کە بەشێکی گەورەی هەیکەلەکەی بەندە بە دەرگا و پەنجەرە و دیواری زیندان، بە تایبەتی (دەرگا) بۆتە ڕەمزێکی سەرەکی چونکە پەیوەستە بە (داخراوی)، پێچەوانەی (پەنجەرە) ڕەمزێکە بۆ (کراوەیی) مەبەست کرانەوەی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو ئەندیشە دەتوانێ شووشەی پەنجەرە ببڕێ و

بچێتە دەرەوە، ئەم وشانە سێکوچکەی زینـدانن، کـە بـە کەشـی تاریکییـەکی لـە ڕادەبەدەر پەیوەست کراون و سیمای تەنیایی دەبەخشن.

(مەحمود دەروێش) لە شیعری (متر مربع من السجن) دا بەم شێوەیە گوزارشت لە (دەرگا) دەکات و دەڵێ:

**هو الباب، ما خلفه جنة القلب، اشياؤنا**
**كل شئ لنا، نتماهى، وبابٌ هو الباب**
**باب الكناية، باب الحكاية، باب يهدب أيلول**
**باب يعيد الحقول الى أول القمح**
**لا باب للباب، لكنني أستطيع الدخول الى خارجي**
**عاشقاً ما أراه وما لا أراه**
**أفي الأرض هذا الدلال و هذا الجمال و لاباب للباب؟**
**زنزانتي لا تضيْ سوى داخلي**
**وسلام على، سلام على حائط الصوت**[٢٣]

چارەنووسیان بەندە بە (دەرگا )وە ، هەموو دەلالەتەکان پێیەوە پەیوەستن. (کامەران موکری ١٩٢٩ /١٩٨٤) ڕاستەوخۆتر لە (مەحمود دەروێش) گوزارشـت لـە دەرگا دەکات و لە شیعری (نابەزین) دا دەڵێ:

**بیکەرەوە دەرگای ڕەشی زیندانت**
**دابڕێژە کۆتی قورسی گرانت**
**شوورە بکێشە لە پەنجە و بازوو**
**لە ناو خوێناوا شوورەکەت هەڵچوو** ..... (دیوانی کامەران موکری، ل٣٤٧)

لای (کامەران) تەنیا دەرگا نییە، بەڵکو پەیوەستیش کـراوە بـە (ڕەشـی) کـە ڕەمزی نائومێدی و خەم و نەهامەتییە، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر بـەم دەرگـا ڕەشـە ڕەشبین نییە، بۆیە دوژمنی سەربەست کردووە کە چـی دەکـات بیکـات. تۆزقاڵێـك کاریگەری لە سەر بیر و باوەڕی نابێت. (مزەفەر نواب/ ١٩٣٤) کە تاقیکردنەوەی زیندان بەرجەستە دەکات، لە (وتریات)دا ئاماژە بەو دەرگایە دەکات کە بۆتە هۆی دابڕینی لە خاکی ولاتەکەی و دەڵێ:

**في العاشر من نيسان بكيت على باب الأهواز***
**فخذاي تشقق لحمهما من أمواس الليل**
**أخذت حشائش برية تكتظ برائحة الشهوة**
**أغلقت بهن جروحي لكن الناموس تجمع في الفردوس المشدود**
**كنذر فى رجلي**
**ناديت : اله البر يستكشفونني**
**وسأقتل فى البر الواسع**
**والريح على أفق البصرة تذروني**
**ويد الطين تمسح عن جبهتي المشتاقة، نيران جنوني**
**في العاشر من نيسان نسيت على أبواب الأهواز عيوني**[٢٤]

(دەرگـای ئـەهوان) ڕەمـزی ماڵئـاوایی لـە نیـشتیمان و ژیـان لـە ئـاوارەیی و تاراوگەیە، بۆیە پێش ئەوەی پێ بنێتە ناو خاکێکی تر چاوەکانی لە بەردەم ئـەم دەروازەیە جێ دەهێڵێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کـە چـاوەکانی لـە خـاکی ولاتـە و هـیچ خـاکێکی تـر نـاتوانێ تامـەزرۆیی شـاعیر بـۆ نیـشتیمانەکەی تێـر بکـات، بـە تایبــەتی تامــەزرۆیی و بیرکردنــی ولاتــی دارخورمــا، ئەمــەش شــاعیری کردۆتــە دیاردەیەکی ڕامیاری ناوازە لە شیعری شۆڕشـگێڕیدا (تـەنیا شـاعیرێکی ورووژێنـەر نییە، بەڵکو ڕەخنەگرێکی ڕامیارییە و توانای دانانی نەخـشەی تراژیـدیای عـەرەبی هەیـە)[٢٥]، شـیعرەکانی لـە دەرەوەی دەسـەڵات، دەرەوەی ماسـکە دەسـتکرد و تراویلکەکاندایـە[٢٦]، بۆیـە لـەم دەقەیـدا تاقیکردنـەوەی زینـدانیکردن بەرجەسـتە دەکات.

(گۆران _١٩٠٤/ ١٩٦٢ ) لە شیعری (زیندانی ئەژدەهاك) کە لـە سـلێمانی لـە ساڵی ١٩٥٣ نووسیویەتی، (ئەژدەهاك) ی کردۆتـە ڕەمـزی دڕنـدەیی و سیـستەمی فاشیزمی ئەو سەردەمە، تێیدا دەڵێ:

**ئەژدەهاك : زیندانت قەڵا، قەڵایە**
**دیواری کۆنکرێت، دەرگای پۆڵایە**
**ئەژدەهاك کون بڕە، سەختە زیندانت**
**ناڕووشێنێ بە بڕبەن بەندی گرانت**

**هێزی لەش مرێنە کۆت و زنجیرت**
**کارییە لە دەمار ناپاکی بیرت** ..... (سەرجەم بەرهەمی گۆران، ل٢٦٨)

(ئەژدەهاك) بەشێکە لە مێژووی کورد و پەیوەستە بە ڕزگاری نەتەوە لە زوڵم و زۆرداری، شاعیر ئەم بەشەی مێژووی گێڕاوەتەوە بۆ ئێستای خۆی و ئەو دەسەڵاتەی پێ تەشبیه دەکات کە فەرمانڕەوایی وڵات دەکات، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەستەکانی ناوەوەی ئاڕاستە دەکات.

ئەو وشانەی پەیوەندییان بە کەرەستەکانی نێو زیندان هەیە، زیاتر ئەو وشانەن کە بە هۆیەوە سەربەستییەکانی زیندانییانی پێ بەند کراوە، وەك: (زنجیر) یا (کۆت و زنجیر) یا (کەلەپچە)

- **زنجیری سەر بەندیخانە**
**ڕەشاشی دەستی بێگانە** ...... (ئەحمەد هەردی، کاروانی شیعری...، ل١٤١)

- **گەورەم ئەی ئاغای خاوەن**
**زنجیر و کۆت و پێوەن**...................... (ع.ح.ب، ناسۆری دەروون، ل٤٤)

- **منێکی دیل و یەخسیر**
**هاودەمی کۆت و زنجیر**
**کۆتی دەست و دەم و پێم**
**زڕەی نابڕێ لە گوێم** ............ (کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری ...، ل١٩٤)

- **ئەوا زنجیر، ژووری تاریك، تارمایی زیندان**
**هاودەنگە و مۆسیقامە بۆ شەوی لێدان** ..... (دیلان، کاروانی شیعر، ل ٢٩)

- **زیندانم پڕکە لە کۆڵدان**
**زنجیری پێ**
**کپ بە تاوێ وەك لۆکەی گوێ** ................ (گۆران، دیوانی گۆران، ل٢٨٠)

**. با بۆم شەپۆڵ دات تاریکی مەنگت**
**ئەی زنجیر بابێت، لە پێما دەنگت** ...(کامەران موکری، دیوانی کامەران، ل٣٤٧)

**. گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە**
**تۆپ و شەستیرو کەلەپچە لام وەکو ئەفسانەیە** ... (دیوانی قانیع، ٢٨٩)

**. با بێت قامچی و دار، بەن لە تەختی پشت**
**بە فەن ئەو گۆشتەم بۆ بکەن برشت**
**کوا قامچی کوا دار کوا زرەی زنجیر**
**کوا خوێن، کوا سزا، کوا نرکەی ئەسیر؟** .. (دیوانی کامەران موکری، ل٣٤٧)

ئەمانە تەنیا چەند نموونەیەکن کە هەموویان گوزارشت لە زنجیر یا کۆت و زنجیر دەکەن و هەموویان لە سەر ئەوە کۆکن کە زنجیر نابێتە پێوەری کۆڵدان و وەستان لە خەبات، ئەمە لە ڕوانگەی شاعیرە عەرەبەکانیش بە هەمان شێوەیە، هەرچەندە جیاوازی لە نێوانیاندا چۆنیەتی دەربڕین و داڕشتنی ئەم جۆرە وشانەیە.

**. أقول للمحكم الأصفاد حول يدي**
**هذي أساور أشعاري واصراري**
**في حجم نعلي، وقيد يدي**
**في طول عمركم المجدول بالعار** ... (محمود درويش، روائع فى قصائد، ص٩٣)

**. تغربت في الوقت و اللون**
**غامرت بين السجون وبين الرؤى والمواني ْ**
**جررت قيود الملوك الصغار**
**رفعت يدي بيرقاً للنهار المفاجيْ** ......
(سميح القاسم، الأعمال الشعرية الكاملة، ص٣٦٨)

**. وأهتف: لم تبق الا بلادي**

**بلادي! يا طفلة امة**

**تموت القيود على قدميها**

**متى نشرب الكاس نخبك** ..... (محمود درويش، روائع في قصائد، ص ١٠٥)

لای (مەحمود دەروێش) کۆت و زنجیرەکە دەبێتە بازنی شیعر و سووربوونی لە سەر هەڵوێستەکانی، (سەمیح قاسم) یش پێی وایە ئەو کۆت و زنجیرانە نەك تەنیا کۆڵی پێ نادەن، بەڵکو دەبنە مایەی بەرزکردنەوەی ئاڵای ڕۆژی چاوەڕوانکراو، کە ڕۆژی ئازادییە، ئەم چەمکە نزیکە لە چەمکی شیعری (لە بەندیخانەدا) ی (قانیع) ی شاعیر کە دەڵێ:

**ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە**

**ئەم کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە**

**زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرزڕەی زنجیر دەکەم**

**سەیری ئەم زنجیرە کەن وەك زێوەری شاهانەیە** .. (دیوانی قانیع، ل٢٨٨)

شانازیکردن بە کەلەبچە و زنجیر لە نێو هەردوو شیعری زیندانی کوردی و عەرەبیدا ڕەنگیان داوەتەوە، کە بە هۆیەوە ئاسۆی پاشەڕۆژێکی گەشیان تێدا بەدی کردووە.

بەکارهێنانی جۆری کەرەستەی زیندان و کاریگەری لە سەر دەروونی زیندانییەکە تەواوکەری یەکن، چونکە چەند کەرەستەکان دڕندەیی و ئازاری زیاتریان هەبێت، هێندە بارە دەروونییەکە قورستر دەکات، هەرچەندە ئەم کەرەستانە بە گشتی بوونەتە هاندەری شاعیر و ڕەمزی گەیشتنی بە ئازادی. ئەوەتا (مارف عومەر گوڵ) دەڵێ:

**لە زنجیری هەڵواسین و لە شریتی فەللاقەدان**

**بە دەم ڕێوە دەپرسن**

**لە کەلەبچە و لە کێبڵ و**

**لە کارەبا و لە پەڕۆی سەرچاوەکانم**

**دوای پرسیاری ورد و درشت**

**ئێوە بڕۆن، بۆ سۆراخی دوا هەڵمەتی**

**ڕۆڵەکانی پارێزگاری نیشتیمانم** .......... (خۆری زیندان، ل٣٤)

بـە کەسـکردنی (کەلەپـچە و کێبـڵ و پـەڕۆ ... هتـد) جوولەیـەکی زۆری بـە دەقەکە بەخشیوە. ئەمانە بوونەتە شـایەد حـاڵی شـاعیر لـە کـاتی زیندانیکردنـدا، ئەم جۆرە ئاخاوتنە لەگەڵ کەرەستە بێ گیانەکان و بە کەسکردنیان دەچـێتە نێـو خانەی مەنەلۆژی ناوەوە، کاتێ کەس شك نابات، یا ئەو کەرەسـتانەی کـە مایـەی ئازاری شـاعیرن بـەڵام خۆیـان دەسـتیان لـەو ئـازارەدا نییـە بـەڵکو ئـامرازێکن بـۆ مەبەستی خراپ بـەکار دەهێـنن، کـە دەبێتـە مایـەی ئـازاری ئـەوانیش، ئەمـە لای (مەحمود دەروێش) لەمەش زیاتر تێپەڕیوە، کە لە شیعری (عن انسان) دا دەڵێ:

**وضعوا على فمه السلاسل**
**ربطوا يديه بصخرة الموتى**
**وقالوا: أنت قاتل**
..............................
**أخذوا طعامه و الملابس و البيارق**
**ورموه في زنزانة الموتى**
**وقالوا : انت سارق**
**أخذوا حبيبته الصغيرة**
**ثم قالوا : أنت لاجيْ**
.......................
**يا دامي العينين و الكفين**
**ان الليل زائل**
**لا غرفة التوقيف باقية**
**ولا زرد السلاسل**
**نيرون مات، ولم تمت روما**
**بعينها تقاتل**
**وحبوب سنبلة تجف**
**ستملأ الوادى سنابل** ........ (محمود درويش، روائع في القصائد، ص١٢ ـ ١٣)

دانانی زنجیر لەسەر دەم، ئەوپەڕی بەستنەوەی ئازادییەکانی تاکە کەسە، بە دروستکردنی تاوانێکی دیاریکراو تا ئازادییەکەی ببەستنەوەو داگیری بکەن، بـەڵام

ئەم جۆرە پلانانە تا سەر نابێت، شاعیر بەرچاو روونە لەوەی زۆرداری پەتێکی کورتە و دەپسێ و نامێنێ و لە کۆتاییدا تەنیا ڕاستییەکان دەمێننەوە.

ئازاری دەروونی سەر زیندانیی لای (مارف عومەر گول) بە وردی گوزارشتی لێکراوە، کە لە شیعری (خۆری زیندان) دا هاتووە:

**جەللادێك هات**
**سەربەرەو خوار هەڵی واسیم تا بەیانی**
**کە ڕۆژ بۆوە**
**لە جیاتی ئاو، لە جێی هەتاو**
**جنێودان بوو ژووری زیندان**
**لەبەر بۆنی میزی دیلی پێش من هێنراو**
**ئینسانی وەك چیای ئەویست** ..........(خۆری زیندان، ل٢٧)

ئەم دیمەنانە لای (مەحمود دەروێش) لە نێو جەستەیدا بەدی دەکرێت، بە هۆی زۆر ژیانی لە نێو زیندان و چەشتنی ئازارەکانی نێو زیندان، بۆیە لە شیعری (موت آخر، و احبك) دا دەڵێ:

**الى اين اذهب ؟**
**وان السنابل تنضج تحت عروقي**
**وان منازل مهجورة في تجاعيد كفي**
**وان السلاسل تلتف حولي**
**وليس الامام امامي**
**وليس الوراء ورائي**
**كأن يديك المكان الوحيد**
**كأن يديك بلد**
**آه من وطن في جسد**[٢٧]

وڵاتی شاعیر بە هۆی وێرانەیی و شوێنەوارە پڕ ئازارەکانی لە نێو جەستەیدایە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نەك تەنیا ئاگاداری ئازارەکانی وڵاتەکەیەتی، بەڵکو لە ناخی خۆیشیدا هەڵیگرتوون، ناخی پڕ لە ئازار کردووە،

هـەردوو ئازارەکـە بوونەتـە تەواوکـەری یـەکتری و بـارە دەروونییەکـەی سـەختتر کردووە.

وشەکانی (جەللاد، قەفەس، ئازاد، ئەشـکەنجە، زولـم و زۆرداری، خوطـام*، چەوسانەوە، گارد، سندم، لغاو، .... هتد) زۆرترین وشەی پێکهاتـەی شـیعرەکانی زیندانن.(گۆران) لە شـیعری (دوا سـەرنج) بابـەتێکی بـۆ خـۆی دروسـت کـردووە و تانوپۆی ئەم شیعرەی لە سەر چنیوە:

**بەڵام ئەهرەمەنی گەڵای باغ سیسکەر**
**بێزارە لە جووکەی دەنووکی کوردی**
**ڕاوکەری دارستان لە باڵدار پیسکەر**
**جێی چینەی لێ تەنیم بە داوی وردی**
**وا ئێستا ئەبینی گیرۆدەی داوم**
**لە بەردەم جوانێکی وەك تۆی دڵ نەرما**
**لەگەڵ (گارد) لە (پاس) دا ڕاوەستێنرام**
**تا داخی گرانتر خول با لە سەرم** ............ (دیوانی گۆران، ل٢٠٧)

(ئەهرەمەن، ڕاوکەر) ڕەمزی دەسەڵاتن (داوی ورد) پیلانی زیندانیکردنیەتی، ئەمانە ڕۆڵیان لە بنیادی شیعری زینداندا هەیە، هەرچەندە (داو) لە شیعردا بۆ دوو مەبەست بە کارهاتووە:

١ ـ مەبەستی دڵداری
٢ ـ مەبەستی ڕامیاری

(مارف بەرزنجی ـ ١٩٢١ / ١٩٦٣ )** لە شیعری (بولبولێکی ئازاد) دا دەڵێ:

**داو دائەنێی**
**تا بمگری و لە ڕەکەم نێی**
**بە ئارەزووی تۆ بخوێنم**
**من ناخوێنم**
**ئازادی خۆم نادۆڕێنم** ....... (سەرجەمی بەرهەمی مارف بەرزنجی، ل١١٤)

(ڕەکە) بە واتای (قەفەز) دێت، هەمان شاعیر لە کورتە شیعری بێ ناونیشاندا کە لە گرتووخانەی بەغدا لە ١٩٦٣/٣/٢١ نووسیویەتی و دەڵێ:

**. ئەم نەورۆزەش لە زیندانە**

**ژیان نییە، ئەمە ژانە**

**ژانیش سەرەتای ژیانە** ...... (سەرجەمی بەرهەمی مارف بەرزنجی، ل٩٩)

(ژیان و ژان) جێگۆڕکێیان پێکراوە، یا (پەتی سێدارە) ئەو دەستەواژە باو و بڵاوەی شیعری زیندان کە لە پانتاییەکی فراوانی شیعری کوردیدا بە کارهاتووە (پەت و سێدارە)* ش بەشێکن لە پێکهاتەی زیندان و لە ئەنجامی زیندان سەر هەڵدەدا، واتە زیندان پێشینەیەکە بۆ گەیشتن بەم بارە، (دیلان _ ١٩٢٧/ ١٩٩٠) دەڵێ:

**ئاسوودە بن، زەبری زیندان**

**هەڵواسین و پەت و خنکان**

**تەوژمی خەبات لەق ناکا**

**هێزی تێکۆشان شەق ناکا**

**ئاسوودە بن لە کوشتن بێ وەیا مردن**

**ڕیشەی کورد قەت نایە لە بن** .......... (دیوانی دیلان، ل٣٣)

یا:

**با زیندان بێ چرپا و نوێن**

**مۆسیقام بێ دار و جوێن**

**ئەنجام (تیغەکان) ئەسوێن**

**ئەنجام تەناف بێ یا دار**

**گورزی دەستی ستەمکار**.......... (دیوانی دیلان، ٦٠)

یا:

**بەڵام ڕیزەی ئێسکی شەهیدان**

**بەو قەنارانەی هەڵخرا لێمان** .......... (دیوانی دیلان، ل٥٧)

ناوی زیندانە بەناوبانگەکان لە نێو شیعری زیندانندا ڕەنگی داوەتەوە، کە تەنیا لە پشت ناوهێنانی زیندانەکە چەندین واتاو چەمکی دیاریکراو دەگەیەنێت. زیندانیش دوو جۆرە کە زیاتر لە نێو شیعردا بەدی دەکرێت و بریتین لە:

١ ـ زینـدانی ڕامیـاری / زیـاتر سـەر بـە ڕێـڕەوی داگیرکـەرن و لـە دەرەوەی نیشتیماندا بەدی دەکرێت وەك: زیندانی گوانتانامۆ.

٢ ـ زیندانی نەتەوەیی / ئـەو زیندانانـەن لـە چوارچێوەی نیـشتیماندا هـەن و مافەکانی مرۆڤ لە بەر هەر هۆکارێك بێت زەوت دەکەن، بـە تایبـەتی ئەوانـەی دژە بیروبۆچوون و ئۆپۆزسیونن، زیاتر شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیران دەخرێنە نێو ئەو زیندانانەوە، بـەناوبانگترین زینـدانی (بەعقوبـە و نوگرەسـەلمان) کـە پانتاییـەکی فراوانیان لە نێو شیعری کوردی و عەرەبیدا گرتووە.

**بەڵام ئینسانی نشتیمانی دیل**
**پێ بە زنجیر و ژێر دەستە و زەلیل**........ (دیوانی دیلان، ل٨١)

دیلی لە ئاکامی زینـدان سـەر هەڵدەدا، ڕەتکردنـەوەی تێـڕوانین و یاسـاکانی دەسـەڵات ئـەم زیندانانـە دروسـت دەکـات، کـە بـە خـەڵکی نیـشتیمانپەروەر پـڕ دەکرێن، (سەمیح قاسم) واقیعـی (گوانتانـامۆ) ی گواسـتۆتەوە نێـو شـیعرێکی بـە هەمان ناونیشان دەڵێ:

**هنا غوانتانامو**
**وجوه وما من وجوه، وصوت ولا صوت، والوقت لا يعرف الوقت، لاضوء.**
**لا همس**
**لا لمس، لاشئ، لاشمس، ليل**
**وليل يجب النهار**
**وقيد يسمى السوار**
**وقيد دماء و قيد دمار**
**وراء الجدار، وراء الحديد، وراء الجدار**
**هنا قلق، لا يفيق، هنا ارق لا ينام**
**هنا غوانتانامو** .................................. (انترنيت)

(گوانتانامۆ) ی بە هـەموو ئازارەکانیـەوە گواسـتۆتەوە، لـە پـشتی وشـەکانی شاعیر ژیانێکی وەستاوی نیمچە مردوو بەدی دەکرێت.

**٢ . شێوازی هونەری شیعری زیندان**

شیعری زیندان بابەت و مەبەستێکی چالاکی شیعری نوێ و هاوچەرخی کوردی و عەرەبییە، لە ئاکامی گۆڕانکارییەکانی کرۆکی کۆمەڵگا و پەیوەندی نێوان جەماوەر و دەسەلأت و نەك تەنیا نەبوونی دیموکراسیەت لە سستێمەکانی دەسەلأتدار، بەڵکو بەکارهێنانی توندوتیژی و گرتن و لە سێدارەدان و ..... هتد، بەرامبەر کەسی کورد بە گشتی و شاعیر و ڕۆشنبیر و ڕووناکبیران بە تایبەتی، سەری هەڵداوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لە بارە نالەبارەکانی ئەو کاتانە بکات، ڕیتمی ئەم جۆرە شیعرە توندوتیژ و بەرزە، چونکە لە تووڕەیی و یاخیبوون، سەرچاوەی گرتووە، سروشتی زمانەکەی پڕیەتی لە ئاه و ئازار و شکستی و گیانی سەرکەوتن و غەمگینی و خوێن و دەمارگیری و ........ ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی ڕیتمی گشتی دەقەکان بەرزتر بکاتەوە، لە کاتێکدا شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ باری نێو زیندانـدا کە کۆمەڵگایەکی بچووکی مرۆڤایەتین و نموونەی هەمە چەشنی بەسەرهات و کەسێتی هەمە جۆری تێیدا کۆبۆتەوە، کە خاوەن سروشتی جیاوازن.

(سەمیح قاسم) لە شیعری (القاء القبض) دا دەڵێ:

**داهموا المنزل**
**في منتصف الليل**
**وماتوا**
**بعد وضع القيد في زندي**
**ماتوا**
**للأبد..........** (الأعمال الشعرية الكاملة، ص٢٦٤)

هێرشکردنە سەر ماڵ و لە کاتێکی وەك (لە نیوەی شەودا) و گرتن و بردنی ئەم دەستەواژانە پێویستییان بە ڕیتمێکی توند هەیە، ناشێ بخرێتە ناو ڕیتمێکی هێمن، چونکە بابەتێکی درامی پڕ جوولەن، جوولەکانیش ئاسایی نین، جوولەی بەردەوامی تراژیدین، تراژیدیاش هەمیشە جوولەی زیاتری تێدا بەدی دەکرێت، کە لێرەدا بە (مردنی هەتا هەتایی) کۆتایی دێت، چارەسەرێکی تراژیدیتری پێ بەخشیوە، چونکە (مردن) ی بە (هەتا هەتایی) پابەند کردووە، (مردن) خوازەییە نەك ڕاستەقینە.

دەشێ بپرسین ئایا ڕوخسار و شێوازی هونەری ئەم جۆرە شیعرە هاوتەریبی ناوەڕۆك و گیانە پڕجۆشەکەی ئەودیوی دێڕەکانە، لەبەر ئەوەی شیعری زیندان پەیوەندییەکی پتەوی بە واقیعی کۆمەڵگا هەیە و لە ناو جەرگەی ئەم واقیعە هەڵقوڵاوە، ئەمانە وایانکردووە داهێنان لە نێو ئەم جۆرە شیعرە ببێتە مایەی پرس و تێڕامان، بەها جوانناسییەکان تا ڕادەیەك سیمایەکی تر وەربگرن، هەرچەندە گەلێ جار ئەم جۆرە شیعرە لە قسەی ئاسایی و دروشم نزیك دەبێتەوە و زمانەکە دەبێتە زمانی ڕاپۆرت و دواندەری ڕامیاری نەك زمانی شیعری، بەڵام لە وێنەی هونەری و ئاڕاستەی جوانناسیش بەدەر نین. (سەمیح قاسم) لە پارچە شیعری (الجواب) دا ئاماژەی بەو واقیعە تاڵە کردووە کە جۆری شیعرەکانی ناساندووەو دەڵێ:

**جعلوا جرحي دواة**

**ولذا**

**وأنا أكتب شعري بشظية** ..........(الأعمال الشعرية الكاملة، ص١٣٠)

ئەگەر برینەکانی کرابنە مەرەکەب، ئەوا هەر دەبێ شیعرەکانیشی بە تەڵەزم بنووسێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەربڕینی خودی ڕاستەقینەی بارە تایبەتییەکەی شاعیرە، هەڵبژاردنی وشەو و دەستەواژەکانی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەر ئەم زمانە توندەی شیعری زیندانە وای کردووە شیعرەکانی (مزەفەر نواب) (بە سوپایەکی سەربازی چەکداری پیت و وشە تەشبیە بکرێت)[٢٨]. زۆربەی ئاخاوتنەکان یەك لایەنە یا مەنەلۆگە، یا ئاخاوتن و گفتوگۆیەکی بێ وەڵامە، چونکە وەڵامەکە ئاشکرایە و لە نێو خودی گفتوگۆکاندایە، (بێکەس)* لە شیعری (ئەی وەتەن) دا دەڵێ:

**باسی مەحزوونی و کەساسی خۆت نەکەی توخوا وەتەن**

**چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە**

**ماتەمینی تابەکەی، دەی پێکەنە و سەر هەڵبڕە**

**موفتەخیر بە شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە**.....(دیوانی بێکەس، ل١٥)

ئـەم ئاخاوتنـە دەچـێتە نێـو مۆنولـوگی درامـی (Dramatic Monologue) لێرەدا (ولآت) ئەو کەسایەتییە کە لەگەڵ شاعیر کاریگەرییان بە سەریەکەوە هەیە، (مەحمود دەروێش)یش لە شیعری (الی قاتل) مۆنولـۆگێکی درامـی دادەڕێـژێت. لـە ئاکـامی دروسـتکردنی ئاخاوتنێـك بــە زمانحـاڵی (کەسـێکی دوژمـن / کەسـێکی ئیسرائیلی) خۆی دادگایی خۆی بکات وایە، و دەڵێ:

**لو تأملت وجه الغيمة و فكرت**
**كنت تذكرت أمك في غرفة الغاز**
**كنت تحررت من كلمة البندقية وغيرت رأيك**
**ما هكذا تستعاد الهوية .........**[٢٩]

(ولآتی ونبوو) کـە (مـەحمود دەروێـش) و شـاعیرە هاوەڵـەکانی بـە درێـژایی نزیکەی پەنجا ساڵ بە سەرەوە هاواری شیعرییان بۆ گەڕانەوە و دۆزینـەوەی ئـەم ولآتەیە، بۆیە گەیشتۆتە ئەو بارەی ئاخاوتنی وا دروست بکات، کە دوژمنانیش دان بـە هەڵـەکانیان بنـێن و لـە کـارە نامرۆڤایەتییـەکانیان پەشـیمان ببنـەوە، ئـەم مۆنۆلۆگە (ئاخاوتنە یەك لایەنە) لای (سەمیح قاسـم) لـە ئاکـامی تـەنیایی و بێـزار بوونی لە چوار دیواری زیندان دەیگەینێتە ئەوەی بڵێ:

**وقلت يا الجريْ في الزوار**
**حدث، اما لديك عن عالمنا أخبار؟!**
**فانني يا سيدي من حدة**
**لم أقرأ الصحف هنا، لم أسمع الأخبار**
**حدث عن الدنيا، عن الأهل، عن الأحباب**
**لكنه بلا جواب**
**صفق بالأجنحة السوداء عبر كوتي وطار**
**وصحت: يا الغريب من الزوار**
**مهلاً، الا تحمل أنبائى الى الأصحاب**[٣٠]

وەك ئەوەی (منی ڕەها) ی شاعیر ڕێگەی لێ ون بووبێ، هانا بـۆ هـەر شـتێك ببات، کە میوانداری ئەندێـشەی یـا دەروبـەری زینـدان دەکـات، یەخـەی بگرێـت و بیەوێ لەگەڵیدا بدوێت، ئەم ڕێچکەی ئاخاوتنە یەك لایەنییە زەمینەیەکی مێـژوویی دوور و درێــژی هەیــە، هەرچــەندە مــەلێکی دیــاریکراو بــوونی هەیــە، بــەڵام

قسەکردنەکانی شاعیر لە وڕێنە دەچن، چونکە هیچ وەڵامێك بەدی ناکات، لەوانەیە دروست نەکردنی وەڵام بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە باڵندەکەش توانای وەڵامی نەبێت بە هۆی تاریکی و ناخۆشی زیندان و بەرگە نەگرتنی ئەو شوێنە. (هەژار_١٩٢٠ / ١٩٩١ ) لە شیعری (شەوێك لە زیندان) دا دەڵێ:

**ڕمبەی پێلاقە و هەڕەشەی زۆردار شەقەی قامچی و دار تێکەڵ بە هاوار**
**پریشکە و فیشقەی خوێنێکی ئازاد لە دار و دیوار دەنووسێ : هەی داد**

..........(بۆ کوردستان، ل٣٩)

شاعیر لە ژێر کاریگەری (حەللاج) و بەسەرهاتەکەی ئەم دێڕانەی دارشتووە، وەك چۆن خوێنەکەی (حەللاج) نووسیویەتی (من هەقم)، لێرەدا خوێنی ئەو کوردانەی داوای ئازادی دەکەن (هەی داد) دەنووسێت، داوای دادپەروەری و یەکسانی، ...... هتد لەگەڵ جیاوازی ئەوەی (من هەقم) تایبەتمەندی ئاینی هەیە، (هەی داد) ەکەی کورد تایبەتمەندی نەتەوەیی هەیە، ئەم گواستنەوەیە پیرۆزییەکی زیاتری بە دۆزەکە بەخشیوە. ئەو کەم هەتاوەی کە لە زیندان‌دا بەدییان کردووە، وێنەی هەمە جۆری هونەرییان لێ دروست کردووە، لە کاتێکدا بە هۆی سروشتی بابەتەکانی زیندان وێنەی هونەری کەمتر بەدی دەکرێت بە بەراورد لەگەڵ جۆرەکانی تری شیعردا. (مەحمود دەروێش) لە وێنەیەکی ناوازەدا دەڵێ:

**زنزانتي لا تضئ سوى داخلي.........** (انترنیت)

تەنیا ناوەوەی خۆی بە هۆی هیواکانی بە دواڕۆژ ڕووناکە، جگە لەمە هیچ ڕووناکییەکی تر بەدی ناکات، ڕووناکی ناوەوە، ڕەمزە بۆ گەشبینی شاعیر، ئەم وێنەیە لای (مارف عومەر گوڵ) قەبارەیەکی زیاتر لە خۆ گرتووە و دەڵێ:

**هەڵئەلەرزیم، ڕۆژی ساتێك**
**لەپێ هەتاو بە دیواری ژوور سەرمەوە پێدەکەنێ**
**کەلەبچەکەم بە دیواری زیندانەوە وا کلیل بوو**
**چی بکەم دەستم ناگاتە ئەو تیشکی خۆرە**
**لەپێ هەتاو،**
**هیوا و خۆزگە و ئاواتمی پێوە دیارە**
**نەخشەی هەموو وڵاتمی پێوە دیارە** .........(خۆری زیندان، ل١٧)

ڕووناکییەکە لە ناخی شاعیرەوە دەرکەوتووە و لەو کەمە هەتاوەی لە زیندان دەدات، ڕەنگی داوەتەوە بەمەش هاوکێشەیەکی مەزنی لەم وێنەیەدا دروست کردووە، کە لە لایەك (لەپێ هەتاو) و لاکەی تر (نەخشەی هەموو ولآت) لە ئێستادا بەشێکی نەخشەی شاعیر سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە و سیماکانی دیارن، لەوانەیە ئەم پێشبینییەی لە شیعرەکەیدا بەدی دەکرێت، لە داهاتوودا بێتە نێو واقیعی نەتەوەکەی. (مەحمود دەروێش) ئەم ڕووناکییە لە نێو کونی بچووکی دەرگاکە بەدی دەکات، یان لەوانەیە ئەویش لە کلاو ڕۆژنەی زیندان هیواکانی بدۆزێتەوە، لە چوارینەیەکدا دەڵێ:

**أری ما أرید من السجن: أیام زهره**
**مضت من هنا کي تدل غریبین في**
**علی مقعد في الحدیثة: أغمض عیني**
**ما أوسع الأرض، ما أجمل الأرض من ثقب ابرة** ......... (انترنیت)

(کونی دەرزی) چەند بچووکە، هەموو فراوانی زەوی تێدا بەدی دەکرێت، (کونی دەرزی) خوازراوە بۆ هەر کونێکی بچووك کە زیندانی بە دەرەوە دەبەستێتەوە. سێبەری ئەم وێنەیە لای (دیلان) لە شیعری (نیگایەکی شین) ڕەنگی داوەتەوە بەلأم بە شێوەیەکی پێچەوانەیی، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **چنگێکی ئاسنینی ڕەش** | **ڕایکێشاوم** |
| **لە چوار دیواری قووچ و کەش** | **خزێنراوم** |
| **ئەوەندەی کەللە بیژنێ** | **ئاسمان شین** |
| **چاوی وەك کونی سووژنێ** | **پڕ قاروقین** |
| **ئاڕاستەی ناوچەوانم و** | **دوو چاومە** |
| **ڕێگری شیعرەکانم و** | **هەنگاومە**...(دیوانی شیعر، ل١٦٣) |

لێرەدا (کونی سووژن)ە و گەورەترە، شاعیر توانیویەتی هەستی زیندانیکردن لەم وێنانەدا دابڕێژێ کە خۆی (دیلان) یەکێك بوو لەو شاعیرانەی ئازاری زیندانی چەشتووە و کۆسپ و تەگەرە کارەکانی تێکداوە و سەربەستی لێ داگیر کراوە، کە بە ڕوونی لەو شیعرانەی لە بارەی زیندانن ڕەنگیان داوەتەوە. چەمکی ئەو وێنەیە

لـه وێنەکـەی (مـارف عومـەر گـولّ) یـش نزیکـە، هـەردووکیان هیوایـەکی زۆر لـە ڕووناکییەکی کەم بەدی دەکەن، بە پاشە ڕۆژی ولاّتـە چەوساوەکەیان گەشـبینن، هـەردووکیان توانیویانـە وێنـەی هونـەری لـە سروشـتی بابـەتێکی ڕاسـتەوخۆو دواندەرییانە دروست بکەن و دیوی جوانی ئەم بابەتە کرێت و درشـتە دەربخـەن و دژایەتییەکانیش کۆ بکەنەوە.

(مارف عومەر گولّ) لە دروستکردنی وێنەیەکی تری ناوازەدا دەڵێ:

**ئەو پەنجانەی جاران شیعرم پیێ دەنووسی**
**جاران دەستی ئازیزی خۆم پیێ دەگوشی**
**ئێستا بێ هێز بە لەپمەوەن،**
**زەبری زنجیر دایماڵیون**
**مەلوول نوستوون**
**نەك ئێستاكە**
**ئەڵێی لەگەڵ بوونما مردوون** .......... (خۆری زیندان، ل١٨)

پەیوەندی (پەنجە) بە (لەش) ئەوەیە کە پەنجە بەشێکی لەشی مرۆڤە و لێـی جیا نابێتەوە، بەلاّم شاعیر (پەنجـە) ی بـە (نوسـتن) پەیوەسـت کـردووە، جـۆری نوستنەکەیـشی دیـاری کـردووە بـە (مـەلول) ئەمـە ئـەو پـەڕی وردبوونەوەیـە لـە (پەنجـە) و بـاری قورسـی ئـازاردانی پەنجـەکانی شـاعیر لـە زیندانـدا. شـاعیر توانیویـەتی بـە هـۆی ئەندێـشە داهێنەرەکەیـەوە وێنەیـەکی سـەرنجڕاکێش بـۆ پەنجەکانی بکێشێ. زیندان بۆتە سەرچاوە و هەوێن و ئیلهام بەخشی شاعیران بۆ دروستکردنی وێنەی تایبەت بۆ زیندان.(دیلان)* لە دەربڕینی وێنەیەکدا دەڵێ:

**با ئێمەش وەك ئەو گولّ و مێرووە**
**کە بۆ ڕووناکی و گەشە تینووە**
**بۆ گەشەی گوڵی سەربەستی و شادی**
**بۆ هەڵهاتنی ڕۆژی ئازادی**
**ئێمەی بۆ بادەی ڕزگاری تینوو**
**ببین بە خەڵوز، ببین بە سوتوو**(٣١)

(گوڵ و مێروو) و پەیوەندی نێوانیانی کردۆتە نموونەی باڵا، کە چ ڕۆڵێکیان لە نێو سروشتدا هەیەبۆ ئەوەی ببێتە مایەی لاساییکردنەوە و گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە دروستکردنی وێنەیەکی ترسناکی زیندانی (گوانتانامو)، (سەمیح قاسم) دەڵێ:

**تدف رفوف العصافير رعباً، وتخفق أجنحة الموت في فخ اسلاكه الشائكة**
**ويسطوا طنين الذباب على عر الأعين الهالكة**
**وتعلوا على لهب الدم والدمع الخبرة الفاتكة**
**ويهوى الظلام**
**هنا غوانتانامو** ......... (انترنيت)

هەرچەندە دێڕەکانی سەرەتا درێژن، بەڵام قافیەکانی (الشائكة، الهالكة، الفاتكة) ڕیتمێکی پڕ بەهایانی پێ بەخشیوە، وێنەی چۆلەکە لە کاتی باڵ لێکدانیان تەشبیهـ کردووە بە لێدانی ڕیتمێکی غەمگینی لە ئاکامی ترسەوە.

دووبارەکردنەوەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ئەم جۆرە شیعرە، چونکە گیانی بەرەنگاربوونەوە بنیادی شیعری زیندانە، بۆ نموونە (تقدموا، تقدموا) یا (لاننا، لاننا) یا (ظلام، ظلام) یا دووبارەکردنەوەی ڕستەیەکی دیاریکراو وەك: (دهم اليهود بيوتكم، دهم اليهود بيوتكم) ئەم دووبارە کردنەوانە یا لە سەرەتای شیعرەکەدا دەبێت، بە مەبەستی دەستپێکردنێکی پتەو و کردنەوەی دەروازەیەکی بەهێز بۆ سەرنجڕاکێشانی وەرگر. یا لە ناوەڕاستەکانی شیعردا دەبێت بە مەبەستی وردبوونەوەی وەرگر و وەستان و لێك دانەوە و تێڕامانی بابەتەکە وەك هەنگاوێك بۆ چوونە نێو ڕووداوەکە، یا لە کۆتایی دەبێت بە مەبەستی قورسایی خستنە سەر کۆتایی کە تاقە شتە زیاتر لە نێو بیری وەرگردا بچەسپێ و بمێنێتەوە.

بۆ نموونە (سەمیح قاسم) لە کۆتایی شیعری (غوانتانامو) دا دەڵێ:

**كفى غوانتانامو**
**كفى**
**كفى**
**كفى**....... (انترنيت)

یا ئـەو کاتانـەی بیرۆکەکـە لـە شـێوەی پرسـیاردا دادەڕێـژرێت، سـێ بەشـی پرسیارەکە یەکن، تەنیا یەك وشە گۆڕانی بە سەردا دێـت، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ئەوەی ڕیتمی پارچە شیعرەکە دیارتر بێت، بۆ نموونە:

**الى اين يمضي السلام؟**

**الى اين يمضي الكلام؟**. . (سميح قاسم، انترنيت)

(هێمن) لە شیعری (دواڕۆژی ڕووناك) دا دەڵێ:

**هەزار لاوی لە بەندیخانەدا مرد**

**هەزار پیاوی تەنافی خرایە ئەستۆ**

**کوڕی کوردی لە خوێنی خۆی دەگەوزێ**

**کچی کوردی سەری کردبووە ئەژنۆ**.......... (تاریك و ڕوون، ل٦٥)

پێویستی بیرۆکەی شیعرەکە ئەمـەی خواسـتووە وشـەکانی (هـەزار، کـوردی) دووبارە بکرێنەوە ئاوازی شیعرەکەی ڕێکوپێکتر کردووە.(گـۆران) لـە شـیعری (لـە زیندانا چواردەی تەمموز) دەڵێ:

**دەنگێکی دوور**

**دوور ئێجگار دوور**

**بە ئاستەمێك ئەگاتە ژوور**

**ئەی دەنگی دوور**

**بە ئاستەمێك ئەگەیتە ژوور**

**ئاخۆ سپیت، یان ڕەش، یان سوور؟** .... (دیوانی گۆران، ل٢٨١)

دووبارەکردنەوی (دەنگێکـی دوور) یـا (بـە ئاسـتەمێك ئەگاتـە ژوور) شـێوازی فەرمانەکـەی گۆڕیـوە بـۆ (بـە ئاسـتەمێك ئەگەیتـە ژوور) لـە ناڕاسـتەوخۆیی بـۆ ڕاستەوخۆیی، ئەمانە گشتیان بە تەنیا دووبارەکردنەوەیەکی ئاسـایی نـین، بـەڵکو ڕیتمـی کـردار و جوولـەی نێـو شـیعرەکە دەگـۆڕن و چـالاکییەکی زیـاتری پـێ دەبەخشن.

یا لە شیعری (گەڕانەوە لە زیندان)* دا دەڵێ:

**دەرچووم، دەرچووم**

**بەندم پسان** .......... (ديوانى گۆران، ل٤٤٠)

هەندێ جار دووبارەكردنەوەى وشە هاوواتاكان دەبێت، بۆ تۆكمەكردنى بيرۆكە دارێژراوەكە و جەختكردن لە سەر بابەتەكە، بۆ نموونە (بێكەس) دەڵێ:

**بەو خوايەى بێ شەريك و لامەكان و واحيدە**

**عەشقى تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگرى كردۆتەوە**

**ئاگرێكى وا هەزار ساڵ ئاوى بڕژێنيتە سەر**

**قەت گڕ و كڵپە و بڵێسەى تا ئەبەد نەكوژێتەوە** ...( ديوانى بێكەس، ل١٥)

وشەكانى (بێ شەريك، واحيد) و (گڕ، كڵپە، بڵێسە) جەختكردنەوەن لە سەر بارى دياريكراوى نێو وێنەكان.

(ديلان) لە شيعرى (گەشتێ) وێنەيەكى لە هاوبەشى خەمەكانى خۆى و (بولبول)دا بەراورد دەكات و دەڵێ:

**ئەى بولبولى شەوان بێدار تا بەرى بەيان**

**تۆ بۆ من و منيش بۆ تۆ ئەبين بە نيشان**

**ئەوا ئێستا پێچەوانە من لە جياتى تۆ**

**لە قەفەسدا ئێشكچێتيم گرتۆتە ئەستۆ** .......... (ديوانى شيعرى، ل١٦٠)

(ديلان) ى شاعير ڕێگاى تێكۆشان دەگرێتە بەر، خۆى بۆ ئەوەش ئامادە دەكات. كە ئارەقى لە پێناودا بڕێژێ و سزا و ئازارى ژوورە تاريكەكانى زيندان، هەرگيز نەتوانن لەو ڕێگايە دوورى بخەنەوە، جا بۆيە بڕوا بوونێكى تەواو بەهێز و تواناى گەل لاى شاعير سەر هەڵئەدات[٣٢]. بۆيە زۆربەى جار بە (فرمانى داخوازى) لەگەڵ دوژمنانيدا دەدوێت، لە شيعرى (قوربانييەكانى نەتەوە) دا دەڵێ:

**بيخەرە گەردن، پەتى جەڕراوت**

**بيخەرە سەر پشكۆ نێچيرى ڕاوت**

**گيركە لە جەستە نينۆكى سوورت**

**بيخەنە ژوورى تاريكى زيندان**

**شەبەق بخەرە جێگە قەپ و دان**............(ديوانى شيعر، ل٧٣ ـ٧٤)

فەرمانەکانی (بیخەرە، بیگەیێنە، بیخەنە، .......) بەکارهێنانی ئەم جۆرە کردارانە دەلالەتی چاو نەترسی و ئازایەتییە لە بەرامبەر دوژمندا نیشانی دەدات، بوونی ئەم فرمانانە بنیادی شیعرەکە پتەوتر دەکەن و هێزی سەرەکی نیشتیمانپەروەرانیش دیاری دەکەن. کە شیعری (قوربانییەکانی نەتەوە - نموونەیەکی ڕوونی ئەو ڕۆژانەن کە بە هەزاران نیشتیمانپەروەر ئەخزانە زیندانە تاریك و نووتەکەکانی ڕژێمی پاشایەتی بۆگەنەوە و بەسەدان ئازادیخوازیش هەڵئەواسران تەنها لە سەر ئەوەی ئەندامێکی بە وەفای کاروانی سەربەستی و ئازادی بوون)، [٣٣](دیلان) زیاتر گرنگی بە فەرمانی داخوازی داوە.

(گۆران) لە وێنەیەکی زیندووی دواندنی (با) لەگەڵیدا* دەڵێ:

**لە لێشاوی غەڵبە غەڵبا**
**بانگێکی دا گوێچکەم (با):**
**ڕژێمی جەمهوری بژی؟**
**خەو ئەبینم، جەمهوری چی؟**
**نەء، خەو نییە**
..........................
**ئەم دەنگ و مژدەی دوورییە**
**سا لەشی زیندانی مردوو**
**بێرە سەما**
**ئەی لە بستێ گۆڕا زیندوو**
**مردن نەما** .......... (دیوانی گۆران، ل٢٨١)

شاعیر هەواڵی گۆڕینی ڕژێمی لە زینداندا پێگەیشتووە (لە پاشایەتییەوە بۆ کۆماری) بەلأم خستوویەتیە قالبی دواندنی (با)، بەمەش بەهایەکی زیاتری پێ بەخشیوە و لە ڕاستەوخۆیی دووری خستۆتەوە. (گۆڕ) ی خواستووە بۆ زیندان، (مردن نەما) دەلالەتی نەمانی چەوسانەوە و ئازاردانی نێو زیندانە کە بە مردنی چواندووە.

لە شێوازی ئەم جۆرە شیعرەدا دژایەتییەکان بە شێوەیەکی فراوان بەدی دەکرێن، چونکە سەرچاوەی ئەم جۆرە شیعرە خۆی لە بنەڕەتدا ململانێی نێوان

دژایەتییەکانە چەشنی (دیلی × ڕزگاری)، (چەوسانەوە × سەربەستی) .......... هتد.

وەك (هەژار) لە شیعری (هەر کوردم) دا دەڵێ:

**بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم لە خاکی عەرەب لە ئێران و ڕۆم**
**کۆك و پۆشتە بم، ڕووت و ڕەجاڵ بم کۆشکم دە قات بێ، وێرانە ماڵ بم**
**ئازا و ڕزگار بم شادان و خەندان یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان**
............................ ............................
**کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان سەر لە پێناوم گیان لە سەر دەستان.**

(بۆ کوردستان، ل١)

سەرتاپای وشەکانی دێڕە شیعرەکانی (هەژار) دژ یەکن، بۆ ئەوەی بەراوردی دوو باری جیاواز بکات و تا ئەو ئەنجامە دیاری بکات یا خۆی بگەیەنێتە ئەو ئاکامەی خۆی دەیەوێت.

دەربەدەری × ماڵی خۆم
کۆك و پۆشتە × ڕووت و ڕەجاڵ
کۆشکی دەقات × وێرانە ماڵ
ئازا و ڕزگار × زنجیر لە مل
شادان و خەندان × سووچی زیندان

شاعیر بە تەواوی سنووری دژیەکەکانی دیاری کردووە و توانیویەتی هاوکێشەکەی هاوسەنگ بکات، لە کاتێکدا هەموو شێوازەکانی هونەر و دەربڕینی هونەری شێوەیەکە لە شێوەکانی بەرگریکردن و بە کارهێنانی ئەم شێوە دەربڕینە بۆ پاراستنی خود و لایەنە مرۆڤایەتییەکەی و مانەوەی لە چوارچێوە جوگرافیاییەکەی چاوی لە سەر هەڵهێناوە و بۆتە بەشێك لەو خودە و لێی جیا نابێتەوە.

## ئەنجامەکان:

- زیندانیکردنی ڕامیاری یەکێکە لە کارەکانی بەرگری مرۆڤایەتی، ئەدەبی زیندان ئەدەبێکی مرۆڤایەتی بەرەنگاربوونەوەیە، ئەگەر چی سەرچاوەی ئەم جۆرە ئەدەبە واقیعی کۆمەڵگا و بابەتی ڕامیاری و بەرەنگارییە، بەلآم ویست و داهێنانی شاعیریشی تێدا بەرجەستە دەکرێت.
- ئەو شاعیرانەی خۆیان زیندانی کراون و شیعریان لە بارەی ئەو کاتە نووسیوە سەرکەوتووترن لەو شاعیرانەی کە تەنیا شیعریان لە بارەی زیندان نووسیوە و خۆیان بە شێوەیەکی کارەکی زیندانی نەکراون.
- شیعری زیندان لای شاعیرە کوردەکان پەیوەستە بە ئازارێکی زگماکی نەتەوەیی، پارچە پارچە بوون و چەوسانەوە، کە لای شاعیرە عەرەبەکان تەنیا ئازاری چەوسانەوەیە.
- خەونەکان لە چوارچێوەی زینداندا لای شاعیرە کوردەکان زیاتر گیانێکی پڕ جۆششی پێ بەخشیون، پێیان وا بووە کە زیندان بەرهەمێکە و چاندوویانە لە دوای ئازادکردندا بەرهەمەکەی دەدروونەوە.
- هەندێ تێکست شێوازی ئازاردانێکی دڕندەیان خستۆتە ڕوو، هەندێکی تر ڕەنگدانەوەی کاتی زیندان و ڕەوشی زیندانییەکانن دوای ئازادکردنیان.
- ڕۆشنبیران (شاعیرانیش دەچنە ئەو خانەیەوە) زیاتر هەستیان بەو کاتانە کردووە وەك ئەوەی لە بازنەیەکی بەتاڵ بسووڕێنەوە وایە، چونکە هەست دەکەن نەك تەنیا خۆیان بەڵکو هەستەکانیشیان بەند کراوە.
- زیندان پاڵنەرێك بووە بۆ نووسین، بۆ داهێنان، لە هەندێ باری تایبەتدا، دوای ئازادکردن بەم شێوەیە نەبووە.
- لە شیعری عەرەبیدا زیاتر زیندان و نامۆیی بەستراونەتەوە بە یەکترو وەك دووانەیەك دەربڕاون، بەلآم لە شیعری زیندان لە کوردیدا گیانی یاخیبوونەکە بە سەر نامۆییەکەدا زاڵە.
- هەرچەندە ناشێ بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ زیندان و نامۆبوون بکەین، ئەگەرچی بەشێك لە هەستی نامۆبوون لە شیعری زینداندا بەدی دەکرێت، بەلآم مەرج نییە تەنیا لە ئاکامی زیندانیکردنی ئەم هەستە سەر هەڵبدات، چونکە نامۆبوون

بابـەتێکی سـەربەخۆیە و هۆکـاری تایبـەت بـە خـۆی هەیـە کـە زینـدانیکردن هۆکارێکی دروستبوونی ئەم بارەیە.

ـ شـیعری زینـدان جیـا لـە هـەموو جۆرەکـانی تـری شـیعر لـە دەربڕینـدا سـادە و سـاکارە، تێڕوانینـەکان ڕوون و ئاشـکران، خێراتـریش جـەماوەر بـۆ لای خۆیـان کێش دەکەن، واتە هێزێکی موگناتیسی زیاتریان تێدا بەدی دەکرێت.

ـ شیعری زیندان لای شاعیرە کورد و عەرەبەکاندا گواستنەوی وێنەی ڕاستەقینەی واقیعی کۆمەڵگایە، چونکە هەردوو لا (بە تایبەتی کورد و عـەرەبی فەلەسـتینی) زەمینـەی هاوبەشیان لە خەبات و ڕاپەڕین و شۆڕشدا هەیـە، ئەمـەش وایکـردووە زەمینەیەکی هەستی هاوبەشیان لا دروست بکات.

– لـە شـیعری کـوردی و عەرەبیـدا دەستبەسـەری و زینـدانیکردن دوو تـای هاوکێشەیەکن و هاوواتای یەکترین.

ـ شـوێن (کوردسـتان و فەلەسـتین) ئامـادەبوونی بـەردەوامیان هەیـە و تـەوەری هەموو ئازار و ئەشکەنجەدانن، چونکە مەڵبەندی چەوسانەوە و داگیرکردنن.

ـ لەو دەقانەدا هەموو شـتەکان پـڕ هیـوا و زینـدوو و چالاکن، چـونکە ئامـانجێکی گەورەیان لە پشتە ئەویش ڕزگاری و سەربەستی نەتەوەییە، لە پاڵ باسـکردنی ژیان لەو دیوی دەرگاکانەوە، کە ڕوویەکی تری چەشنە ژیانێکی تری تێدا بـەدی دەکرێت و پاڵنەرێکە بۆ ژیانی دەرەوەی دەرگاکان.

## سەرچاوەکان

– **بە زمانی کوردی/ أ–کتێب**


ـ ئەبوبەکر خۆشناو، شیعری بەرەنگاری کوردی (١٩٧٥ ـ ١٩٩١)، چاپخانەی ڕووناکبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢.

ـ بورهان قانیع، دیوانی قانیع، شاعیری چەوساوەکانی کورد، چ٢، چاپخانەی دالاهۆ، تەهران، ١٣٨٥.

ـ دڵشاد عەلی، دیلان ـ شاعیر و ئازادیخواز، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨١.

ـ دیوانی بێکەس، (ڕێکخستن و ئامادەکردنی ـ ئومێد ئاشنا، سنە، ئێران، ٢٠٠٨.

ـ دیوانی دیلان، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٦٩.

ـ دیوانی لەتیف هەڵمەت، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

ـ عەبدوڵلا عەزیز خالید (ئامادەکردن و لێکوڵینەوە و پێشەکی و پەراوێز نووسین)، دیوانی شیعر، محەمەد ساڵح دیلان، مطبعة سومر، بەغدا، ١٩٨٧.

ـ عەبدوڵلا عەزیز خالید (پێشەکی نووسین و پەراوێز لێدان)، دیوانی کامەران موکری، ١٩٨٧.

ـ عەبدوڵلا یاسین عەلی ئامێدی (د)، هۆنراوەی بەرگری لە بەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا (١٩٣٩ ـ ١٩٧٠)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

ـ کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی حسام، بەغدا، ١٩٨٠.

ـ مارف عومەر گوڵ، خۆری زیندان، چ٢، چاپخانەی شەهید سەیدا ساڵح یوسفی، بناری قەندیل، ١٩٨٧.

ـ مامۆستا جەعفەر، ڕێبوار حەمە تۆفیق، گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی حەمەی، سلێمانی، ٢٠٠٧.

ـ محەمەد حوسێن بەرزنجی ( ع.ح.ب )، چاپخانەی سلمان أعظمي، بەغدا، ١٩٦٨.

ـ یاسین عومەر، ئەزموون (شێرکۆ بێکەس) (١٩٨٥ ـ ٢٠٠٠)، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

**به زمانی عەرەبی/ أ_كتێب**

- القرآن الكريم
– أحمد عبدالعزيز (د)، قضية السجن والحرية في الشعر الأندلسي، القسم الأول (الدراسة والنص)، مكتبة الانجلوا المصرية، القاهرة، ١٩٩٠.
– سالم المعوش(د)، شعر السجون في الأدب العربي الحديث والمعاصر، ط ١، دار النهضة العربية، بيروت، لبنان، ٢٠٠٣.
- سامر محي الدين أمين (اعتنى به ووضع حواشيه)، روائع من قصائد محمود درويش، (حياته – شعره)، ط ١، دار كنوز المعرفة للنشر والتوزيع، عمان، الاردن
- سميح القاسم، الأعمال الشعرية الكاملة (الشعروالسربيات)، الدار الوطنية للنشر والتوزيع، بغداد، ٢٠٠١.
ـ ليليان هيرلاندز، ج. د. بيرسى، ستيرلنج. ا. براون، دليل القارئ الى الأدب العالمي. ترجمة : محمد الجورا، ط ١، دار الحقائق للطباعة والنشر، بيروت، لبنان، ١٩٨٦.
– مصطفى العوجا (د)، التأهيل الأجتماعي في المؤسسات العقابية، دار المنال، بيروت، ١٩٩٣.

**ب_ ئەنتەرنێت**

- ئەدەبی زیندان، ئاسۆی ڕۆژهەڵات (هەفتەنامەیەکی سیاسی گشتییە)، www.asorkama
- عادل الاسطة(د)، وقفة مع محمود درويش في جداريته، نشرة اللقاء في البيان الخليجية، ١٩٨٦/٥/٢٠، انترنيت .
- عمار علي حسين (د)، أدب السجون ـ النزوع للحرية، جريدة الاتحاد، www. alittihad. ae
- ابراهيم درويش، قصائد من غوانتانامو، جدارية. www. Adab. net
- انجليكا نوليفرت، الوطن في المنفى (محمود درويش و پول سيلان)، ترجمة: صبحي حديدي ، مجلة كرمل. انترنيت. www. alkarmel. Org

ـ بسام القادري، القاسم بين الشعر والسياسة. www. Marefe. Org
ـ جاسم المطير، ضرورة توثيق وأحياء أدب السجون في العراق. www.alnas.com
ـ سعدى يوسف، اختلاجات في حضرة محمود درويش، مجلة كرمل، انترنيت.
www. alkarmel. org
ـ شاكر فريد حسن، مظفر النواب، شاعر الرفض والشتيمة السياسية، جدارية، مجلة ثقافية الكترونية تصدر من عدن، دراسات ومقالات، ١٥ اكتوبر، ٢٠٠٩. www. ahewar. com
ـ علي سالم ، الحرية، محاولة للفهم والتعريف , WWW.babil.com
ـ علي ياسين، الشاعر لطيف هلمت. www. almada paper.net
ـ عن الشاعر محمود درويش.www. Free Arabi. com
ـ عن الشاعر مظفر النواب. www. Mothafar Alnuwab blog
ـ محمد ياسين، فلسطين أدب القيد لتوثيق الألم. www.Islam onlion. com
ـ مظفر النواب او النورس الحزين، جريدة الكترونية مغربية مستقلة، ٢٠١٠/٢/٧.
www. Maraypress. net
ـ نزار جاف، كوردية لمظفر النواب www.ofouq.com
-حميد المختار، ابداع السجون وسجون الأبداع. www. Jonon.com
–عمر شبلي، المكان قاب جرح او ادنى. www. JEHAT.com
ـ قاسم حسين صالح، امسية دمشقية مع مظفر النواب، دمشق، ٢٠٠٨/٨/٢٢.
www.ahewar. Org
ـ جابر قميحة(د)، العقاد فى عالم السدود والقيود، ٢٠٠٩/٨/٢٥. – www.auran radio . com
ـ الشاعر طلعت، حوار مع الشاعر الكبير (سميح القاسم)، يوم الاحد، ٢٠٠٠/١١/١٩
www. Marefe. org

## پەراوێزەکان

[١] د. مصطفى العوجا، التأهيل الاجتماعي في المؤسسات العقابية، دار منال، بيروت، ١٩٩٣، ص٣٦.

[٢] د. سالم المعوش، شعر السجون، ص٢٩، له زمانی عەرەبیدا (معتقل) زیندانی خەڵکی سیاسییه و (سجن) بۆ خەڵکانی گشتی و تاوانبارانه، دەشێ خەڵکی سیاسیش له (سجن) دابن، بەڵام له زمانی کوردیدا هەردووکیان هەر زیندانه و به هۆی زیندانی سیاسی جیا دەکرێنەوه .

* له ئایەتی (٢٥) ی سورەتی (یوسف) دا هاتووه(....ما جزاء من أراد بأهلك سوءاً الا ان يُسجن او عذاب أليم) هەروەك له کتێبی (العرائس )ی (ثعلبي)دا هاتووه، که له سەر دەرگای زیندانەکەی (یوسفی ڕاستگۆ) نووسراوه (ئەمە گۆڕی زیندووان و ماڵی غەمگینەکان و تاقیکردنەوەی هاوڕێکان و دڵخۆشکردنی دوژمنەکانه) بڕوانه: منتدى مطر، ادب السجون، ٢٠٠٩/٢/٢، هەروەها زۆر جار به مانەوەی (یونس) پێغەمبەر له نێو نەهەنگەکەدا وەکو زیندانێك دادەنێن، چونکه زیندانیش به واتایەکی تر نەهەنگی سەر زەوییه. بڕوانه: حميد مختار، ابداع السجون وسجون الابداع. www.jonon.com ٢٠٠٩/٨/٢٥ .

[٣] السيوطي، الأوائل، ص٥٤

[٤] د. سالم المعوش، شعر السجون ، ص٣٤.

[٥] د. سالم المعوش، شعر السجون، ل ٢٢٨ ـ ٢٢٩.

* وەك شەهید کردنی مارف بەرزنجی، دڵشاد مەریوانی، عەبدولخالیق مەعروف، شاعیرێکی وەکو: (دڵشاد محەمەد فەتاح) که نازناوی مەریوانییه.(١٩٤٧ ـ ١٩٨٩) که تەنیا به هۆی فێرکردنی ئەلف و بێی لاتینی بۆ قوتابییەکانی له ١٣ی ئازاری ١٩٨٩ که به هۆی دۆزینەوەی بەڵگەنامەیەك لەم بارەیەوه له بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی سلێمانی له ساڵی ١٩٩١دا دۆزراوەتەوه. ئاماژه بەوه کراوه که به تاوانی فێرکردنی ئەلف و بێی لاتینی له سێداره دراوه، بڕوانه: دڵشاد مەریوانی، منتديات من المحيط الى الخليج، ئەنتەرنێت.ئەم دیاردەیه لای عەرەب بەدی ناکرێت جگه له سزای بەندکردن، یا دوورخستنەوه نەبێت.

** پاشا کورد و سەرکردەکان ئەم بابەتەیان لەگەڵ شاعیرانی خۆیاندا به کار نەهێناوه، بەڵکو له ئاکامی خۆشەویستی شاعیران شیعریان بۆ سەرکرده و پاشاکان وتووه، بەتایبەتی ئەمه له لاواندنەوه دەردەکەوێ وەك: نالی بۆ مەرگی ئەحمەد پاشای بابان، یا هەژاری موکریانی، هێدی، چەندین شاعیری تریش شیعریان بۆ بارزانی سەرکرده نووسیوه، له ئاکامی دەربڕینی خۆشەویستی، لەوانەیه پاداشتێکی ڕەمزی یا مەعنەوییان وەرگرتبێت ئەمیش هەر له ئاکامی ڕێزگرتن و خۆشەویستی بووه، نەك ئامانجێکی تر، بەڵام ڕژێمی بەعسی ئەم سیاسەتەی نێو خاڵی دووەمیان پەیڕەو کردووه، تەنانەت بەرامبەر هەندێ شاعیری کوردیش بۆ ئەوەی بیانگوازێتەوه نێو سەنگەری خۆیان.

[٦] ئەبوبەکر خۆشناو، شیعری بەرەنگاری کوردی (١٩٧٥ - ١٩٩١)، چاپخانەی ڕووناکبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٨٤.

[٧] هەمان سەرچاوە.

[٨] د.جابر قميحة ، العقاد في عالم السدود والقيود./ www.auran _ radio . com

* سایکۆباتییەکان: زانا دەروونزانەکان ئەم زاراوەیە بۆ ئەم کەسانەی کە خۆپەرست و سەرەڕۆ و درۆزن و حەزی تاوانیان هەیە، بەکاردەهێنن، ئەو کەسانەی کە هەست بە هەڵەکانیان ناکەن و خۆیان پێ لە لووتکەی ڕاستییە، دزێوترین جۆری کەسایەتییە/أنترنیت، المصطلحات النفسية، www . yahoo . com

[٩] محمد ياسين، فلسطين أدب القيد لتوثيق الألم. www.Islam on lion.com

[١٠] سەرچاوەی پێشوو.

[١١] حميد المختار، ابداع السجون وسجون الابداع، ئەنتەرنێت.

[١٢] بسام القادري، القاسم بين الشعر والسياسة. ٢٠٠٤/١٠/٣٠ www.marefe . org

[١٣] ئەدەبی زیندان، ئاسۆی ڕۆژهەڵات (هەفتەنامەیەکی سیاسی گشتییە). www.asorkoma ١٤٣١/١/١٩

[١٤] د. احمد عبدالعزيز، قضية السجن والحرية في الشعر الاندلسي، ص١٠١.

[١٥] بورهان قانیع، دیوانی قانیع، شاعیری چەوساوەکانی کوردستان، ل١٨.

[١٦] ئەبوبەکر خۆشناو، شیعری بەرەنگاری کوردی، ل١٨٤، نووسەر لە ل١٨٣ تا ل١٨٦ بۆ بابەتی شیعری زیندان تەرخان کردووە و پێی وایە دیارترین نموونەی شیعری زیندان لە شیعری کوردیدا، بە تایبەتی شیعری سەردەمی شۆڕشی نوێ، ئەو شیعرانەی کە شەهید (مەلا عەلی / حوسێن مەولود ئەحمەد) کە لە ساڵی ١٩٧٩ لە سێدارە دراوە نووسیویەتی، بەڵام دەکرا لاپەڕەی زیاتر بۆ ئەم بابەتە تەرخان بکات و نموونەی زیاتر بهێنێتەوە، لە کاتێکدا خۆی لە سەرەوە ئاماژەی بەوە کردووە کە شاعیرانی کورد (مەبەستی زیاتر شاعیرانی نوێیە) بەشێکی ژیانیان لە زیندانەدا بە سەربردووە، کەچی ئەم قسەیەی خۆی نەسەلماندووە.

[١٧] جاسم مطير، ضرورة توثيق وأحياء أدب السجون في العراق. www.alnnas.com ٢٠٠٩/٨/٢٥

[١٨] د . عمار علي حسن، أدب السجون ـ النزوع للحرية، جريدة الاتحاد. www.alittihad. ae . ٢٠٠٩/٨/٢٥

[١٩] د. عەبدوڵلا یاسین عەلی ئامێدی، هۆنراوەی بەرگری لە بەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا (١٩٣٩ /١٩٧٠)، ل٢٥.

* مەحمود دەروێش چەندین جار زیندانی کراوە، وەك لە ساڵەکانی ١٩٦١، ١٩٦٥، ١٩٦٧، ١٩٦٩، www.free arabi .com

[٢٠] انجليكا نوليفرت، الوطن في المنفى (محمود درويش و ثول سيلان) ترجمة، صبحي الحديدي، مجلة كرمل، انترنيت.

** بە شێكی زۆری شیعرەكانی (لەتیف هەڵمەت) گڕی وشەن بە مەبەستی ڕۆشنكردنەوەی دواڕۆژی كورد، لە ڤیستیڤاڵی شیعری كوردی لە كەركوك چەند كاتژمێرێك ڕاگیر دەكرێت و بە هۆی نووسینی پەخشانە شیعری نویێ لەم ڤیستیڤاڵە دوور خراوەتەوە. بڕوانە: علي ياسين، الشاعر لطيف هلمت. www.almada paper . net.

[٢١] عمر شبلي، المكان قاب جرح او أدنى، عن مجلة (النقد)، ع (٣)، تموز ٢٠٠٧، انترنيت.WWW. JEHAT.COM

[٢٢] بسام القادري، القاسم بين الشعر والسياسة، انترنيت ٢٠٠٤/١٠/٣٠

* بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: ابراهيم درويش، قصائد من غوانتانامو، جدارية، مجلة ثقافية الكترونية. www.adab.net

** نوگرە سەلمان: یەكێكە لەو بەندیخانانەی كە كەسانێكی زۆری سەر بە حیزبی شیوعی و نەتەوەییەكاندا لە نێو ئەم زیندانەدا دووچاری ئازار و ئەشكەنجە بوونەتەوە كە بۆتە ڕەمزی چەوسانەوە و زوڵم و لەناوبردن. بڕوانە: جاسم المطير، نقرة سلمان (الحلقة الاولى)، منتدى مطر، انترنيت.

[٢٣] د. عادل الاسطة، وقفة مع محمود درويش في جداريته، نشر اللقاء في البيان الخليجية، ١٩٨٦/٥/٢٠ انترنيت.

* حوكمی لە سێدارەدانی (مزەفەر نواب) ی شاعیر لە لایەن دادگای سەربازی ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە، بەڵام دواتر حوكمەكەی بە زیندانی هەتا هەتایی گۆڕا، لە زیندانی (نوگرە سەلمان) بە هاوكاری چەندین زیندانی تر توانییان تونێلێك هەڵكەنن بۆ دەرەوەی زیندان و تێیدا سەركەوتوو بوون و توانییان بەرەو خواروو (ئەهوار) ڕابكەن، بۆیە ئاماژە بەم دەرگایە دەدات.
بڕوانە: ئەنترنێت، مظفر النواب، المدى، موسوعة الشعراء.

[٢٤] شاكر فريد حسن، مظفر النواب، شاعر الرفض والشتيمة السياسية، جدارية، ١٥ اكتوبر ٢٠٠٩، www.marayapress.net

[٢٥] سەرچاوەی پێشوو.

[٢٦] مظفر النواب أو النورس الحزين، جريدة الكترونية مغربية مستقلة، www.marayapress.net

[٢٧] سعدي يوسف، اختلاجات في حضرة محمود درويش، مجلة كرمل، انترنيت.

* پێوەندێكە بۆ قاچ بەكار هاتووە.

** مارف بەرزنجی سەرەتا نازناوی (ناسراو) وەك شاعیرێكی دەركەوتوو ناسراو بە نازناوی (پشكۆ) هاتۆتە كۆڕی شیعری، مارف بەرزنجی لەیەكەم ئاهەنگی ساڵانەی شۆڕشی ١٤ی تەموز گیراوە لەلایەن دادگای عورفی، بە ناڕەوا حوكمی خنكاندنیان دا بەسەردا، نزیكەی (٤) ساڵ مایەوە تا لە ١٩٦٣/٦/٢٣ لە سێدارە درا . بڕوانە: سەرجەم بەرهەمەكانی، لاپەڕەكانی ١١، ٢١، ١٢، ٣٤.

* سێدارە لە ئەدەبیاتدا بە واتای شەهیدبوون لە پێناو بەهایەکی پیرۆز نموونەی خاك و نیشتیمان و بەها بالآکان دێت، نموونەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکە، ئەم بابەتە هێندە فراوانە، دەشێ ببێتە بابەتێکی سەربەخۆ بۆ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت .

[٢٨] مظفر النواب، او النورس الحزين،؟، جريدة ألكترونية مغربية مستقلة، www.marayapress.net .

* بێکەس دەڵێ: هێندە تەعقیبی حەقم کرد تاکو نانی خۆم بری سووك و ریسوا بووم لە ناوا گیرۆدەی ئاخیر شەریم (هەق) یەکسانە بە داوا کردنی دادپەروەری و راستی، یەکێکە لە پەیامە هەمیشەییەکانی شاعیران کە (بێکەس)یش یەکێك بووە لەو شاعیرانەی دووچاری هەموو جۆرە چەوسانەوەیەك بووە لە ئاکامی دەربڕینی راستی و مافە بنچینەکانی گەلەکەی.

[٢٩] د. عادل الاسطة، وقفة مع محمود درويش في جداريته، انترنيت .

[٣٠] بسام القادري، القاسم بين الشعر والسياسة، انترنيت، ٢٠٠٤/١٠/٣٠.

* یەکەم شیعری (دیلان) دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٥٠ کە لە بەندیخانەی کووت نووسیویەتی چونکە شاعیر لە ساڵەکانی ١٩٤٧/١٩٤٨تا ١٩٦٦ زۆر جار لە سەر خەبات و گیانی نیشتیمانپەروەری و ئاشتیخوازی گرتن و دەست بە سەری و بەندی دیوە و تەنانەت لە سەر تاوانی شیعریشی ماوەیەکی باش دوور خراوەتەوە و دەستبەسەر بووە. بڕوانە: کاروانی شیعری نوێی کوردی، ل٢٠٩.

[٣١] دیوانی دیلان، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٦٩، ل٢٢.

* شیعری (گەڕانەوە لە زیندان) بەرامبەری نووسراوە (لە عەرەبییەوە) واتە وەرگێڕانە، بەڵام دوای سۆراغێکی زۆر نەمتوانی دەقە عەرەبییەکە بدۆزمەوە، هەرچەندە (محەمەدی مەلا کەریم) لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا نووسیویەتی و دەڵێ: ئەم پارچە شیعرەی پاش دەرچوونی لە زیندانی یەکەم جاری لە ژمارە (١١٢٤) ی ١٩٥٢/١١/٢٠ ی ڕۆژنامەی ژین بلآوکردۆتەوە، هەرچەندە لە سەری نووسیوە (لە عەرەبییەوە) لای وایە هی خۆیەتی و لە بەر ناچاری بە هۆی تازە لە زیندان دەرچوون و پێویستی زوو خۆ دەرنەخستنەوە بە وەرگێڕانی داناوە، بڕوانە: (پەراوێزی ل٤٤٠ ی دیوانی گۆران) بە لای منەوە دوور نییە بیرۆکەکەی وەرگرتبێت و خۆی دایڕشتبێتەوە، نەك وەرگێڕانی واتایی بێت .

[٣٢] دڵشاد عەلی، دیلان، شاعیر و ئازادیخواز، ل ٢٨.

[٣٣] دڵشاد عەلی، دیلان شاعیرو ئازادیخواز، ل٧٥

* ئەمە کۆپلەیەکی شیعری (لە زیندانا چواردەی تەمموز) ە، کە (گۆران) لە بەندیخانەی بەعقوبە لە ١٩٥٨، نووسیویەتی، بەهادین نوری لە (گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا)، ل١٥٦ باسی لە ئەشکەنجەی زیندان کردووە لە بەندیخانەی بەعقوبە و دەڵێ:(مستەر لێدانی تیا بوو، **خوطامی** (قەیدی قاچە) تیا بوو، سیازدە مانگ من لەوێ بووم لەو ئینفرادییا، (گۆران) یەقین کەمتر ئازاریان دەدا، بەڵام کەس نەبوو لە ژێر ئازار و تەعزیبدا نەبێت)، بەڵام نووسەر ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە لە بەرچی (گۆران) کەمتر ئازار دراوە.

## ملخص البحث باللغة العربية

يعد شعر السجون جزءاً من شعر المقاومة والشعر الوطني والقومي والسياسي، ولم يُشر الى هذا النوع من الشعر كموضوع مستقل لحد الآن، بل ذكر ضمن هذه الأنواع، بيد ان هذا البحث تناول شعر السجون كموضوع مستقل قائم بذاته، لعلاقته الوثيقة بالشعب الكردي وأوضاعه السياسية حسب المراحل التاريخية التى مرت بها كردستان العراق في ظل الحكومات العراقية المتناوبة وكيفية تعاملها مع الاكراد لذا عنون هذا البحث ب(شعر السجون بين الواقع والأدب) (دراسة مقارنة بين الشعر الكردي والشعر العربي) وبناءاً على ذلك انبنى البحث على اجراء مقارنة بين مجموعة محددة من الشعراء الكورد من جهة والشاعر العراقي (مظفر النواب) والشاعرين الفلسطينيين (سميح القاسم ومحمود درويش) من جهة اخرى.

وطبيعة البحث اقتضت توزيعه على مقدمة تتضمن سبب اختيار الموضوع والهدف منه وأغراضه والمنهج والخطة المتبعة والشامل التى اعترضت سبيل البحث وفصلين.

يتطرق الفصل الاول الى (السجن وتجربته وأهداف شعر السجون) ويحتوي هذا الفصل على مباحث تحمل هذه العناوين: (مفهوم شعر السجون وحدوده) و (تجربة السجن بين الشعر الكردي والعربي) .

اما الفصل الثاني فعنون ب(السمات الفنية لشعر السجون) ويتألف من مبحثين اذ ضم المبحث الأول (معجم شعر السجون) والمبحث الثاني هو (الأسلوب الفني لشعر السجون) ثم جاءت نتائج البحث لعرض أهم الاستنتاجات التى توصل اليها البحث .

**Abstract**

Until recently imprisonment poetry has been discussed among the topics of confrontation, nationalism and politics. But, nowadays imprisonment literature and the literature during the period of uprising have taken a free form characterized by their own merits and distinguished clearly from other genra. There fore, this research under the title (imprisonment poetry within reality and literature) dedicated as (a comparative study between kurdish and Arabic literature). In Kurdish, some poets are selected ،while in Arabic (Muzafer Nawab, Samih AlQasim and Mahmood Darwesh) are focused. Besides an introduction ،the research consists of two major sections. First section is entitled (prison, experience and the aims of imprison ment poetry). It Contains two subsections firstly (the conceft and scope of imprisonmet poetry)and (prison experience within Kurdish and Arabic poetry) are introduced.

Secondly(literary charactevistics of imprisonment poetry) is presented.

It also includes the topics of imprisonment poetry and the literary style of imprisonment poetry.

Finally the research presents some conclusions which are the out come of deep inspection and researching across the field of imprisonment poetry.

# مەعریفەی شیعری
# لای کەریم دەشتی و ڕەفیق سابیر

**سەنگەر قادر شێخ محمد حاجی**
**مامۆستای یاریدەدەر (قوتابی دکتۆرا-ئەدەب)**
**پەیمانگای تەکنیکی پزیشکی- هەولێر**

## پێشەکی

بەو پێیەی کە شیعر خاوەنی بوونی تایبەتی خۆیەتی، کەواتە دەبێت ئەم بوونە بناسرێت و لەهەمان کاتدا دەبێت ئەو مەعریفەیەی ئەو بوونە پێمانی دەدا بیناسین، چونکە بەرلەوەی بڕیار لەسەر ڕاستی و ناڕاستی و حەقیقەت و دەرکەوتەیی هەر بوونێك بدەین، پێویستە لە بەراییدا بەوردی لەو بوونە وردبینەوە و تا ئەو ڕادەیەی دەکرێ و گونجاوە خەسڵەتەکانی دیاری بکەین و ئەو زانیارییە نادروستانەی، کە لەسەری گوتراون بەبەڵگەوە نادروستییان بسەلمێنین و بەزانیاری دیکەی دروست بیانگۆڕینەوە.

لەگەڵ قسەکردن و خستنەبەرباسی ناسینی جەوهەری شیعر ئەم پرسیارانە خۆیان ڕەپێش دەکەن، ئاخۆ لەشیعردا مەعریفە هەیە؟ مەعریفەی شیعری دەکەوێتە بەر کام جۆری مەعریفە و پێگەی لەناو مەعریفەدا لەکوێیە؟ ئایا دەکرێ جۆرەکانی دیکەی مەعریفە لەناو شیعردا دابمەزرێنرێن و کەڵکیان لێ وەربگیرێت؟

ئەو پەیوەندییە قووڵ و نەبڕاوەیەی بەدرێژایی مێژوو لەنێوان شیعر و تەواوی کایە مەعریفییەکانی دیکەدا هەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە مەعریفەی شیعری سەرەڕای ئەوەی چێژبەخشە بەهۆی ئەو شێوە دەربڕینەی هەیەتی، لەهەمان کاتدا سوودێکی زۆری هەیە بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی بەدوای مەعریفەی سادەدا دەگەڕێن و ئارەزوویانە مەعریفەیەکیان دەست بکەوێت

وردبوونەوە و ڕامانی زۆری پێویست نەبێت، بێگومان ئەوەش لەناو مەعریفەی شیعریدا دەستدەکەوێت.

ڕەنگە مەعریفەی شیعری زۆرترین جەماوەری خوێنەری هەبێت، چونکە ئەوانەی مەعریفەی فەلسەفی دەخوێننەوە کەسانی بژاردەن و وێڵی وەدەستخستنی مەعریفەی قوولن، هەرچی مەعریفەی شیعرییە، چونکە مەعریفەیەکی سادەیە خوێنەرێکی زۆری هەیە لەلایەك، و لەلایەکی دیکەشەوە لەبەرئەوەی خودی خوێنەرانی شیعر زۆرن، بۆیە خوێنەرانی مەعریفەی شیعری زیاتردەبن.

## - شیعر و سەرچاوەکانی مەعریفە

بێگومان بەشێکی شیعر ناوەرۆکە و ئەو ناوەرۆکەش پێویستە شتێك دەربخات، لێرەدا باسی مەعریفەی شیعر و گرفتەکانی مەعریفەی شیعر دەکەین و خەسڵەت و تایبەتمەندی و جۆر و پێگەی لە مەعریفەدا دەخەینە روو.

لەبارەی هەبوونی چەمکێك بەناوی (مەعریفەی شیعر) دوو بۆچوونی جیاواز هەن، کۆمەڵێك فەیلەسووف و رەخنەگر هەن هەبوونی ئەو چەمکە و هەبوونی مەعریفەی شیعر رەت دەکەنەوە، کۆمەڵێکیش هەن پێ لەسەر هەبوونی مەعریفە دادەگرن و زۆرجار پێش مەعریفەی فەلسەفیشی دەخەن.

(سۆکرات) و دواتریش ئەفلاتونی قوتابیی پێیان وایە، کە شاعیران ((نە (لێهاتوویی کرداریيان) هەیە و نە مەعریفی، بەڵکو موسەخەری توانای خودایی (theia dunamis) ن)) (١٥:٤٠) و جگە لەوەی خودا پێیان دەڵێت ئەوان هیچی دیکە نالێن. ئەگەر بەوە رازی بین، کە شاعیران مەعریفەیان نییە، ئەوا هێشتا مانای ئەوە نییە لەشیعردا مەعریفە نییە، چونکە ئەگەر شاعیر مەعریفەشی نەبێت، دەبێت لەناو شیعردا مەعریفە هەر هەبێت، چونکە شیعر لەلایەن خودا یان خوداوەندەوە بۆ شاعیر دێت و شاعیر هیچ شتێك لەخۆیەوە نالێت، بەڵکو خوداوەند شاعیر وەکو ناوەندێك بەکاردێنێت بۆ گواستنەوە و دەربڕینی ئەو شتانەی کە خۆی دەیەوێت، بێگومان ئەوەی خوداوەندیش دەیلێت مەعریفەیە.

دژایـەتی کردنـی شـاعیران بەردەوامـە و (سـانتیانا) گوتوویـە: ((مـن مرۆڤێکـی نــەزانم، تەقریبــەن شــاعیرم)) (٨١:١٨) ئەمــە ســەرەڕای ئــەو گاڵتەجاڕییــەی بەشاعیرانی کردووە، شیعریش ڕەت دەکاتەوە، چونکە کەسێك خۆی هیچ نـەزانێت ئەوەی پێکیشی دەهێنێ هیچ نییە، کەواتە شیعر داهێنان نییە:

**(هیچ شتێ لەئارادا نییە، جگە لەشڵپەی ئاو و، خوڕەی**
**جۆگەلەی قەدپاڵان و قەڵبەزەی غەریبی ڕووباران)**
**دەنگی مەرگ: ڕەگێ نییە لەدوای تەمەنێکی درێژ**
**خۆرکەی ڕۆژگاری بەتینی لێ نەکەوێ**
**چەمێ نییە دوای هەزار ساڵ**
**باوەش لەوشك و برینگی نەکاتەوە و**
**کرمی منی تێ نەکەوێ!** (١٢٩:٥)

ئەوەی لەم شیعرەدا هاتووە، لەلایەن خوداوەنـدەوە بەشـاعیر گوترابێـت، یـان هەڵقوڵاوی دەروون و زەین و تاقیکردنەوەی خۆی بێت بەرانبەر بـەژیان، ئـەوا ئـەو مەعریفەیە لەدەربڕینی مەعریفەیەکی ئاسایی ئەولاتر چووە. شاعیر پێمـان دەڵێـت هەموو ئەوەی لەدەوروبەری مرۆڤدا هەیە بەمرۆڤیشەوە سەرەنجامیان لەناوچـوونە و ئەمەش بەتاقیکردنەوە فێربووە و لەوە دڵنیایە، کە شتێك نییە لـەمردن رزگـاری بێت. جگە لەوە ئـەوەشمان پـێ دەڵێـت، کـە هۆکـاری لـەناوبردنی ئـەو بوونانـەی دەوری مرۆڤیان داوە شتێك نییە پێشتر بڕیار لەسەر لەناوچوونیان درابێت، بـەڵکو مرۆڤ خۆی دەبێـت بـەهۆکار بـۆ لـەناوبردنیان، کـە ئەمەشـی کـرد هاوسـەنگییەکە تێکدەچێت و سەرەنجام خۆشی لەناودەچـێت، بۆیـە دەڵـێین لێـرەدا شـیعر پـێش مەعریفەکانی دیکە کـەوتووە، چـونکە ئەگـەر هـەمان ئـەو زانیارییانـە بەپەخـشان دەربـبڕێن ئـەو کاریگەرییـەیان نـابێ، کـە ئـەم شـیعرە هەیـەتی، لەمەوەیـە شـیعر یارمەتی باشتر پێکانی ئامانجەکان دەدات.

(داگلاس مۆرگان) بە بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیانە هاتووە مەعریفە و حەقیقـەتی لەشیعردا ڕەت کردۆتەوە و دەڵێ: ((بۆهـەر حەقیقـەتێك دژێـك هەیـە، بەرهـەمێکی هونەری ناتوانێـت ببێتـە دژی بەرهـەمێکی هونـەری دیکـە، کەواتـە لـەتوانادا نییـە بەرهەمــە هونەرییــەکان ببنــە سەرچــاوەی بەشــێکی کــەمیش لــە ڕاســتییەکان))

(٩٣:٢٦) (أ) تەنێکە و دژەکەشی (–أ)ە، بەڵام هەر شیعرێك وەرگرین لەڕووی فۆرمەوە ناتوانین دژەکەی بدۆزینەوە:

**بەرەو کوێمان دەبات زەمان؟**

**نەبۆ مردن کاتمان هەیە**

**نەبۆ ژیان.** (٢:٥٠)

لە رووی فۆرمەوە مەحاڵە شیعرێك بدۆزینەوە پێچەوانەی ئەمە بێت، چونکە بوونی شیعر، کە زمانە دژە بوونێکی دیکەی نییە. کەواتە لێرەدا (مۆرگان) ڕاستی پێکاوە، بۆیە لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر شاعیر مەعریفەیەکیشی هەبێت، ئەوا پێویست ناکات لەدوو توێی شیعرێکدا باسی بکات، بەڵام ئایا ئەم داواکارییە داواکارییەکی کردەنییە؟ بێگومان نەخێر. مۆرگان خۆی بەر لەهەر کەسێکی دیکە نامومکینی ئەو داواکارییەی خۆی دەزانێت، بۆیە لەوتارێکدا لەبارەی ((بایەخی مەعریفەی هونەردا)) دەڵێت: ((بێ پەردە دەیڵێم زۆر بەرهەم لە گەلێك هونەردا دەتوانن زۆرێك لە جۆرە جیاوازەکانی مەعریفەمان پێ ببەخشن و لەڕاستیدا ئەمەش دەکەن، بەڵام ئەگەر ئەو مەعریفەیە دەروازە و بڕ و سنووری خۆشەویستی هونەر بێت، ئەوا جیهان خەماویتر دەبێ لەوەی، کە ئێستا تێیدایە)) (٩١:٢٦). مۆرگان دان بەوەدا دەنێت، کە لەناو شیعردا مەعریفە هەیە، بەڵام مەعریفەیەکی خراپ و بێ سوود و مرۆڤ بەهەبوونی ئەو مەعریفەیە دەستەوەستان دەبێت لەبەرانبەر گرفت و پێداویستییەکانی.

هەرچی لەرووی ناوەرۆکەوەیە، کە مۆرگان فەرامۆشی کردووە، ئەوا بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی و سانا دەتوانین دوو شیعر بدۆزینەوە، کە ناوەرۆکەکانیان پێچەوانەی یەکتربن، یان لەدوو توێی یەك شیعردا شاعیر دوو جۆر مەعریفەی دژمان پێبدا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی شیعر مەعریفەیەکی ڕووتی زانستیمان پێ نادات:

**شوێن مێرگێکە لە ئاسۆوە تا قووڵایی کات،**

**منیش نیوە لێڵ نیوە ڕوون**

**بۆ خۆم دەگەڕێم،**

**لەلێکنەچوونا لێچوون دەبینم** (١٩:٢)

تەوەری سەرەکی مرۆڤ (شاعیر)ە کە خۆی نازانێت چییە؟ ئەو زانیارییەی لەبارەی خۆیەوە هەیەتی بەس نییە بۆئەوەی خۆی بەڕوونی ببینێت، لەهەمان کاتیشدا ئەوەندە نامۆ نییە بە خۆی، کە لێڵ بێت و هیچ لەبارەی خۆیەوە نەزانێت. کێشەی هەرە گەورەی مرۆڤ ئەوەیە خۆی دەناسێت، بەڵام خۆناسینێکی تەواو نییە. بەهەمان شێوە دەوروبەریشی بەنیوەچڵی و ناکاملی دەناسێت، بۆیە خۆی لەگەڵ خۆیدا دژ دەبێت، چونکە دەزانێت شتێك دەزانێت و لەوەش دڵنیایە، کە ئەوە هەموو شت نییە.

(ماکلیش)ی شاعیر لەکتێبی (هونەری شیعر)دا لەو هاوکێشەیەی، کە بۆ شیعری داناوە وای داناوە ((شیعر یەکسانە بەوەی، کە ڕاستەقینە نییە)) (٣٥:١٠) بەو واتایەی ئەگەر لەناو شیعردا حەقیقەتێك یان مەعریفەیەکیش هەبێت، ئەوا ئەو مەعریفەیە ناکرێت بەهەند وەربگیرێت و پشتی پێ ببەسترێت. ئەم هاوکێشەیە نە دەتوانرێت بەتەواوی ڕەت بکرێتەوە و نەوەکو خۆشی وەربگیرێت. هەندێك شیعر هەن ئەو مەعریفەو زانیارییەی، کە دەیدەن هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕاستییەوە نییە و شاعیریش مەبەستی ئەوەی نییە ڕاستی و مەعریفەی ڕاستەقینە بداتە خوێنەر:

**خۆتئاسا شاناز دەڕوانی وەك ئەو ساتانەی بە هێما**
**گەواڵەی هەورت رادەگرت،**
**بەزمانی غەیب، کە پەیڤەکانی وەك گزنگ و گوڵە ئەستێر**
**درەوشاوە بوون**
**دار و شەماڵ و ڕووناکیت دەدواند،**
**ئەو پۆلە باڵندانەت دەدواند کە وێنەی هەورێکی پەمەیی**
**سێبەریان لەسەر هەڵدابوویت** (٦٩:٢)

ئەگەر بڵێین لەم شیعرەدا مەعریفە نییە، ئەوا هەڵەیەکی گەورە دەکەین، چونکە شیعر نییە مەعریفەی تێدا نەبێت، بەو هۆیەی شیعر جوانە و هەموو جوانییەکیش حەقیقەتی تێدایەو هەرچی حەقیقەتیش بێ ئەوەی لەبارەیەوە دەیزانین دەبێتە مەعریفە. بەڵام ئەم کارە شاعیر بەمەبەستەوە نایکات و نایەوێ

مەعریفە بدات بەخوێنەر، بەڵکو ئەوە خودی ڕەگەزی شیعرە، کە ڕاستەوخۆ هەموو پاژێکیی بەجوانی دەردەبڕێت و سەرەنجام دەبێتە مەعریفە.

کەچی هەندێك شیعر هەن قووڵن و ئەو مەعریفەیەی تێشیاندایە تەواو ڕاستەقینەیە، یان لایەنی کەم شاعیر پێی وایە ئەوە زانیاری دروستە لەبارەی ئەو بابەت یان دیاردەیە. بۆنموونە (کەریم دەشتی) بەم شێوەیە لە (بەختەوەری) دەدوێت:

**وای چەند بەختەوەرن ئەوانەی**
**ئێواران کە بازنەی ئاسۆ دەکەوێتە لمی زەوی**
**دەگەڕێنەوە کوختەکانی خۆیان**
**زمانیان تامی ڕاستی لێ دێ**
**دڵیان بۆنی زناری پاکی**
**دەستەکانیان شەهدی دۆستایەتی لێ دەتکێ...**
**ئای ئەوانە چەند بەختەوەرن**
**خاکێن کە پەنجەیەکیان برێندار دەبێ بەخۆڵ تیماری دەکەن**
**کە نەخۆش دەکەون بەئاوی دوعا لێ خوێنراو چاك دەبنەوە**
**کە عەشق لێیان دەدا دەبن بەشوان**
**دەگەڕێنەوە دەشتایی**
**دڵیان پاکە وەك ئەو قامیشەی دەیژەنن**
**زمانیان سپی وەك ئەو شیرەی دەیخۆنەوە**
**خەونیان شیرین وەك ئەو کچەی خۆشیان دەوێ** (٥:١٨٨-١٩٠)

شاعیر لەسەر بەختەوەری دەدوێت، کە بابەتێکی گرنگی فەلسەفەیە و یەکێکە لەگرنگترین مەبەستەکانی فەلسەفە. لەتەواوی ئەو قەسیدەیەدا، کە یازدە کۆپلە شیعرە باس لەوە دەکات، کە مرۆڤی بەختەوەر کێیە. ئەو پێی وایە مرۆڤ تا سادە بژیێت و ژیان لەخۆی ئاڵۆز نەکات بەختەوەرە، تا لەبری گوێگرتن لە ڤاگنەر حیکایەتەکانی بەرئاگردان بگێڕێتەوە بەختەوەرە، تا عاشق بێت و دەرمانی عەشقەکەی لەتێکەڵبوونەوە بەسروشت ببێنێتەوە کێشەیەکی نابێت. مرۆڤی

بەختەوەر هەمیشە ڕاستگۆیە و خەڵکیشی خۆش دەوێت و نابێتە مایەی ئازاردانی هیچ کەسێکی ئیدی، کە ئەمەشی کرد دووبارە بەختەوەر دەبێتەوە.

هەندێك لەڕەخنەگران هەبوونی هەموو جۆرە مەعریفەیەك لەناو شیعردا ڕەت دەکەنەوە و هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەنێوان شیعرو مەعریفەدا دانانێن و هەریەکەیان بەدوو جەمسەری جیاواز و دوور لەیەك دادەنێن، کە دوو ئەرکی جیاواز دەبینن و زۆر بەتوندی پێ لەسەرئەوە دادەگرن، کە شیعر ((نە نرخی مەعریفی هەیە و نە زانستی بەو واتایەی کە ئەو چەمکەی پێ ناسراوە، و ئەگەر وەسیلەیەك نەبووایە بۆ گەیشتن بە چێژ هیچ بایەخێکی نەدەبوو)) (٢٠:٢٤٧). شیعر بایەخی زانستی نییە، چونکە زۆر کەمن ئەو شیعرانەی، کە بابەتی ڕووتی زانستییان تێدا باس کراوە و ئەو بابەتانەش لەبایەخی شیعرەکەیان کەم کردۆتەوە نەك زیادیان کردبێت، بۆیە شیعر و زانست دوو جەمسەری لەیەك جوداو لەیەك دوورن (شیعرێك)، هەرچی شیعر و مەعریفەیە، ئەوا نەك لەیەك دوور نین، بەڵکو ئەگەر شاعیر بخوازێت دەکرێت بەردەوام بەیەکەوە بێن.

لەبارەی چێژبەخشینی شیعریشەوە ئەوە یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی شیعرە و شیعر مەعریفەی تێدابێت یان تێدا نەبێت، و ئەو مەعریفەیە قووڵ بێ یان ڕووکاری، چێژی هەر هەیە. (درایدن DRYDEN) بەخاکەڕاییەوە دەڵێت: ((ئەو بەوە ڕازییە، کە چێژ لای خوێنەر دروست دەکات، لەبەرئەوەی چێژ مەبەستی سەرەکی شیعرە ئەگەر تاکە مەبەستی نەبێت)) (١٣:٩) و دواتر و لەپلەکانی دیکەدا ڕەگەزەکانی دیکەی شیعر و مەعریفە دێنە ناوەوە.

(گۆردن گراهام) بەهەمان شێوەی ئەوانەی سەرەوە مەعریفەی شیعری ڕەت دەکاتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز، دەڵێت: ((هەرجارێك بمەوێ ((حەقیقەت)) لەهونەردا بدۆزمەوە لە چەنگم دەردەچێت))(٢٦:١٠٢) باوەڕی بە هەبوونی حەقیقەت هەیە لەناو شیعردا، کە دواجار دەربڕین و هەبوونی ئەو حەقیقەتە دەبێتە مەعریفە، بەڵام ئەو جۆرە مەعریفە بێ کەڵکە، کە دەتەوێت وەدەستی بخەی لەدەستت دەردەچێت، چونکە مەعریفەیەکی سرکە و ناتوانرێت دەستنیشان بکرێت:

**فڕینی ئاڵ لە ڕەگ و ڕیشەی درەختی هەتاوایە**
**فڕینی مەل لەبارستەی شادەماری باڵی دایە**
**فڕینی خاك لەپەڕ و باڵی پڕتینی هەڵۆدایە**
**فڕینی ساماڵی زیویین لەبارانی پەڵەدایە**
**فڕینی شیعری پڕ هزریش لەئەفسانەی مەرگ دایە...**
**هزری ڕووبار لەشەپۆلی تووڕەدایە**
**هزری ئاگر لە هەڵچوونی کڵپەدایە**
**هزری ئەوین لەسووتانی تەمەن دایە**
**هزری زەوی لە لەرزشی ناخی دایە**
**هزری شیعریش لەترۆپکی مانادایە** (١٩١:٥)

لەتەواوی ئەم شیعرەدا شاعیر دەیەوێت ئەوەمان پێ بڵێت، کە هیچ شتێك نییە لەخۆیەوە دروست بێت، یان لەخۆیەوە ڕووبدا و هەموو هۆیەك پێویستی بەهۆکارێك هەیە و هەموو جووڵەیەك پێویستی بەهێزێك هەیە، بەڵام ئەگەر هەموو شیعرەکە سەراوگێڕ بکەین ئەم دەربڕینە نادۆزینەوە، کە ئەمە وای کردووە مەعریفەی شیعرەکە وەك سرت خۆی بنوێنێت و پێویستی بەلێڕامان هەبێت نەك ڕاستەوخۆ زانیاریمان پێ بدات.

کۆمەڵەی دووەم، کە زۆرترن و بەڵگەکانیشیان پتەوترن ئەو کۆمەڵەیەن، کە شیعر بەیەکێك لە سەرچاوەکانی مەعریفە و فێربوون دادەنێن. (شەمسی قەیسی رازی) دەڵێت: ((شیعر لەبنچینە زمانییەکەیدا مەعریفەیە)) (٤٢:٢٤) و بۆ ئەوە دروست بووە مەعریفە بگەیەنێت. ئەو مەعریفەیەش لەسەرەتادا هەموو ئەو زانیارییانە بوونە، کە مرۆڤایەتی زانیونی، چونکە کۆنی شیعر لەکۆنی زمان نزیکە و هەموو ئەو مەعریفەیەی ویستراوە نەفەوتێت لەڕێی شیعرەوە هەڵگیراوە، ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی شیعر دەتوانێت هەموو جۆرەکانی مەعریفە لەخۆیدا جێ بکاتەوە. بۆیە (هایدگەر) پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە ((شیعر سەرچاوەی بنچینەیی مێژوو، و فەلسەفە، و سیاسەتە)) (٧٥٩:١٦). بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەی هایدگەر ئەم دوو کۆپلە شیعرە وەردەگرین:

**ئەمانە کێن بەم ناوەختە**
**خەو لەچاوی ئاوایی و منداڵان دەدزن**
**((بەربەریستانن بۆ دوا نوێژ خڕبوونەوە**
**بەدووەکانن بەزەبری نوێژ خزاونە ئاواییەوە))**
**ئەمانە چین؟ ...کام دڕندە و جانەوەرن؟**
**کۆرپە لەئامێزی دایك و ماچ لەلێوی دڵدار دەدزن...**
**بەقەڵغان و شمشێرەوە بەری دەرگەیان پێ گرتووین**
**بۆ باج**
**زەکات**
**تاڵان**
**هاتوونەوە** (١٧٧:٣)
ئینجا خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێ:
**وریابە گیانە! خۆیانن**
**بەربەریست و**
**شڕەخۆرو**
**چەکمە ڕەق و**
**بەدووەکانن...**
**خۆیانن ...بەڵێ خۆیانن**
**دیسان بۆ نوێژ و**
**زەکات و**
**کچ فڕاندن..**
**خڕبوونەوە** (٤٠٩:٢)

ئـەوەی لـەم دوو کۆپلەیـەدا هەیـە تۆمـارکردنی مێـژوو، یـان تۆمارکردنـەوەی مێـژووە، چـونکە شـاعیر جارێکیـان تـاڵان و کوشـت و بـڕ و کـچ فڕانـدن بەسـەر میللەتەکەیدا هاتووە و ئەو لـەو سـەردەمدا نـەژیاوە و تـەنیا بـۆی گێڕدراوەتـەوە. ئێـستا هـەمان کارەسـات بەسـەرخۆی و میللەتەکەیـدا دووبـارە بۆتـەوە. ئـەو لەسەرەتادا گومانی هەیە و نازانێت ئـەوەی کاولکـاری ئـەنجام دەدا کێیـە، بـەڵام

دواتر، کە کردەوەکانیان بەکردەوەی هەمان ئەو کەسانە دەچێت، کە پێشتر هاتوونە و ئەو زانیاری لەسەریان هەیە دەیانناسێتەوە و داوا لە (گیان) ەکەی دەکات وریابێت، بەڵام خۆی ئەو ڕاستییە باش دەزانێت، کە وریابوون بەرانبەر ئەوانە هیچ سوودێکی نییە، بۆیە نیشانەی سەرسوڕمان (!) ی لەدوای وریابە داناوە.

بێجگە لەمێژوو و سیاسەت و فەلسەفە شیعر چەندین بابەتی دیکەی لەخۆگرتووە، کە (بەلقیس سولەیمانی) لەڕێی چەند پرسیارێکەوە دەریاندەبڕێت: ((ئایا لەناو شیعرەکانی هۆمەردا ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان دەدۆزنەوە؟ ئایا داستانەکەی هۆمەر کۆمەڵە ئیلاهیاتێکی تۆمارکراویان بوو؟ ئایا شارستانیی گریکی لەپەرەسەندندا وەکو تەواوی شارستانییەکانی دیکە بەزمانی شیعر قسەی دەکرد و بەزمانی شیعر لە بوون دەگەیشت؟ دەتوانین وەڵامی هەرسێ پرسیار بە بەڵێ بدەینەوە)) (١٧:١٧)، کەواتە شارستانییەت بەهەموو لایەنەکانییەوە و ئایین بەهەموو وردەکارییەکانییەوە لەناو شیعردا جێی بۆتەوە و شیعرەکانی (هۆمەر) یەکێك بوونە لەو سەرچاوانەی گریکەکان زۆرترین زانیارییان لەبارەی خوداکانیانەوە لێی وەرگرتووە. لای ئێمەی کورد ئەمە لەڕووی سیاسی و شۆڕشەکانمانەوە زۆر بەزەقی دیارە بەجۆرێك کەم شاعیرمان هەن شیعرێك تا دەیان شیعریان بۆ تۆمارکردنی شۆڕش و ئازادی نەنووسیبێ:

**وڵاتەکەم سەدان ساڵە خوێن دەچێنێت**
**کراسی گڕ دەکاتە بەر ڕۆڵەکانی**
**پەنجەی بەخوێنی نەوەکان**
**دەنەخشێنێت...**
**چۆن نازانیت کوردستانم**
**کراسی گڕ**
**دەکاتە بەر ڕۆڵەکانی و**
**پەنجەی بەخوێنی نەوەکان دەنەخشێنێت!**
**لەژێر شمشێر و بەر پەتی سێدارەشدا خەو دەبینێت**
**خەو دەبینێت** (٣٤٢-٣٤١:٣)

**- شیعر و حەقیقەت**

(ئەرەستۆ) بەپێچەوانەی مامۆستاکەی ((هونەرمەند بەدوور نازانێت لە حەقیقەت، بەڵکو لە بۆچوونی ئەودا هونەرمەند ڕووەو کەماڵی داواکراو یان توخمی هەموو شتەکان دەڕوات)) (٦٤:٢٢)، ئەمە مانای وایە شاعیر کاتێك لە شتێك دەدوێت بەدابڕاوی و دوور لەهەموو بوونەکانی دیکە نایەوێت ئەو شتە بناسێت، بەڵکو بوونی ئەو شتەی، کە لێی دەدوێت بەبوونەکانی دیکەی دەبەستێتەوە تا سەرەنجام بگاتە کەماڵی ناسینی ئەو بوونە:

**کۆت و پێوەندە برسییەکان**
**دەزانن چیتان مەبەستە**
**هەردوو دەرگا پێ دەزانین**
**ئەمەیان دەرگای مردنە... بەڵام نەمری لەدوایە**
**ئەمەشیان دەرگای ژیانە... بەڵام هەر مردنی تیایە** (٩٨:٥)

ئەوەی شاعیر لێی دەدوێ (مردن) ە و ئەو دەیەوێ بڵێت مردن شتێکی ڕەهایە و مرۆڤ هەر چ کارێك بکات سەرەنجام هەر دەمرێت. ئەو باوەڕی بە نەمری هەیە، بەڵام هەنگاوی پێش نەمری ئەوەیە، کە بمرێت ئینجا نەمری وەدەست دێنێت. مرۆڤ، کە دەژیێ دوو ڕێگای لەبەردەمدان کە هەردووکیان دەچنەوە سەر مەرگ. شاعیر نەهاتووە بەتەنیا باس لە (مردن) وەکو بوونێکی ئەبستراکت و دابڕاو بکات، بەڵکو هەوڵی داوە لەڕێی بەستنەوەی مردن بەژیانەوە تێمان بگەیەنێت، کە مردن چییە.

(هایدگەر) دەڵێت: ((هونەری شیعر جگە لە ڕێکخستنێکی ڕۆشنی حەقیقەت هیچی دیکە نییە)) (٢٢:١٢)، ئەوە مانای وایە شیعر نەك تەنیا حەقیقەت و مەعریفەی تێدایە، بەڵکو ئەو حەقیقەت و مەعریفەی لەشیعردایە پلەیەك لە سەرووی ئەو مەعریفەیە، کە لە سەرچاوە مەعریفییەکانی دیکەدا دەیبینین، چونکە ئەوەی ئێرە مەعریفەیەکی ڕێکخراوە و ڕووداوەکانی حەقیقەت لێرەوە تۆمارکراون دوور لە درێژدادڕی و سەلماندنی شتێك لەڕێی شتێکی دیکەوە:

**ڕۆژەکان: یادگار گەلێك کە بەندی زەمانمان دەکەن**
**پایز: گەڵای پواوی سەر ڕێگاوبان**
**ئەڤین: پەشیمانی و ژان**
**تەمەنیش: خۆڵەمێشی گوناهەکان و تەڵخە سێبەرێ**
**کە غرووری لاوانە و جوانیی خۆی بیرچۆتەوە**
**خەوبینەرانە**
**بۆ سیمای ونبووی دەگەڕێ** (٤٠:٢)

ئەوەی لەبارەی (ڕۆژ، پایز، ئەڤین، تەمەن) گوتراوە لە ڕستەیەك کەمترە، بەڵام شاعیر هاتووە جەوهەری بوونەکانی بە ئێمە گوتووە و زەقترین پاژی ئەو بوونەی وەرگرتووە. لە (ڕۆژەکان) یادگاری گرنگترین شتە لە (ئەڤین) یش ژان.

(نیچە) وەکو (هایدگەر) هونەر بەنزیکترین بوون دەزانێت لە جیهانی حەقیقەت و پێی وایە ((ئەگەر وامان دانا جیهانی بینراوی ئێمە تەنیا رووکارە وەك ئەوەی میتافیزیکییەکان وای دادەنێن، ئەوا هونەر زۆر نزیکتر دەبێتەوە لەجیهانی حەقیقەت)) (٨٩:١١) و بەمەش هونەر ئەوە دەردەبڕێت، کە کرۆکی فەلسەفە دەیەوێت. فەلسەفە لەگەڵ زۆربەی بوونە فیزیکییەکان گرفتێکی ئەوتۆی نییە و تاڕادەیەکی باش مەعریفەی لەسەریان وەدەست خستووە، ئەوەی فەلسەفە لەبەردەمیدا دەستەوەستانە و زۆرکەم لێی نزیك دەبێتەوە میتافیزیکە، کە کارێکی ئێجگار قورسە لەڕێی بەڵگە فەلسەفییەکانەوە بوونیان بسەلمێنرێت. هەرچی شیعرە ئەوا زۆرکات لەمیتافیزیك دەدوێت و زۆرجاریش سروشت دەکاتە بناخەیەك بۆ دووان لەسەر ئەودیو سروشت:

**جوانی تۆ وەك شەفەقێکە**
**بەسەر بەهەشتەوە هەڵێ**
**کە من ڕێم بەرەو دۆزەخە**
**ئای لەو پارسەنگە سەختە** (٤٠٣:٥)

سێ چەمك لێرەدا ناویان هاتووە، کە هەرسێکیان لە میتافیزیکدان، ئەوانیش (خودا و بەهەشت و دۆزەخ)ن.

(نیچە) ی فەیلەسووف هاوکێشەیەکی لەم شێوەی بۆ هونەرمەندان داناوە ((ئێمەی هونەرمەندان= ئەوانەی کە بەدوای مەعریفە و حەقیقەتدا دەگەڕێین= ئێمەی داهێنەرانی ئیمکاناتەکانی ژیانێکی نوێ)) (١٣٢:٨). ئەم سێکوچکەیەی نیچە دروستی کردووە بایەخێکی گەورەی بۆ ژیانی مرۆڤ هەیە. ئەو پێمان دەڵێت ئێمە بوونێکمان هەیە بەناوی هونەرمەند و شاعیران، کاری ئەمانە ئەوەیە بەدوای حەقیقەت و مەعریفەدا بگەڕێین، نەك لەپێناو ئەوەی خودی ئەو بوونانە بناسن کە هەن، بەڵکو بۆئەوەی لەڕێی ناسینی ئەوانەوە ژیانێکی نوێ و باشتر دابین بکەن. ئەمەش خاڵی هەرە سەرەکی جیاوازی نێوان شاعیران و فەیلەسووفانە بەجۆرێك مەعریفە لای فەیلەسووفان مەبەستە، بەلاَم لای شاعیران ئامرازە، بۆیە مەعریفەی فەیلەسووفان قووڵە کەچی مەعریفەی شاعیران فراوانە:

**ناونیشانی: دۆزەخەکەی باربۆسە**
**بەرگەکەی: وردە ئێسقانی ناو جەنگەڵی شەڕەکانی جیهانییە**
**ناو بەرگەکەی غەرە سەری کوژراوەکانی فتوحاتە**
**پەڕی یەکەم: پێشەکییەك بەقەڵەمی خوێناوی ئەدۆڵف هیتلەر**
**پەڕی دووەم: وێنەی قەلنەکەی ستالینە**
**پەڕی سێیەم: زنجیرە داغەکانی عوسمانلییە لە ملی ئاگری داغ...**
**ناوبەرگی دواوە: بەندیخانەکەی باستیلە پڕ لە سارتەر**
**بەرگی دوایی: جۆگەلەی خوێناوی عبدالخالق مەعروفە**
**چاپەکەشی: چاپخانەییێکی شکاوی فاشیەتە**
**تیراژەکەی: بەقەد داوە ڕیشی تەڵخی ولاَغەکانی تەتەرە**
**نرخەکەشی: خوێنی بەناهەق ڕژاوی ئینسانە**
**خوێنەریشی: بکوژانی لەقلەقەکەی سەر منارەی خانەقایە** (٢٣٥:٥)

ئەگەر فەیلەسووفێك لەسەر هەرکام لەبابەتی ئەم نیوە دێڕانەی بنووسیبایە، ئەوا زۆر قووڵتر دەچووە ناو بابەتەکان و یەکێك لەبابەتەکانی هەڵدەبژارد و دەیکردە نموونە بۆ ئەوەی بۆمان بسەلمێنێت، کە ئەو کتێب (ژیان) ەی ئێمە گوزەراندوومانە و دەیگوزەرێنین ژیانێکی ناخۆش و پڕ چەرمەسەرییە. کەچی ئەوەی شاعیر ئەنجامیداوە ئەوەیە کۆمەڵێك زانیاری لەسەر چەند کەس و

سـەردەمێك بەئێمـە دەڵێـت و لـە سـەرجەمی كۆكردنـەوەی هەموويانـدا ئـەوەمان پێدەڵێت ئەو ژيانەی ئێمە تێيداين كارەساتێكە بۆخۆی.

(روونيـە) لـەڕێی جوانييـەوە شـيعر بـە مەعريفـەو حەقيقـەت دەبەسـتێتەوە، ((حەقيقەتێك، كە جوان نەبێت بێجگە لەيارييەكی لۆژيكی زەينی ئێمە شـتێكی تـر نييـە، جـوانی تـەنيا حەقيقـەتی وەسـتاو و رازاوەی ئـەم ناوەيـە)) (٤٥:٧). ئێمـە ئێستا لەبەردەم بۆچوونێكی زۆر گشتيداين، ئەويش ئەوەيە ئـەوەی حەقيقـەت بـێ دەبێت جوان بێت و ئەوەی جوانيشە راسـتەوخۆ دەبێتـە حەقيقـەت و ئـەم دووانـە بێ يەكتر نابن، يان چاكتر بيڵێين يەك شتن. ئەگەر باوەڕمان بەمە هـەمووی هێنـا، ئـەوا ڕاسـتەوخۆ دەچـينە سـەر ئـەو بـاوەڕەی، كـە شـيعر هـەمووی حەقيقەتـەو دەربڕينە شيعرييەكان هەموويان مەعريفەن لەبارەی حەقيقەتەوە، چـونكە ئـەوەی گومان هەڵنەگرە ئەوەيە شيعر جوانە:

**هاوارێكم**
**لەسەر گومان هەڵكەندراوم**
**لەنێوان پەنجەكانتدا درەختێكم**
**تينووێتی دەیڕنێتەوە**
**چیرۆكێكم**
**نامۆيی دەيگێڕێتەوە** (٦٧:٣)

شاعیر پـشتی لەتـەواوی حەقيقـەتی خـۆی كـردووە و هـاتووە بەتـەنيا هـاواری هەڵبـژاردووە و خـۆی بـەهاوار دادەنـێ، بـەڵام چ جـۆرە هاوارێـك؟ ئـەو هـاوارەی گوماناوييـە و ناكرێـت سـەد لەسـەد بـاوەڕی پـێ بكرێـت. ئـەوەی لێـرەدا هـاتووە ئەوەيە شاعیر بـە هـيچ شـێوەيەك نازانێـت خـۆی چـيیە، بـەڵام ئـەو مەعريفەيـەی هەيەتی ئەوەيە، كە نازانێ چييە، كـە نـەزان نييـە. ئـەو هـاوارە، بـەڵام هـاوارێكی گوماناوی نازانێت هەيە يان نييە.

ئەگەر لەناو زۆرينـەی شـيعرەكاندا مەعريفـە هـەبێت و مـرۆڤ بتوانێـت لێيانـەوە فێربێت، ئەوا ئەو كەسەی، كە شيعريش دەنووسێت دەبێت خاوەنی زانياری بێـت. (وۆردس وۆرس) لەم بارەيەوە دەڵێت: ((هەموو شاعیرێكی گـەورە مامۆسـتايەكە، مـن پـێم خۆشـە ئەوانـەی دیكـە مـن جگـە لـە مامۆسـتا بەهيـچی دیكـە دانـەنێن))

(١٥١:١٤). ئەو لەوە دڵنیایە کە ئەوەی دەیڵێ زانیارییە، بۆیە داوای ئـەوە دەکـات وەکو مامۆستا بانگی بکەن. وەك لەچەمکی ((بیرمەنـدە بـچووکەکاندا)) (١١٦:١٠) دەردەکـەوێت ئـەوەی وۆردس وۆرس داوای کـردووە شـاعیران زیاتریـان وەدەسـت هێناوە، چونکە بیرمەنـد هەرچـەندە بـچووکیش بـێ لەمامۆسـتا پلەیـەك بـەرزترەو کاری بیرمەند تەنیا فێرکردن نییە، بەڵکو بیرکردنەوەشە.

**بێدەنگی ئەم ناوەی تەنیوە**

**کە بەدوای حەقیقەت دەگەڕێی**

**گوتنی لەزمان گەنیوە**

**واچاکە هەر کەڕ بی**

**ئەگینا هەر دەبێ بێهوودە لەشەڕ بی** (١٠٩:٦)

شاعیر مامۆسـتایانە پێمـان دەڵـێ خۆتـان لـەگوتنی حەقیقـەت بـەدوور بگـرن، چـونکە گـوتنی حەقیقـەت مایـەی سەرئێـشەو چەرمەسـەرییە. لەهــەمان کاتــدا ئەوەمان پێدەڵێ کە ئەو بیری کردۆتەوە و حەقیقەتی لایە و کەسێکی بێ مەعریفە نییە و ئەو قسانەی دەیکا لەخۆیـەوە نایکـا، بـەڵکو پێـشتر حەقیقـەتی گوتـووە و گرفتـی بـۆ دروسـت بـووە، بۆیـە ئێـستا ئـەو مەعریفـەت و حەقیقەتـەی لایـەتی شاردوویەتییەوە و تووشی گەنین بووە، بەلاّم شاعیر نایەوێت بیلێت.

بیرکردنـەوەی شـاعیران لـە بیرکردنـەوەی فەیلەسـووفان و زانایـان جیـاوازە و ئەوەش وای کردووە بەرهەمهێنەری مەعریفەی جیاوازبێـت، چـونکە ئـەو رێگایـەی شـاعیر هـەڵی دەبـژێرێت جیـاوازە لـەرێی ئـەوانی دیکـە، شـاعیر (( رێگایـەك پـێ دەزانێت بۆ گەیشتن بەبەرزترین ناسین و مەعریفە، کە وەدەستهێنانیان بـە ئـامراز و هۆکارەکانی دیکە مەحاڵە)) (٥٩:١٩). ئەوەی شاعیران بـێ دوودڵـی لەبارەیـەوە دەدوێن قسەکردن لەسـەری لەلایـەن ئـەوانی دیکـەوە لەسـەری ئاسـان نییـە. ئـەم بۆچوونە پێداگرییـە لەسـەرئەوەی شـیعر نـەك تـەنیا مەعریفەیـەو سەرچـاوەیە بـۆ وەدەستهێنانی مەعریفە، بەڵکو بەشێك لەو مەعریفەیـەی لەشـیعردا هەیـە لـە هـیچ سەرچاوەیەکی دیکەی مەعریفەدا نییە:

**هەموو ئەو پیتۆڵانە بەقەد نەنکم ئاقڵ نەبوون**

**کە گوتی: شەڕ ناهێڵێ قەیسییەکانم وشك کەمەوە**

**شەڕ ناهێڵێ مریشکەکانم لەسەر جووجەڵە دانیشن**
**شەڕ ناهێڵێ بووکەکەم منالێکی جوانی ببێ**
**ببمە خاوەنی نەوەیەك**
**لەمیانی نەنکم و مارکس جیاوازییێکی ئابوورییە**
**لەمیانی نەنکم و ماودا جیاوازییێکی فیکرییە**
**لەمیانی نەنکم و فرۆید جیاوازییێکی دڵدارییە**
**لەمیانی نەنکم و گاریباڵد جیاوازییێکی ئەقڵییە** (٢٢٢:٥)

ئەو مەعریفەیەی، کە لەزانستدا وەچنگ دەکەوێ هەرگیز بەلای ئەم جۆرە لێکدانەوانەدا ناڕوات، بەهەمان شێوە مەعریفەی فەلسەفیش، چونکە لە فەلسەفەدا بیری سەرپێیی و بیری فەیلەسووفان بەراورد ناکرێت و ئەگەر بەراوردیش کرا، ئەوا فەیلەسووف بۆیە باس لەبیری خەڵکی سادە دەکات تا بۆمانی بسەلمێنێت، کە ئەوەی ڕەشۆکی بیری لێ دەکەنەوە هەڵەیە و ئەوەی ئەو دەیڵێت ڕاستەقینەیە. هەرچی ئەوەی ئێمە لەم شیعرەدا دەیبینین و ئەم جۆرە بۆچوونانەش تەنیا لەشیعردا دەبینرێن ئەوەیە شاعیر هاتووە بیری پیرەژنێکی دونیا دیتەی کاڵبووەوە لەژیان بەبیری بیرمەند و فەیلەسووفە هەرە گەورەکانی جیهان بەراورد دەکات و بڕیار لەسەر ئەوە نادات، کە کامیان باشترە، بەڵام پێشمان ناڵێت، کە کامەیان خراپە، کە ئەمە بۆخۆی بەرزکردنەوە و بایەخدانە بەبیری کەسانی سادە، کە زۆرجار وەك تاکە کەس ڕەنگە بیرکردنەوەیان لە بیرکردنەوەی فەیلەسووفان باشتر بێت.

### - جۆری مەعریفەی شیعری

ئێستا، کە لەوە دڵنیابووین لەناو شیعردا مەعریفە هەیە و ئەوەی شاعیر دەیڵێت شتێکی بێ کەڵك نییە، ئەوا پێویستە جۆری مەعریفەی شیعری دیاری بکەین داخۆ ئەو مەعریفەیە لەکام خانەی مەعریفەدا جێی دەبێتەوە.

مەعریفەی مرۆڤ لەلایەن ئەرەستۆوە بۆ سێ بەش دابەش کراوە: مەعریفەی تیۆری، مەعریفەی پراکتیکی، مەعریفەی هونەری. مەعریفەی ئەدەبیش، کە

بەشێکە لە مەعریفەی هونەری ((لەجۆری هەستی و رووکاری و فەلسەفییە)) (٣١٥:٢٥) کە هی یەکەمیان ئاشنابوونە بە ڕێسا دیارەکانی سروشت:

**لەبەر تینی زەماندا هەرشتێك كاڵ دەبێتەوە**
**مردن نەبێت،**
**نەدەتەوێت بە مانەوەی بڕوا بێنیت،**
**نەدەتوانیت بەهەمان ڕێدا بڕۆیتەوە** (٢٦:٢)

(مردن) ڕێسایەکە لە ڕێساکانی سروشت و بۆ مرۆڤ دانراوە و هیچ مرۆڤێك ناکرێت لەوە دڵنیابێت، کە نامرێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا هیچ مرۆڤێك نییە ئارەزووی ئەوە بکات بەو ڕێیەدا بڕوات و بمرێت. ئەم کۆپلە شیعرە دۆزینەوەی شتێکی نوێ یان زانیارییەکی نوێ نییە، بەڵکو دووبارەکردنەوەی هەمان ئەو شتانەیە، کە لەوەتەی مرۆڤ هەیە پێیان ئاشنایە و دەیانزانێت.

هی دووەمیان بەخشینی زانیاری سەرپێییە و شاعیر قووڵ نابێتەوە و بەدواداچوون بۆ ئەو چەمکانە ناکات، کە لە شیعرەکەیدا بەکاریان دێنێت:

**کاکە چەکەکەت لەشان کە!**
**مێژوو، شارستانی جەنگەڵ، ئیمپریالیزم، بیابان، تۆرانیزم، عرووبە، پانئێرانیزم، سنوور، پۆلیس، پترۆ دۆلار،**
**زەمانە گوللە باران کە!** (١٨٢:٣)

هەر لەیەك لەو چەمکانەی لەو شیعرەدا بەکارهاتوون دەکرێت زیاتر لەکتێبێکی لەسەر بنووسرێت، بەڵام شاعیر ئەوەندەی بەس بووە، کە ناویان بێنێ و وردبوونەوە و قووڵبونەوە لێیان بۆ خوێنەر جێ بێڵێت، کە ئەمە هێزی شیعرەکەی زیاتر کردووە نەك کەمی کردبێتەوە. شاعیر هاتووە داوا لە پێشمەرگە یان کاکی شۆڕشگێڕ دەکات چەك لەدژی هەموو ئەو شتانە بکاتە شان و گوللە بەهەموو ئەو شتانەوە بنێت، کە بەبڕوای شاعیر دوژمنی ئازادی و سەربەخۆیی میللەتەکەی ئەون و مەبەستەکەشی پێکاوە و ئەگەر لەمەش زیاتری بگوتبا ڕەنگە شیعرەکەی لە وتارێکی سیاسی نزیك ببایەوە نەوەك شیعر.

هی سێیەمیشیان ئەوەیە، کە ناوی نراوە شیعری فەلسەفی و قووڵبوونەوە و وردبوونەوەیەکی باشی تێدا کراوە:

**لە سێرمۆنی تاکبوونەوەدا**
**بەهێما غەیب دەدوێنم،**
**دڵیشم لەپێشوازی یەقیندا**
**وەك شەوی بیابان چاوەڕێیە** (٩١:٢)

مرۆڤ بۆ ئەوەی بەیەقین بگات پێویستە پێشتر خۆی ئامادە کردبێت، ئەو ئامادەکارییەش بەخۆدابڕین لەگشت و وەك تاك بیرکردنەوە دەستپێدەکات. شاعیر ئێستا ڕووەو قۆناخی تاکبوونەوە هەنگاو دەنێت و خەریکی مەراسیم و خۆئامادەکردنە بۆ ئەم کارە. هەنگاوی دووەم گەیشتنە بەیەقین و شاعیر خۆی ئامادەکردووە بۆ ئەوەی بگاتە یەقین و ماوەیەکی یەکجار زۆرە لەچاوەڕوانیدایە، بەڵام هێشتا بەو یەقینە نەگەیشتووە، کە شاعیر باوەڕی بەبوونی هەیە. ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە شاعیر ئەگەرچی ماتریالە و لەتەواوی دیوانەکەیدا ئەوە دەخوێندرێتەوە ئەو لەگەڵ ماددە دایە نەك ڕۆح، بەڵام لێرەدا دەبینین دەیەوێ لەڕێی دڵەوە یەقین بناسێت، کە گەیشتن بەیەقین لەڕێی دڵەوە زیاتر کاری سۆفی و عارفەکانە.

### - تایبەتمەندییەکانی مەعریفەی شیعری:

مەعریفەی شیعری وەکو جۆرەکانی دیکەی مەعریفە خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندییە، لەوانە:

**أ- بێ ڕەهایی**

هایدگەر لەکتێبی نیچەدا دەڵێ: ((هونەری مەزن لەو ڕووەوە مەزنە کە حەقیقەتی بوونەکان وەکو یەك گشت، واتە کارێکی بێ مەرج و ڕەها ئاشکرا دەکا)) (٢٢:٢١). دەشتی کاتێك باسی شیعرمان بۆ دەکا بەم شێوەیە لێی دەدوێ:

**شیعر گوڵە، شیعر ئاوە.. شیعر خوێنە**
**شیعر هێلانەی تەمەنی، ڕێبوارێکی سەرهەڵگری دوای شوێنە** (١٣:٥)

وەك دەبینین شیعر وەك بوونێك بەچەندین شت دانراوە، کە لەهەریەك لەو شتانە خەسڵەتێکی وەرگرتووە. شیعر گوڵە، چونکە ناسکە، هەروەها ئاوە،

لەبەرئـەوەی بـەردەوام لەنوێبوونـەوە دایـە و هـەرگیز لەکـەڵك ناکـەوێت. بـۆ ئـەو کەسـانەی پەناگەیـەکیان نییـە شـیعر پـەنایان دەداو دەتوانرێـت وەك دوایـین وێستگەی گیرسانەوە سەودای لەگەڵدا بکرێت. هـەموو ئـەو زانیارییـە جیاوازانـەی لێرەدا لەبارەی شیعرەوە گوتراون بوونەتە هۆی ئەوەی بەرەهایی هیچ زانیارییـەك رەت نەکەینـەوە و لـە هـەمان کاتیـشدا هـیچ زانیارییێـك بەتـەواو و بـێ کـەموکوڕی دانەنێین.

**ب- مەعریفەیەکی ئاماژەییە:**

زۆرجار لە مەعریفەی شـیعریدا نـاوی فەیلەسـووف یـان بیرمەنـدێك دەبرێـت، و لەیەك ڕووەوە قسەی لەبارەوە دەکرێت، و شـاعیر نایـەت بـەقووڵی باسـی تیـۆری فەیلەسووفەکەمان بۆبکا:

**جیاوازییە ئابوورییەکەی نەنکم و مارکس ئەوەیە**
**مارکس کارگە بەباشتر دەزانێ بۆ قەیسی**
**لەلای نەنکم هەتاوی گەرم**          (٢٢٢:٥)

(مـارکس) و تیـۆرە ئابوورییەکـەی لێـرەدا ناویـان هـاتووە، بـەلاّم هـیچ وردەکارییەکیان لەبارەوە نەگوتراوە و تەنیا بە ئاماژە ئاماژەیان پێ کراوە.

**پ- ئەوەی کە پێویستە دەیکاتە مومکین:**

**وەرە ئەی جوانترین دۆستی هەموو رۆژێم**
**ژیان بە بێهوودەییەوە جوانە**
**بینۆشە ئێمە سەفەرین**          (٥٩:٥)

لەکاتێکدا لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەم دونیایە بەهەند هەڵبگرێت، جا چ مرۆڤێکی خواناس بێت و چ باوەڕی بەخوا نەبێت، چونکە ئەگەر خواناس بێت دەبێت ژیـانی دونیا بەگرنگ بزانێت و بەڕشـتی بیباتەسـەر تـا لـەقۆناغی دوای ئـەو سـەرکەوتوو بێت. ئەگەر باوەڕیشی بەخوا و دووبـارە زیندووبوونـەوە نـەبێت، ئـەوا هـەردەبێت ئەو ژیانەی لا گرنگ بێـت، چـونکە ئەمـە دەرفەتێکـەو بـۆی ڕەخساوە و جـارێکی دیکە نایبینێتەوە، بەلاّم شاعیری ئێمـە هـاتووە دەڵێـت ئـەم ژیانـە بـێ هوودەیـەو کەڵکی ئەوەی نییە زۆر خۆتی پێوە خەریك بکەیت.

**ت– فرە لۆژیکی و جۆش دامێنەری عەقڵەکانە:**

شاعیر ئەو زانیارییانەی دەیزانێت یان دەریاندەبڕێ زۆر لە قەوارەی خۆیان گەورەتریان دەکات و ڕەوانبێژییەکی زۆریان تێدا ئەنجام دەدا ئینجا دەریاندەبڕێ، بۆنموونە:

**شیعر نەبا من مرۆیەکی سەقەت بووم**
**شیعر نەبا جوزامی مێژوو دەیخواردم**
**لووتکە گڕی تیَ بەردەدام**
**قەڵی غوربەت لەناو وەردی برینمدا**
**لەخاچی شەوی درێژی خۆیان دەدام** (٦١:٥)

ڕاستە شیعر پاژێکی گرنگی ژیانی شاعیرە و ئێستا ئەگەر شیعر لەژیانی شاعیردا نەمێنێ هەست بەکەلێنێکی گەورە دەکا لەژیانیدا، بەلاَم ئەمە مانای ئەوە نییە شاعیر نەتوانێ بێ شیعر بژیێ، ئەگەر وابێ بۆچی هەموو شتەکانی دیکەی ژیانی پەراوێز ناخاو تەنیا بە شیعرەوە سەرقاڵ نابێ.

جگە لەوەش شاعیر هەندێك ڕستە و وێنەی شیعری دروست دەکات، کە لەڕووە ئاساییەکەی ژیان بە ئاسانی وەرناگیرێن:

**ئەوە منیش وا بووم بە ئاو**
**ئێستا پەی بەهەموو نهێنییەکانت دەبەم**
**ئەوە نەبێ تۆ ئاوێکی پڕ نوور و**
**منیش دڵۆپە ئاوێکی تەنها و تەنها**
**هەرجارەی شەپۆلێکی جوانیت**
**بەرەو دەریاییێکم دەبا**
**مالاْوا ئەی ئاویترین ئاو مالاْوا** (٢٨:٤)

حەقیقەت لەم شیعرەدا ئاوەژوو کراوەتەوە، شاعیر و یاری شاعیر لە سەرەتادا لەئاو دروست بوون و دواتر بوون بە شتێکی دیکە و ئیدی نابنەوە بەئاو، بەلاَم شاعیر هاتووە ئەمەی ئاوەژوو کردۆتەوە و یارەکەی بەئاو داناوە و دواتر بۆئەوەی لە نهێنییەکانی یارەکەی بگات خۆشی کردووە بەئاو. ئەم جۆرە مەعریفەیە دەبێتە مایەی سەرسوڕمان لای خوێنەر و گوێگر.

**ج- جیهانێکی تایبەتە**

شاعیر نەبەقەد مێژوونووس لە شتە تایبەت و دیاریکراوەکان دەدوێت و نە وەکو فەیلەسووفیش گشتییە، بەڵکو دەکەوێتە نێوان هەردووکیان. ئەوەی شاعیر لە رووی مەعریفەوە لە فەیلەسووف جودا دەکاتەوە ئەوەیە ((شاعیر درکی بەهەموو ئەو شتانە کردووە کە فەیلەسووف پشتگوێی خستوون، ئەو درکی بەو مەحاڵە کردووە، کە مرۆڤ هەبوونی خۆی لەخودی خۆیدایە)) (١٣:١٤٠) کە ئەمە لای فەیلەسووف کارێکی ئاسان نییە و ئەو کاتێك باس لەبوونی مرۆڤ دەکات دەیبەستێتەوە بەبوونەکانی دیکە و گشتێك پێکدەهێنێت، هەرچی شاعیرە بەدابڕاوی لەخۆی دەدوێ و زۆرجاریش تەنانەت خۆشی دەکاتە چەند بەشێك:

**بەرێوە... زەمانم لەگەڵ رێ دەکات. لەسیمای خوناودا**
**وێنەی خۆم دەبینم،**
**بەشێکم وەك باڵی وەریی پەپوولە بۆ نیشان بۆ گەمەی**
**رێکەوت جێماوە، بەشێکی دیکەشم بەنێو نادیاریدا**
**دوای ماناو چارەنووس کەوتووە** (٢:١٢-١٣)

رێکەوت رۆڵێکی گرنگ لەژیانی شاعیر دەبینێ و ئەو پێی وایە هەم بوونی خۆی و هەم هەموو ئەو بوونانەی لە دەوروبەریدان بەرهەمی رێککەوتن و هیچ کەس دروستی نەکردوون کە ئەمە باسکردنی ئەو دەسپێکەیە کە مرۆڤی لێوە هاتووە، پاژەکەی دیکە مرۆڤ خەریکی ئەوەیە لەوە تێبگا کە چارەنووس چی بۆ دیارکردووە و بەرەو کوێی دەبا.

**ح- واقیع وەکو خۆی ناگوازێتەوە**

ئەگەرچی شاعیران کەڵکێکی زۆر لەواقیع وەردەگرن و واقیع خاڵی دەسپێکییانە، بەڵام بەردەوام نابن لەپەیوەتستییان بەو واقیعەوە و لەرێی خەیاڵەوە بۆچوون و هەست و سۆزو لێکدانەوەکانیان تێکەڵ بەو واقیعە دەکەن کە لێی دەدوێن:

**ئەو رۆژەی کە تۆم**
**لە ناو پاوانی گیادا بینی**

**بەپەلە رامکرد تا بتبینمەوە**
**بەڵام ئاخ لەگەڵ گیا تێکەڵ بووی**
**بۆیە دووبارە ونم کردیەوە** (٨٠:٤)

سەرەتای ئەم شیعرە سەرەتایەکی واقیعییەو شاعیر یارەکەی خۆی لەناو گیادا بینیوە، کەچی بەردەوامی ناداتە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە بەشێوەیەکی واقیعی و خەیاڵ تێکەڵ بە واقیع دەکات و یارەکەی دەکاتە گیا و سەرەنجام لێی ون دەبێت.

**خ- شاعیر مەعریفەی زمانی و ڕێزمانی هەیە**

شاعیر بەر لەوەی دەست بەنووسینی هەر شیعرێك بکات شارەزای ئەو زمانەیە شیعری پێ دەنووسێت، بەهەمان شێوە دەبێت شارەزای زمانی نووسینی ئەدەبیات و شیعری سەردەمی خۆی بێت و لەو ڕێساو یاسایانە تێبگات، کە لەسەردەمی ئەودا لە شیعردا پەیڕەو کراون:

**کە ئێوە جێ دێڵم**
**ڕێبواری ناوەختەم لای ئێوە**
**هەربۆیەش دەچمەوە لای گۆڕی دۆستانم**
**دەزانم ڕۆژێ دێ میوانی ئەبەدی ئەوانم** (٣٥٢:٥)

ناسین و زانینی ڕێساکانی زمان و لادانە زمانییەکانیش شتێك نییە شاعیر تازە فێریان بووبێت، بەڵکو زمان زمانی دایکەو ئەو بەسروشتی فێری بووە. جگە لەوە (دەشتی) ئەوەی لەبەرچاو بووە، کە ئەو شاعیرێکی هاوچەرخە و کلاسیك نییە، بۆیە نە پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی کێش و نە سەرواشی بەکارهێناوە و وشەی عەرەبی و فارسی و تورکیش لە شیعرەکەیدا بەدی ناکرێن.

**د- مەعریفەی شیعریی سادەیە**

ڕێژەی زۆری ئەو مەعریفەیەی لەشیعردا هەیە مەعریفەیەکی سادەیە و ئاڵۆز نییە، بەڵام هەندێك شیعر واتاکەیان لێڵە و ئاسان نادۆزرێنەوە ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی ڕەمزەوە دەبێ ((لێڵی خاسیەتێکی ناخی شیعرە، هەموو دەقێك ئەو

خاسیەتە بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە، بۆیە لەداهێناندا دەستی لێ هەڵناگیرێت، جێگاو شوێنیشی لەناو مووڕەگەکانی ڕەگی شیعردایە)) (١٨١:١)، ئەو لێڵییەش وەنەبێت لەبێ واتایی ڕستە شیعرییەکانەوە بێت، بەڵکو لەزۆری ئەو واتایانەیە کە هەر ڕستەیەکی شیعری دەیگەیەنێت، هەرکاتێکیش توانرا پەیوەندی نێوان ڕەمزە بەکارهێنراوەکە و شیعرەکە بدۆزرێتەوە ئەوا شیعرەکە هیچ ئاڵۆزییەکی تێدا نامێنێ لەو کاتەشدا کەسی لێکدەرەوە هەم خۆشی پێدەگا و هەم مەعریفە، بەڵام سەرچاوەی خۆشییەکەش هەر مەعریفەیە. ((شیعر لەنێو جەماوەری خوێنەردا بڕێکی یەکجار زۆر مەعریفە بڵاو دەکاتەوە)) (٩٠:٩) نهێنی ئەو توانایەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاسانی مەعریفەی شیعری و بەئاسانی تێگەیشتنی تاکەکان. بۆیە دەگوترێ: ((مەعریفەی شیعر خواردنی ﴿هەموو جۆرە گەدەیەکە هەتا﴾ هی بێ هێزترین میزاجەکانە، لە راستیدا شاعیر فەیلەسووفی ڕەشۆکییانە)) (١٢٠:٢٣) و ئەوەی فەیلەسووف ناتوانێ بۆ کەسیی ئاسایی شی بکاتەوە و تێیان بگەیەنێ، شاعیر زۆر بەئاسانی ئەم کارەدەکا:

**ئای کە سەرسامم تۆ بوویت بەگیا**
**وشەی خواو گیا**
**چەند لەیەك دەچن...**
**کە دەچمەوە مێرگەکان**
**دەزانم تۆ لەهەموو شوێنێکی**
**هەموو زەویت داگیرکردووە**
**منت ڕەهای دەرەوەی کەون کردووە** (٧٢:٤-٧٣)

شاعیر زۆر بەئاسانی بەخودای خۆی دەڵێت دەزانم تۆ لەهەموو شوێنێکی و ئەوەش بەئاسانی لەخەڵك دەگەیەنێت، کە شاعیر باوەڕی بەبوونی خودا هەیە و خوداکەی ئەو خۆی لەهەموو شتێك دەنوێنێت و مرۆڤ بیەوێت لەهەر شوێنێك بیدۆزێتەوە دەیدۆزێتەوە.

**ژ- مەعریفەی شیعری مەعریفەیەکی ڕێکنەخراوە**

کاتێك هەموو ئەو بابەتانەی دەورووژێن و قسەیان لەبارەوە دەکرێت لەڕێی هۆ و هۆکار و بەڵگەوە نەسەلمێندرێن، ئەوا ئەو مەعریفەیەی، کە لێیان دەکەوێتەوە مەعریفەیەکی ڕیکنەخراو و تاڕادەیەك هەڕەمەکی دەبێت. دیارە ئەمە واتای ئەوە نییە، کە لەناو شیعردا بەهیچ شێوەیەك سەلماندن و لۆژیك نییە، بەڵام ئەوەی هەیە کەمە:

**تۆ هەر ئاویت!**
**دەسووتێیت و تۆ هەر ئاویت!**
**مەودامان دەپێچیتەوە... تۆ هەر ئاویت!**
**گوناهی هەموو سەدەکان دەشۆیتەوە... تۆ هەر ئاویت...**
**ڕەنگەکان بەتۆ نامۆن و**
**کەچی تۆی وزەی ڕەنگەکان**
**ئەی نهێنی ئەم گەردوونە و سەرداری کات و مەوداکان** (٣١:٣)

هەمووومان ئەوە دەزانین، کە ئاو بەرزی و نزمی تێدا نییە و ڕاستە و یەکێك لە کارەکانی ئاو ئەوەیە شتە پیسەکان بشواتەوە. هەروەها ئاو بێ ڕەنگە و لەبەرئەوەی هۆی ژیانە لەسەر زەوی، بۆیە بەنهێنی مرۆڤایەتی و گەردوونیش دادەنرێت. ئەو هەموو زانیارییە لەسەر ئاو لە چەند دێڕێکدا گوتراوە بێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك هەوڵی سەلماندنی ئەو ڕاستییانە بدرێت، یان ریزبەندییەك بکرێت بۆئەوەی ئەو زانیارییانە یەك لەدوایەك ڕێکبخرێن.

**ر- مەعریفەی شیعری کۆتایی نایەت**

لەبەرئەوەی ((ئەدەبیات ئەو بارەی هەیە کە ئاسۆی بیرکردنەوەمان فراوان بکا)) (٢٢٧:١٥)، بۆیە شاعیر هەوڵدەدا زۆرترین ڕێژەی زانیاری بەخوێنەرانی بدا و بیری هەموو ئەو کەسانە دەخوێنێتەوە کە وەکو سەرچاوەی مەعریفە دەردەکەون و سەرەنجام ((شاعیر پێغەمبەر و فەیلەسووف و وێنەکێش و مۆزیکژەن و پیرە، لێرەوە بەرهەمەکەی کاریگەری و نیشانەی هەریەك لەو کەسایەتییانەی پێوە دیارە)) (٢٧:٢٣) و بایەخ بەوە نادا کە ئەو مەعریفەیەی لەکوێوە دەستکەوتووە،

بەڵکو ئـەوەی بـەلای ئـەوەوە گرنگـە ئەمـە چـۆن لەگـەڵ جوانیـدا ئاوێتـە بکـات و دووبارە دایبڕێژێتەوە.

نهێنـی کۆتـایی نـەهاتنی مەعریفـەی شـیعری بـۆ خەسـڵەتی خـودی شـیعر دەگەڕێتەوە، بەجۆرێك لە شیعردا دەکرێت ئەگـەر بـچووکترین پەیوەنـدی لـەنێوان دوو شتدا هەبێت بەیەکەوەیان ببەستییەوە، کـە ئەمـە لـە سەرچـاوەکانی دیکـەی مەعریفەدا بەدی ناکرێت:

**ڕەگەزی باز بەفر و باران و درەخت و تەمتومانە**
**ڕەگەزی باز ڕێیەکی دەچێتەوە ئاسمان**
**ڕێیەکیشی دەچێتەوە سەر قەرەجان**
**ڕەگەزی باز هەندێ جار دەڵێی لە بایە**
**هەندێ جاریش لە برووسك**
**هەر شتێ بەرز بنوێنێ**
**ڕەگەزی باز ئە لەوێدا سەر دەردێنێ...** (٧:٦)

**هەرچییەك کە لەسروشتدا هەیە و خەسڵەتێك لەو خەسڵەتانەی تێدایە کە باز هەیەتی دەکرێ باز و بوونی بازی پێ لێکبدرێتەوە.**

## ئەنجام

لە شیعردا مەعریفە هەیە، بەڵام مەعریفە زانستی نییە.

بەشێوەیەکی ڕێژەیی دەتوانرێت هەموو جۆرەکانی مەعریفە لە شیعردا ببینرێن، بەڵام لەجۆرەکانی دیکەی مەعریفەدا مەعریفەی شیعری نییە.

لە هەموو شیعرێکدا حەقیقەت هەیە، چونکە هەموو شیعرێك جوانە و هەموو جوانییەکیش حەقیقەتە.

مەعریفەی شیعر لەجۆری هەستی و رووکاری و فەلسەفییە.

لە مەعریفەی شیعریدا ڕەهایی نییە و مەعریفەیەکی سادەیە.

مەعریفەی شیعری مەعریفەیەکی ئاماژەییە و ڕێکنەخراوە.

بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی شیعر هەیەتی مەعریفەی شیعری کۆتایی نایەت.

## سەرچاوەکان

### سەرچاوە بەزمانی کوردی

١. ئازاد ئەحمەد مەحموود (د.)، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا (١٩٨٥–٢٠٠٥)، بلاّوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر–٢٠٠٩.
٢. رەفیق سابیر، بەتەنیا جێی مەهێڵن، چاپی یەکەم، چاپ و بلاّوکردنەوەی چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٦.
٣. رەفیق سابیر، رازو گومان، چاپی یەکەم، چاپ و بلاّوکردنەوەی چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٦.
٤. کەریم دەشتی، کتێبی ئاو، دەزگای مۆزیك و کەلەپووری کوردی، چاپخانەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر–٢٠٠٩.
٥. کەریم دەشتی، پیانۆی رۆژهەلاّت و ئەوانی دی، پیانۆی رۆژهەلاّت و ئەوانی دی، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر–٢٠٠٤.
٦. کەریم دەشتی، کتێبی نەی، دەزگای مۆزیك و کەلەپووری کوردی، چاپخانەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر–٢٠٠٩.
٧. لیۆن تۆلستۆی، هونەر چییە؟، وەرگێڕانی بۆ کوردی: هەژار رەحیمی، دەزگای توێژینەوە و بلاّوکردنەوەی موکریانی، هەولێر–٢٠٠٩.

### سەرچاوە بەزمانی عەرەبی

١– جيل دولز، نيتشة والفلسفة، ترجمة: اسامة الحاج، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، بيروت–٢٠٠١.
٢– رجاء عيد (د.)، فلسفة الالتزام في النقد الادبي بين النظرية والتطبيق، منشأة المعارف، الاسكندرية–٢٠٠٠.
٣– رينية ويليك–اوستن وارن، نظرية الادب، ترجمة: محى الدين صبحي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت–١٩٨٧.

٤- سمير الزغبي (د.)، نيتشة/ فلسفة الفن والوهم وابداع الحياة، دار التنوير للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت-٢٠٠٩.
٥- مارتن هايدغر، اصل العمل الفني، ترجمة: د.أبوالعيد دودو، منشورات الجمل، الطبعة الاولى، كولونيا - المانيا،٢٠٠٣.
٦- ماريا ثامبرانو، الفلسفة والشعر، ترجمة: محمد البخاري بن سيدى المختار- د.كارلوس بارونا ناربيون، دار الثقافة العربية، القاهرة - ٢٠٠٨.

سەرچاوە بەزمانی فارسی

١. احسان عباس (د.)، شعر و اينة، ترجمة سيد حسين حسينى، انتشارات سروش، ضاث اول، تهران-١٣٨٨.
٢. اولة مارتين اسكيلاس، در امدى بر فلسفة و ادبيات، مرتضى نادرى درة شورى، نشر اختران، ضاث اول، تهران-١٣٨٧.
٣. بابك احمدى، هايدگر و تاريخ هستى، نشر مركز، چاپ چهارم، تهران-١٣٨٦.
٤. بلقيس سليمانى، هنر و زيبايى از ديدطاة افلاتون، انتشارات طوهر منظوم، ضاث اول، تهران-١٣٧٩.
٥. پل والرى و ديگران، درباره شعر، وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامى-سازمان چاپ و انتشارات، چاپ دوم، تهران-١٣٨٦.
٦. جان هاسثرز-راجر اسكراتن، فلسفة هنر و زيبايى شناسى، ترجمة دكتر يعقوب ارذند، مؤسسه انتشارات و چاپ و دانشگاه، تهران-١٣٧٩.
٧. جان هرمن رندل و جاستون باكلر، در امدى به فلسفه، انتشارات سروش، چاپ دوم، تهران-١٣٧٥.
٨. جوليان يانگ، فلسفه هنر هايدگر، مترجم: امير مزيار، انتشارات گام نو، چاپ دوم، تهران-١٣٨٧.
٩. حسين بلخارى قهى (د.)، اشناى با فلسفه هنر، انتشارات سوره مهر، چاپ اول، تهران-١٣٨٨.

١٠.دیوید دیچز، شیوەهای نقد ادبی، ترجمە: محمد تقی صدقیانی- دکتر غلامحسین یوسفی، انتشارات علمی، چاپ مهارت، چاپ پنجم، تهران-١٣٧٨.

١١. سید حسین امین (پرفیسور)، دانشنامە شعر، انتشارات دایرە المعارف ایران شناسی، تهران-١٣٨٧.

١٢. سیروس شمیسا (د.)، نقد ادبی، انتشارات فردوس، چاپ اول، تهران-١٣٧٨.

١٣. گوردن گراهام، فلسفە هنرها: در امدی بر زیبا شناسی، ترجمە مسعود علیا، انتشارات ققنوس، چاپ سوم، تهران-١٣٨٧.

١٤. نجمە رجائی (د.)، شعر و شرر، انتشارات دانشگاە، فردوسی مشهد، چاپ اول، مشهد-١٣٨٢.

## ملخص

بما ان الشعر له وجود خاص، اذا علينـا ان نعـرف ذلـك الوجـود في نفس الوقـت نعرف تلك المعرفة التي تعطينا ذلك الوجود، فقبل ان نقر صحة وعدم صحة وحقيقـة أو ظهور اى وجود، علينا في بادئ الامـر ان نتحقـق مـن ذلـك الوجـود الى حـد ممكـن ومعقـول وان نحـدد خصائـصه وفي حـال اثبتنـا عـدم صـحته، يجـب ان نبـدل هـذه المعلومات بمعلومات صحيحة.

هذا البحث تحت عنوان (معرفة الشعرية بأمثلة علـى اشـعار كـريم دشـتى و رفيـق صابر). يتكون من ثلاثة مواضيع رئيسية، في الموضوع الاول عرفنا المعرفة وعرضنا تلك الاراء التي ترفض وجود اي شكل من اشكال المعرفة في الشعر وتصر في حال ان لم يكن الشعر للمتعة فلا فائدة له.

الموضوع الثاني للبحث هو اثبات وجود المعرفـة الـشعرية وتحديـد نـوع المعرفـة الشعرية عدا المعرفة العلمية يمكن التأسيس والاستفادة من جميع انواع المعرفة وذلك بالاعتماد على اشعار الشعراء.

خصوصيات وخصائص المعرفة الشعرية مـع الامثلـة الـشعرية سـنتحدث عنهـا في الموضوع الثالث، بالاضـافة الى اثبـات بـأن المعرفـة الـشعرية لـيست اقـل شـأنا مـن المعارف الاخرى.

في نهاية هذا البحث توصلنا الى مجموعة من النتائج.

# Abstract

According to the fact that (poetry) has its own existence .so it should be recognized and the knowledge behind (poetry) should be realized too. Because before we decide about truth ,mistruth reality or the appearance of any kind existence ,first we should study this existence accurately ,to a degree we can mark its features and prove that all information are said a bout it is incorrect and replace them with the corrects once.

This research is given the title (poetic knowledge in the) sample of Kareem Dashti and Rafeeq Sabir ) The research consists of three main chapters, First chapter define knowledge and we show the opinion that refuse the existence of knowledge in poetry and they insist on that if poetry isn’t a way to get feeling and emotion, then its useless. The second chapter of the research is the proof of the existence of poetic knowledge and marking the kinds of poetic that only scientific can not be established in poetry which the other types are useful both of the poets .

The themes and features of poetic knowledge and giving examples for each one shown in the third chapter we prove that also the poetic knowledge isn’t less than any other kinds of knowledge.

# سێگۆشەی دڵ و ئاگر و ئاوێنە لە شیعرەکانی مەحویدا

**( لێکۆڵینەوەیەکی مەعریفەناسی عیرفانییە )**

**ئامادەکردنی:**
**م. ی. سیروان جەبار ئەمین ( زەندی )**
**کۆلێژی زمان - زانکۆی سۆران**

## پێشەکی

لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا شیعر دابڕاو نییە لە هزر و شتێکی وەکو شیعر بۆ شیعر و شیعر بۆ جوانی و خەیاڵی پەتی بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو شیعر ئەرکێکی هاوشێوەی تێفکرینی لە ئەستۆدایە. عاریفان بەشی زۆری را و بۆچوونە عیرفانییەکانی خۆیان کە بریتییە لە بنەماکانی عیرفان و جیهانبینیی عیرفانی لە ڕێگەی شیعرەکانیانەوە خستووەتە روو. شیعر لە عیرفاندا ئەو زمانەیە کە دەکرێت بە هۆیەوە باس لە عیرفان و کاریگەری ئەزموونی عیرفانی بکرێت.

مەحوی وەکو شاعیرێکی عیرفانی لە ئەدەبیاتی کوردیدا رەنگە باس و پرسی عاریفبوون و سۆفیبوونی بڕابێتەوە چونکە لەلایەکەوە ڕێگە و تەریقەتەکەی و رەنگدانەوەیان لە شیعرەکانیدا بەڵگەی سۆفیبوونی ئەون و لەلایەکی تریشەوە خستنەڕووی فەلسەفە و جیهانبینیی عیرفانی لە شیعرەکانیدا عارفبوونی دەسەلمێنن واتە لە هەردوو بارەکەدا خۆی دەناسێنێت. ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی لێوە دەکەین لایەنی عیرفانی شیعرەکانی ناوبراوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە ناساندنێکی کورتی مەعریفەناسی عیرفانی و گەڕان بە دوای سەرەداو و شوێن پێی رەنگدانەوەی مەعریفەناسیی عیرفانی لە شیعرەکانی مەحویدا لە چوارچێوەی لێکدانەوەی چەند وشەیەکی وەکو ((دڵ)) و ((ئاگر)) و ((ئاوێنە))وە. سەرەتا لایەنی تیۆریی بابەتەکە خراوەتە روو و پاشان

نموونــەی شــیعری بــۆ دەستنیــشانکردنی پەیوەنــدی نێــوان تیــۆر و دەقــەکان هێنراوەتەوە، واتە هەوڵێکی تیۆری پراکیتکییە.

ئامـانجی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە نیـشاندانی رەنگدانـەوەی هـزر و مەعریفەناسـیی عیرفانییـە لـە نـاو شـیعرەکانی مەحویدا لەلایـەك و بەڵگەهێنانـەوە بـۆ ناسـاندنی مــەحوی زیــاتر لــە ســۆفییەکی ســادە و وەکــو عــاریفێکی ئاشــنا و بــاوەڕداری فەلسەفەی عیرفان، و لە کۆتاییـدا کـۆی ئەنجامگیرییـەکان لـە چـەند خاڵێکدا چڕ کراوەتەوە.

## عیرفان و مەعریفە

لە رووی زمانییەوە هەر دوو وشەی عیرفان و مەعریفە دەگەڕێنەوە سـەر یـەك سەرچاوە و ئەمەیش لێك نزیکی نێوانیان لە رووی واتاوە بە دیار دەخات کە لە ناو بازنــەی زانــین و ناســیندا بــە یــەك دەگەنــەوە. عیرفــانی ئیــسلامی لــە دەرەوە و ناوەوەی خۆی وەکو جۆرێکی تایبـەت لـە مەعریفەناسـی تەماشـا کـراوە[1]، چـونکە ((عیرفان بریتییە لە ناسینی خودا لە روانگەی ناو و سیفەتەکان و مەزاهیرەکانی و ناسـینی ئەحواڵـەکانی دەسـتپێك و گەڕانـەوە و ناسـینی راسـتییەکانی جیهـان و چۆنیەتی گەڕانەوەی ئەم راستییانە(کەسرەت) بۆ حەقیقەتی تاك و تەنیا کە زاتـی ئەحەدیەتە))[2]، بەڵام مەعریفەیەك کە لـە رێگـەی عەقڵـەوە نییـە بـەڵکو لـە رێگـەی تەجروبـەی نـاوەوە (بـاطن)یـە و لـە کتێبـی ((احیـاء علـوم الـدین))دا بـە زانـستی موکاشەفە یان زانستی باتین ناو نراوە چونکە بریتییە لە رووناکییەك (نور) کـە لـە پاش ئەوەی دڵ لە سیفەتە ناپەسەندەکان پاك بوویەوە تیایدا دەردەکەوێت و لەم دەرکەوتنەوە شتگەلێکی زۆر کەشف دەبن کە پێشتر بە نا روون دەبینـران، بـەڵام ئێـستا مەعریفەیـەکی راسـتەقینە لـە بارەیانـەوە بـە دەسـت دێـت و بـە روونـی دەبینرێن[3]، کەواتە پرۆسەی مەعریفـەی عیرفـانی پرۆسـەیەکی ناوەکییـە و لـە نـاو ناخی عاریفدا بەرهەم دێت بۆیە لێرەدا دەچێتە خانەی زانستی حزوورییەوە، جێـی ئاماژەیە فەیلەسوفان و بیرمەندانی ئیسلامی کۆی زانستی مرۆڤ دابەش دەکەن بـۆ دوو جـۆری زانـستی حـسولی (وەرگـیراو) و زانـستی حـزووری (هـەڵقولاو)، جـۆری یەکەم ((مەعریفەیەکی بـە نێوانکـارە و زانـستێکە کـە لـە رێگـەی چـەمك و وێنـەی

هۆشەکیی شتەکانەوە بەرهەم دێت...و ئەگەری هەڵـەبوونی لەگەڵدایـە))[٤] و جـۆری دووەم ((مەعریفەیەکی بێ نێوانکارە و لەم جۆرەدا واقیعیەت و بوونی زانراو لـەلای خوازیاری مەعریفە ئامادەیە))[٥] بۆیە لە هەڵە بە دوورە. لەو شوێنەوەی کە عـاریف لە رێگەی روانین لە ناخی خۆی لە پاش پاکبوونەوە بە دوای حەقیقەتدا دەگـەڕێت نەك لە رێگەی خودی شتەکانەوە چونکە پێیـان وایـە کـە ((..مـرۆڤ دەتوانێـت لـە رێگـەی نـاخ (بـاتین)ی خۆیـەوە لەگـەڵ حەقیقـەتی یـەکتای جیهانـدا پەیوەنـدی حزووری و شهوودیی هەبێت))[٦] بۆیـە دەچـێتە خانـەی زانـستی حزووریيـەوە و لـە هەڵە و نادروستی دادەماڵرێت.

عاریفەکان لە رێگەی دروستکردنی بەراوردکردنێك لە نێوان زانـست و مەعریفـە (لـە واتـا عیرفانییەکەیـدا) بەڵگـە و پاسـاو بـۆ نیـشاندانی بـەرزتر بـوونی ئاسـتی مەعریفە لە چاو زانستدا دەهێننەوە، بـە بـڕوای ئـەوان (بەتایبـەتی دێرینـەکانیان) جیاوازی بنەڕەتی هەیە لە نێوان زانست و مەعریفە بە تایبـەتی لـە رووی ئامـانجی پێگەیـشتنەوە، چـونکە زانـست هەوڵێکـە کـە ناتوانێـت لـە سـنووری ناسـین و لێکۆڵینەوەی رواڵـەتی شـتەکان تێپـەڕ بکـات و هەوڵـەکانی لـە نـاو ئـەم بازنەیـەدا دەسووڕێنەوە، بەڵام مەعریفە ئاگایی و بەسیرەتێکە کە پەیوەستە بـە تەجروبـەی راستەوخۆی شتەکان و لەلایەکی تریشەوە سروشتی زانست وەهایە کە دەکرێت لە کەسێکەوە بگواسترێتەوە بۆ کەسانی تر و ئەم پرۆسەی گواسـتنەوەیەش شـتێکی پەسەند کراو و خوازراوە، کەچی لە بەرامبەردا مەعریفە نە دەکرێت بگواسـترێتەوە و نە ئەم کارەیش تیایدا شتێکی پەسەندە[٧]، بەڵکو هەر کەسێك کە خوازیاری بێـت پێویستە سـەرەتا نـاخی خـۆی بـۆ ئامـادە بکـات و ئـەو رێ و شـوێنە تایبەتییانـە بگرێتە بەر کە بـۆ ئـەم مەبەسـتە پێویـستن و ئەمـەیش دەوەسـتێتە سـەر خـودی کەسـەکە و ناگواسـترێتەوە. عـاریف عـەوداڵی مەعریفـەی راسـتەقینەیە و بـۆ ئامادەبوون تا گەیشتن بەم ئامانجە دەبێت ئاست و قۆناغەکانی حاڵ و مەقامەکان تێپەڕێنێت. حاڵ ((ئـەو حاڵەیـە کـە بەسـەر دڵـی رێبـواردا دێ بـەبێ ئەنقەسـت و خورتی و یەکێ لـە مەرجـەکانی ئەوەیـە کـە چەسـپاو نییـە و لـە گۆڕاندایـە و هـی دیکەی بە دوادا دێت))[٨] کە ئەمانەن: ((موراقەبە، قورب، موحیبەت، خەوف، رجـا، شەوق، ئونس، تومەئنینە، موشاهەدە و یەقین)) و مەقامەکانیش کـە لـە حاڵـەکان

جێگیرترن و بەهۆی هـەوڵ و کۆشـشی رێبـوارەوە دێنـەدی، ((ئـەو قۆناغانـەن کـە رێبواری رێگەی حەق یەك لە دوای یەك دەیانبڕێت وەکو موسافیرێك کە بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەست دەبێت لە مەنزڵێکەوە بۆ مەنزڵێکی تـر بـڕوات و هـەتا مـەنزڵی پێشوو تێنەپەڕێنێت ناتوانێت پێ بنێتە مەنزڵی پاشـترەوە))[٩] ئـەوانیش ئەمانـەن: ((تەوبە، وەرع، زوهد، فەقر، تەوەکول، رەزا))[١٠].

کەواتە دەکرێت بوترێ: ((عیرفان مەعریفەیەکـە لەسـەر حاڵـەتێکی روحـانی و وەسف نەکراو دامەزراوە))[١١] و مەعریفەیش لە ناو عیرفاندا یەکسانە بـە مەعریفـەی سەرچاوەی بوون و هەموو راستییەکان کە خودایە و بەمەیش بـەزری بابـەتی ئـەم مەعریفەیـە بـە دیـار دەکـەوێت کـە کاریگـەری لەسـەر عـاریفیش دەبێـت چـونکە ((پێگـەی هـەر مرۆڤێـك لـە مەعریفەکەیدایـە و پایـەی هـەر مەعریفەیـەکیش لـە مەعرووف (زانراو)ەکەیدایە، لەبەر ئەوەی هـەر مەعریفەیـەك عاریفەکـەی خـۆی لـە سـایەی مەعرووفەکـەی و لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئـەودا بـەهادار دەکـات))[١٢]، ئـیبن عەرەبی لە بارەی ئەم مەعریفەیەوە رای وایە ((بەرزترینی مەعاریفەکان بریتییە لە مەعریفەی خودا و ئەمەیش لە رێگەی عەقڵەوە بەرهەم نایەت چونکە عەقڵ دەرکی خودا ناکات...بەڵکو بە دڵ و کەشف و سروش دەناسرێت))[١٣]و هەروەها سـەبارەت بە سێگۆشەی مەعریفەناسیش واتە بکەری مەعریفـە و بابـەتی مەعریفـە و رێگـە و ئامرازی مەعریفە بڕوای وایە کە لە مەعریفەناسـیی عیرفانیـدا ئـەو سـێ جەمـسەرە یەك دەگرن واتە بکـەری مەعریفـە و بابـەتی مەعریفـە و رێگـەی مەعریفـە لـە یـەك شوێندا کۆ دەبنەوە کە ناخی خـودی مرۆڤـە، بۆیـە مەعریفەیـەکی بـێ دوو دڵـی و جێی متمانەی لێوە بەرهەم دێت[١٤].

## مەعریفەناسیی عیرفانی

هەوڵـدان بـۆ بەدەسـتهێنانی پێناسـەیەکە گـشتگیر و تـەواو لـە بـارەی مەعریفەناسیی عیرفانی و چـڕکردنەوەی لـە چوارچێوەی چـەند وشـەیەکدا ئەگـەر کارێکی مەحاڵیش نەبێت هێندە سەخت و ئاڵۆزە کە تێگەیشتنی بۆ هەموو کەسێك سادە و ئاسان نییە. هەروەکو بینیمان لێرەدا بەرهەمهێنانی مەعریفە سروشـتێکی زاتی و تاکەکەسی لـە خـۆ دەگرێـت و بـە رێڕەوێکـی ئـاڵۆزی وەکـو نـاخی مرۆڤـدا

گـوزەر دەکـات و لـە هەموویـشی کێـشەتر ئەوەیـە کـە ناکرێـت ئـەم ئەزموونـە بگواسترێتەوە یاخود بە زمانێکی گشتی و ساکار گوزارشـتی لـێ بکرێـت، لەگـەڵ هەموو ئەم ئاستەنگانەیشدا لە نووسراو و دەقە عیرفانییەکاندا بـە چـەندین شـێوە باس لەم بابەتە کراوە و هەندێ لەلایەنەکانی خراونەتـە روو کـە لێـرەدا ئامـاژە بـە هەندێکیان دەکەین.

لـە پێناسـەیەکدا هـاتووە ((مەعریفـە لـەلای سـۆفییەکان شـتێکە کـە لەلایـەن خوداوە بۆ خاوەنەکەی تەنیا بە شێوەی ئیلهام یاخود کەشف، کەشف دەبێت))[15]، سەرەتا سەرچـاوە و پاشـان کەناڵـەکانی گواسـتنەوەی ئـەم مەعریفەیـە خۆبـەخۆ لـەلای بڕوادارانـی دەبنـە بەڵگـەی رەسـەنایەتی و سـەرووتری بـوون بـۆی. ئـیبن عەرەبی پۆلێنکردنێك بـۆ مەعریفـە و زانـستەکان دەخاتـە روو و تیایـدا بـە روونـی ئاماژە بۆ ئەم واتایـە دەکـات. نـاوبراو مەعریفـە و زانـستەکان دابەشـی سـێ جـۆر دەکات:

یەکەم: زانستی عەقڵی واتە هەموو ئەو زانیارییانەی کە لـە رێگـەی بیرکردنـەوە و بەڵگەهێنانەوەی عەقڵییەوە بەدەست دێت، و دەکرێت دروست یان نادروست بن.

دووەم: زانستی چەشتن یان زانستی حـاڵ کـە مـرۆڤ ناتوانێـت لـە رێگـەی عـەقڵ و بەڵگەهێنانەوەوە بەم زانستە بگات و دەبێت کەسەکان بۆ خۆیان پێی بگەن وەکـو شـیرینی هـەنگوین و تـاڵیی سـەبر و ...هتـد. سـێیەم: زانـستی رازەکـان یـان نهێنییەکان (ئەسرار) و ئەم زانستە لە سەرووی سنوور و توانـای عەقڵەوەیـە و لـە رێگەی نەفەسی ((روح القدس))ەوە دەگواسـترێتەوە بـۆ نـاو دڵ و گیـانی مـرۆڤ و ئەمەیش تایبەتە بە پێغەمبـەران و ئـەولیا و خـاوەنی ئـەم زانـستە ئاگـاداری رازی هەموو زانستەکان دەبێت و سەرچاوەی هـەموو زانـستەکان لێرەوەیـە، خـودا ئـەم زانـستە بـە هـەر کەسـێك کـە بـۆ خـۆی بیـەوێت پێـی دەبەخـشێت[16]، مەعریفـەی عیرفانیش لەم جۆرەیە. بێگومان بابەتی زانستی رازەکـان دەبێـت هـەر راز بێـت و رازیش هەموو کاتێك بۆ وتن ناشـێت بـە تایبـەتی باسـکردن لـە جیهانێـك بێـت کـە خەڵکی ئاسایی بە ئاسانی رێی تێ نەبەن، عەتاری نەیشاپوری لە کتێبـی ((تـذکرة الاولیاء)) دا سێ دەستە زانا لە یـەکتر جیـا دەکاتـەوە، یەکـەم زانایـە بـە زانـستی زاهیر و زانستەکەیشی بە ئەهلی زاهـیر دەڵێـت، دووەم زانایـە بـە زانـستی بـاتین و

زانستەکەیشی بە ئەهلی باتین دەڵێت، و سێیەم زانا بە زانینێك کە لە نێوان ئـەو و خودادایە و ناکرێت ئەمە بە هیچ کەسێك بوترێت، دەستەی سێیەم زۆرترین ئاگایی لـە بـارەی رازەوە هەیـە و بۆیـە بـێ دەنـگ دەبێـت[17]، ئەوەنـدەی کـە لـە ئاسـت تێگەیشتنی هەموواندایە دەکرێت ئاشـکرا بکرێـت و هەندێکیـشی هـەرگیز، چـونکە رەنگە سەری خاوەنەکەی بە بادا بـدات وەکـو حـەلاج، تەنانـەت هەنـدێکی خـودی عاریفەکانیش ناتوانن لە چوارچێوەی وشەدا بیخەنە روو و بە زمـان گوزارشـتی لـێ بکەن. هـەبوونی ئـەم رازە و شـاردنەوەی و نـەتوانینیی دەربڕینـی بـە مەعریفـەی عیرفانییەوە دیارە و بۆتە هۆی دروستبوونی جۆرێك لە ناڕوونی و تەمومژی تیایدا.

یەکێك لە عاریفەکان دەڵێت: رێبازی ئەهلی عیرفـان ئەوەیـە هـەروەکو خۆیـان دەڵێن ئەو شتەی کە لە رێگەی حەق (کەشف و شهود)ەوە بۆیان بـە دەسـت دێـت ئەگەرچی بە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیش پشتڕاست نەکرێتەوە و نەسەلمێندرێت، هیچ جێـی دوودڵـی نییـە و گومـان رێـی تـێ نابـات[18]، و عاریفـان ئـەو زانـا ئـاینی و فەیلەسوفانەی کە بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی بالاّ، سوود لە عەقڵی بەڵگەهێنـەرەوە وەردەگرن بەو نابینایانە دەچوێنن کـە بـۆ ناسـینی ئـەو شـتەی دەبێـت ببینرێـت هەستی بەرکەوتنی خۆیان بە کار دەبەن و هەڵبەتە ئـەم هەوڵـە بـە ئامـانج ناگـات چونکە ناتوانێت بـە یـەقین بگـات[19]. شـێخ روزبـەهانی بـەقلی (٥٢٢–٦٠٦ کۆچـی) دەڵێـت: ((عاریفـەکان رازی لاهووتییـان بـەرەو مـاڵی ناسـووت هێنـا و بـە گیـانی لاهووت لە زمانی ناسـووتەوە قـسەیان کـرد))[20]بۆیـە بـەو پـەڕی متمانـەوە دەڵـێن: عیرفان ((رێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی راستییەکان و بـە یەکـەوە بەسـتنەوەی مـرۆڤ و حەقیقەت))[21]کە ئەمە ئامانجی مەعریفەیە.

**دڵ و عەشق لە مەعریفەناسیی مەحویدا**

لە عیرفاندا کە عەشق ناوەندەکەیەتی، دڵ مەڵبەندی سەرهەڵدانی عەشق و بـە واتایەك چـەقی تیـۆری مەعریفەناسـیی عیرفانییـە واتـە: دڵ و عەشـق بـە یەکـەوە زەمینەسازی مەعریفەی عیرفـانین. عیرفـان لـە بەرامبـەر فەلـسەفە کـە پـشت بـە عەقڵ و بیرکردنەوە و بەڵگەهێنانەوەی عەقڵانی دەبەستێت، متمانـە دەکاتـە سـەر دڵ و وەرگیراوەکانی دڵ کە بە هۆی عەشقەوە بە دەستی دەهێنێت. لێرەدا پەنجە

دەخەینە سەر پشتڕاستکردنەوەی مەحوی لە بارەی تێڕوانینە عیرفانییەکانی دڵ و عەشق یان عیرفانی بوونی تێڕوانینی مەحوی بۆ دڵ و عەشق.

گرنگیدانی عیرفـان بـە دڵ و عەشـق هـەر لـە خـۆوە سەرچـاوەی نـەگرتووە و زۆربەیان لە لێکدانەوەیەکی عیرفانی بـۆ چـەند ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز و چـەند فەرموودەیەکەوە سەر هەڵدەدەن. خودا زانای هەموو زانست و شتە نەزانراوەکانـە و ئەم سەرچـاوە بـێ هاوتایـەی زانـست لـە نـاو دڵـی هـەموو مرۆڤێکـی بـاوەڕداردا شوێنێکی هەیە بە واتایەکی تـر دڵـی بـاوەڕدارانی وەکـو مـاڵی خـۆی دەستنیـشان کردووە، وەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە: ((زەوی و ئاسمانـەکانم جێگـەی منیـان تیادا نابێتەوە بەڵام دڵی بەندەیەکی باوەڕدارم، من لە خۆدەگرێت))[٢٢]، کەواتە دڵی باوەڕدار بەگشتی و عاریف بە تایبەتی ماڵ و مەڵبەندی زانای هەموو زانستەکانن و بە واتایەکی تر دڵی عاریف خەزێنەی هەموو زانستەکانی لە ناوخۆیـدا هـەڵگرتووە، مەحوی لەم بارەیەوە دڵی مرۆڤ بە دڵۆپێك دەچوێنێت کە عەرشی رەحمـانی تیـادا جێ بووبێتەوە واتە گۆزەیەك کە دەریایەکی هەڵگرتووە و دەڵێت:

**چ دڵ؟ قەترێکە، ئەمما عەرشی رەحمانی تیا دەرجە**
**چ دڵ؟ نوقگێکە، ئەمما مەرکەزی پەرگاری ئیمکانە**[٢٣]

هـەروەها مـەحوی هـەمان بابـەتی پەیوەنـدی نێـوان دڵ و خـودا لـە روانگـەی لێکدانەوەیـەکی عاشـقانەوە دەخاتـەوە روو ئـەمجارەیان دڵ بـە شـوێنی هیجـر و وەسڵی یار دادەنێت و دەڵێت پێویستە دڵی عاشق بتوانێت هێندەی فەلەك و بگرە زیاتر لەویش بە دەست بێنێـت تـاوەکو لـە ئاسـت ئـەو ئەرکـەدا بێـت چـونکە یـار بوونێکی ئاسایی نییە و لە هەموو شوێنێك و دڵێکدا جێی نابێتەوە:

**دەبێ دڵ ویسعەتێکی وەك فەلەك زیاتر وە کەف بێنێ**
**شەو و رۆژی فیراق و وەصڵی دولبەر تا بگونجێنێ**[٢٤٧]

بەم پێیە دڵ لەگەڵ گەیشتنی بـە پلـەی عەرشـی خـودایی راسـتەوخۆ دەبێتـە خــاوەن پەنجەرەیــەك رووەو دنیــای مەعریفــە. لــە گۆشــە نیگایــەکی تــرەوە لێکدانـەوەی عەشـقی عاریفانـەیش پەیوەسـت دەبێـت بـەو خاڵـەی سـەرەوە. لـە ئایەتی حەفتا و دووی سورەتی ئەحزابدا باس لە ئەمانەتێکی خودایی دەکرێت کـە زەوی و ئاسمان و چیاکان نەیانتوانیٰ وەری بگرن و مـرۆڤ قبـوڵی هـەڵگرتنی کـرد،

عاریفان ئەم ئەمانەتـە بـە عەشـق و خۆشەویـستی خـودا لەقەڵـەم دەدەن[25] و بۆیـە مەحویش دەڵێت:

**خودا گرتوو دڵم، چووتن بە گژ شۆر و شەڕی عیشقا**
**بە نەصصی ئایە ئەفلاك و زەمین ئەم بارە ناکێشی[26]**

دەبینین پەیوەندییەك لە نێوان خاڵی یەکەم و ئەم خاڵـەدا هەیـە، لـە یەکەمـدا زەوی و ئاسمانەکان توانای لە خۆگرتنی خودایان نییە و دڵی باوەڕدار ئەم کـارەی پێ دەکرێت و لێرەیشدا خودا ئەمانـەتێکی هەیـە کـە زەوی و ئاسمانـەکان توانـای هەڵگرتنیان نییە و مرۆڤ هەڵیـدەگرێت، بۆیـە دەکرێـت بڵـێین ئـەوەی لـە هـەردووڵا بـاس کـراوە بریتییـە لـە یـەك مەبەسـت. لـە هـەر دوو بـاردا دڵـی مـرۆڤ توانـای بەجێگەیانـدنی کـارێکی هەیـە کـە لـە توانـای هـیچ بـوونێکی تـردا نییـە و زەوی و ئاسمان لە بەر باریدا دەناڵێنن:

**لە بەر باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز ئەناڵێنن**
**چییە ئەم دەعوەیە زاهید، جلی لێ بارە گاپیرت[27]**

لـە هـەردوو پەیوەندییەکـەدا دڵ لایـەنی پێوەندیکـەرە لـەلای مـرۆڤ و ڕۆڵـی سەرەکی وەبەر دەکەوێت. مەحوی ئەرکی مرۆڤ و لێپرسینەوەیـشی دەبەسـتێتەوە بە دڵەوە و رایدەگەیەنێت مرۆڤ بۆ سەربەرز بوون لە لێپرسینەوە و بە جێگەیاندنی ئەرکی خۆی کۆمەڵێك کاری دڵ توێنـەوەی لـە پێـشە واتـە گـرەوی روو سـووری و سەربڵندی مرۆڤ لە دەستی دڵیدایە:

**بەس کاری دڵ توێنەوە مەحوی لە پێشتە**
**(لایحسب الاناسی ان یترکوا سدی)[28]**

لە کۆتایی ئەم پێشەکییە کورتەدا بەو ئەنجامە دەگەین کە دڵ هێـڵ و کـەناڵی پەیوەندی و پێکەوە پەیوەستبوونی نێوان ئەفرێنەر و ئـەفرێنراوە و ئەفرێنـەر لـە ڕێگەی دڵەوە لەلای ئەفرێنراوەکەی حزوور و ئامادەبوونی دەبێت ئەگەر هاتو دڵـی ئەفرێنراوەکە ئامادەی بەرقەرار کردنی پەیوەندییـەکی لـەم جـۆرە بـوو. هـەروەها ئەفرێنەر بوونێکی زیندووە و چالاکە و ئامادەبوونیشی لە دڵی مرۆڤدا دەبێتە هۆی گواسـتنەوەی ئـەم زینـدوویی و چـالاکییە ئەفرێنـەری بـۆ مـرۆڤ و لـە ئاکامـدا کۆنترۆڵکردنی مرۆڤ لە سەر باری خوازراوی ئەفرێنەر، بـە واتایـەکی تـر بەخـشینی

وێنەیەکی ئەفرێنەری بە ئەفرێنراو. هەموو ئەمانە بە خواستی خودی دڵ بەڕێوە دەچێت نەك بە شێوەیەکی زۆرەملێ و سەپێندراو:

**بێمە کوێ؟ دلبەر وتی: گەر چاوە: طۆفانێکی ئەشك**

**دڵ: تەنووری ئاگری عیشق و خرۆشی ئیشتیاق** [٢٩]

ئەمە کلیلی دەرگای مەعریفەناسیی عیرفانییە و سەرلەبەری مەعریفەناسیی عیرفانی لە بارەی ناسینی چۆنیەتی ئەم پەیوەندییە و رێکارەکانیەتی بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و گەردوون و هەموو بوون.

### عەشق و مەعریفە لەلای مەحوی

مەعریفەناسی عیرفانی کە دەکرێت بە مەعریفەناسی عاشقانەیش ناوببرێت رایەڵەی خۆی لەسەر بنەمای عەشق بونیاد دەنێت. یەکێتی و گەیشتنەوە بە یەکتایی کە ئامانجی عیرفانە بە هۆی عەشقەوە دێتە دی بە یەگگرتنەوە لەگەڵ مەعشوق کە بوونی رەهایە. کاری مەعریفەناسی دۆزینەوەی حەقیقەتە و مەعریفەناسی عیرفانیش حەقیقەت لە یەکێتیدا پێناسە دەکات. مەحوی وەدیهاتنی یەکێتی لە عەشقی مەعشووقدا دەبینێتەوە و تەمی فرەیی کە وەهمێکی بێ بنەمایە لە هزردا لادەبات و لە ئاکامدا دەبێتە مایەی موقەددەس بوونی گیانی مرۆڤ و دەڵێت:

**بلاَ رۆحت موقەددەس بێ، ئەم و ئەو کردنت بەس بێ**

**هەتا ئاخر هەناسە ئەو بناسە، هەر بنازە بەو** [٣٠]

دڵی باوەڕدار خاوەن پەنجەرەیەکە رووەو مەعاریفی خودایی بەڵام هەموو کەسێك توانای بینینی هەموو ئەو مەعاریفانەی نییە. مەعاریفی خودایی کە راز و زانستی خودایی لە خۆدەگرێت جگە لە چاوێکی خودایی ئەستەمە چاوەکانی تر واتە گشت چاوێکی ئاسایی بتوانێت پەیان پێبەرێت و لێرەوەیە ئەزموون و پرۆسەی عیرفانی رۆڵی خۆی دەبینێت و عاریف دەباتە پلە و پایەیەکی بالاَتر لە خواناسی و زانینی ئەو مەعاریفانەدا، و عاریف بۆ ئەم مەبەستە لە رێگەی عەشقەوە بوونی خۆی لە بوونی مەعشووقدا دەتوێنێتەوە واتە نەبوونکردنی خۆی لە بوونی ئەودا و لەم کاتەدا ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا مەعشووقە و هەر زانست و

زانینێکیش بە دەست بێت لەلایەن خودی مەعشووقەوەیە. پەردە لەسەر هەڵماڵینی رازی یەکێتی لە ناو عەشقێکدا بەرجەستە دەبێت کە لەوێدا تەنیا عەشق بۆخۆی سەروەر بێت و هیچ نامەحرەمێکی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرتبێت (وەکو سەر کە ئاماژەیە بۆ بیری عەقڵانی) کە گومان لە یەقینەکانی عەشق بکات:

**تا نەبووری تۆ لەسەر رێ ناخەیە مەیدانی عیشق**

**سەر لە پێشی پێ دەبێ لەم رێگە دانێی (اولا)** [31]

لەم کاتەدا عەشق لە پەیوەندییەکی دوو لایەنەی نێوان دوو بوون یان دوو کەس دەردەچێت و شێوەی رێبازێکی هزری لە خۆ دەگرێت بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی ژیان کە عیرفان لەو یەکێتییەدا دەیبینێتەوە و مەحویش لەسەر وەسیەتی باوکی عەشق وەکو رێباز و ئاراستەی ژیانی هەڵدەبژێرێت نەك تەنیا وەکو جۆرێك لە پەیوەندی:

**شەوی ریحلەت پدەر _روحی مورەووەح_وەصیەتی فەرموو:**

**مەحەببەت مەذهەبت بێ، نووری چاوم، مەیکەشی مەشرەب** [32]

مەحوی پرسی کەماڵیش بە عەشقەوە گرێ دەدات و عەشق وەکو رێگەی کەماڵ دەناسێنێت. لە عیرفاندا بە پێچەوانەی بوارەکانی تر کەماڵ لە ئەنجامی بەهێزکردن و پێگەیاندنی خودێکی سەربەخۆوە بە دەست نایەت و عاریف لە رێبازی عەشقدا خود بەجێ دێڵێت و سیفەتەکانی مەعشووق کە بابەتی مەعریفەیەتی لە خۆ دەگرێت کە سەرچاوەی کەماڵە، بۆیە عەشق دەبێتە بە کەماڵ گەیەنەری عاشق و تەواوکەری کاری مەعریفەناسی عیرفانی:

**بە سۆزی عەشقە بوونە ذی کەمالات**

**اذ الانوار من ذی النار تنشا** [33]

نەك هەر عەشق بە کەماڵ گەیەنەری مرۆڤە بەڵکو مەحوی گەیشتن بە هەموو کەماڵ و گشت مەعریفەیەکی راستەقینە لە دەرەوەی عەشق بە شتێکی مەحاڵ دەزانێت، واتە کەماڵ کە ئامانجی مەعریفە و مەعاریف کە رێگەی بە کەماڵ گەیشتنن بە بێ بەشداری عەشق نایەنە دی:

**کەمالات و مەعاریف مەبیە بێ دەخڵی هەوێنی عیشق**

**عەجەب پشکووتووە لەم جەذوە نارە پڕ بە عالەم نوور** [34]

بۆیە مەحوی دەرد و داغی دڵ و دەروونی عاشق کە هێمای نقومبوونە لە دەریای عەشقدا بە نیشانەی کەماڵی عاشق دادەنێت و دەڵێت کە ئەم کەماڵەم هەبوو ئیدی جەماڵی بێ سوودی رەنگ و روخساری جوانم بۆچییە:

**دەرد و داغێکی دەروونی گەر ببێ، با رەنگ و روو**

**سیس و موغبەر بێ، کەماڵم بوو جەماڵم بۆچییە** [٣٥]

یان دەڵێت سەختی و غەم و پەژارە پلەی پێگەیشتن و کەماڵی عاشقی جگەر بەخوێنبووی یارن و جیا لەمە نیشانەی خامی و پێنەگەیشتنە:

**روتبەی کەماڵە رۆژەڕەشی بۆ جگەر بە خوون**

**ناکامە تاکە رەش نەبووە خوونی خامی میسك** [٣٦]

## دڵ و ئاگر و ئاوێنە لەلای مەحویدا

دڵ کانگای بەرهەم هاتنی مەعریفەیە لە مەعریفەناسیی عیرفانیدا و عارف بە هۆی دڵیەوە دەستی بەو مەعریفانە دەگات کە دەیەوێت. دڵ ئەو بەشەی بوونی عاشقە کە پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ مەعشووقدا هەیە و عەشق لەوێوە دەست بە ئاراستە کردنی عاشق دەکات رووەو ئاراستەی خۆی، بۆیە مەحوی دڵ بە شەوچرایەك ناو دەبات کە ئەرکی رێنیشاندەری رێبواری لە ئەستۆیە لە شەوەزەنگی ژیان و روونکردنەوەی ئەو تەم و مژەی کە بیرکردنەوەی جۆراوجۆر بۆ مرۆڤی دروست دەکات و سەری لێ دەشێوێنێت:

**گەر تێبگەی لە گەوهەری دڵدا چ مەوج ئەدا،**

**ئەم شەوچراغە لەم شەوەدا کەس دەدا بە کەس** [٣٧]

عاریفان عەشق بە ئاگرێك ناودەبەن کە لە دڵەوە بەردەبێتە عاشق و پاشان دەست بە سووتانی سەرتاپای بوونی دەکات. ئاگر لە مەعریفەناسی فەلسەفیدا هێمای رووناکییە و لەوێوە پەیوەست دەکرێت بە مەعریفەوە بەلام لەلای عاریف نیشانەی تاقیکردنەوەیە وەکو ئەو ئاگرەی کە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ساز کرا و هەروەها دەڵێن ئاگری عەشق لە عاشق بەردەبێت تاوەکو هەرچییەك کە پەیوەست بە بوونی ئەو نییە لە بوونیدا بسووتێنێت [٣٨] و پاش سووتان بە ئاگری

عەشــق ئــەوەی دەمێنێتــەوە بــێ خەوشــییە، لێــرەوە دەبەســترێتەوە بــە مەعریفەناسییەوە و بەشداری لە پێکهێنانی مرۆڤبوونی مرۆڤدا دەکات:

**عەشق ئاگرێکە بەربووە هەرکەس دەبێ بە کەس**

**گەر رۆژە ڕەش وەکو شەوە بێ، بوو بە شەوچراغ** [٣٩]

هەرکەسـێك لـەم رازەی ئـاگری عەشـق تێبگـات ئیـدی ئـەو ئـاگرە بـە چـاوی ئاگرێکی لەناوبەر نابینێت، بۆیە ئەو کەسانەی کە سووتاوی ئـاگری عەشـقن زیـاتر لە هەموو کەسێکی تر لە هەوڵدان بۆ گەیشتن بەو ئاگرە خۆش و دڵنشینە:

**ئەی مەحەببەت! ئاگرێکی هێندە خۆش و دڵ نشین**

**ئەو کەسەی سووتووتە، هەر ئەو هەوڵ ئەدا بۆ سووبەسووت** [٤٠]

ئامانجی ژیان لەلای عاریف بریتییە لەو بەکەسبوونەی کـە عەشـق بـۆ مرۆڤـی دەهێنێتە ئاراوە، واتە مانەوەی مرۆڤ لەو بارە پاکژەی کە دەبێت وەها بێـت و بـە واتایـەکی تـر مانـەوە و پابەنـدبوونی عاشـق لەسـەر ئـەو بـارەی کـە مەعـشووق دەیخوازێت. کەواتە ئـاگری عەشـق دەتوانێـت مـرۆڤ لەسـەر راسـتە رێـی ئامـانجی بوونی خۆی رێنوێنی بکات و بەردەوام لـەو بـارەدا بیپارێزێـت کـە دەبێـت بۆخـۆی وەهابێت و لێی لانەدات، بەمەش خۆبەخۆ ئاگری عەشق خۆی دەبێتە ئامانج:

**گەر ئاگری مەحەببەت شك بەم لە دۆزەخا**

**ئەو دۆزەخە بەهەشتمە، جەننەت، دەکەم حەرام** [٤١]

جا لەبەر ئەوەی هەر دڵ دەبێتە فەزاو پانتاییەك کە یاد و وێنەی مەعشووقی تیادا نیشتەجێ ببێ وەکو مەحوی دەڵێت:

**درا در دل تنگ محوی دمی**

**چون تو یوسفی باید افتی بچاه** [٤٢]

واتە وەرە نێو دڵی تەنگی مەحوییەوە، چـونکە تـۆ یوسـفیت و دەبێـت وەکـو ئەویش بکەویتە بیرەوە. بۆیە هەر ئەم پەیوەندییەی نێوان دڵ و عەشق و ئاگر لـە نێو دەقە عیرفانییەکاندا بە شێوەی ئاوێنەیش خراوەتەوە روو. لە عیرفاندا (ئاوێنە هێمای روو بە رووی یەك بوونی خاك و ئەفلاکە بـەو واتایـەی کـە هەریـەك لـەو دوو وێنەیەی بەرامبـەر واتـە حـەق و خـەلق وەکـو ئاوێنەیـەك وان بـۆ یـەکتر...لـە بـەر ئەوەی عەشق خۆی لـە ئاوێنـەی عاشـقی و مەعـشووقیدا نوانـد جـوانیی خـۆی بـۆ

خـۆی وەدیارخـست و لـە رووی تێڕوانـەری و بـۆ تێڕوانینـەوە نـاوی عاشـقی و مەعشووقی پەیدا بوو)[٤٣]، بۆیە دڵی عاریف ئـەو ئاوێنەیەیـە کـە وێنـەی مەعـشووق (حەق)ی تیادا دەردەکەوێت و حەق خۆی تیادا دەبینێتەوە و (ئەو بەکەسـبوونەی عەشقیش دەیخولقێنێت هەمان بە ئاوێنە بوونە بۆ حەق) مەحوی دەڵێت:

**چون جام زبزمت نکشیدیم می وصل**

**چون آیینەام دل بتماشا شده قانع**[٤٤]

واتـە لـە بـەر ئـەوەی پێکـی بـەزمی وەسـڵی تۆمـان نـۆش نـەکرد یـاخود بـەر نەکەوت، وەکو ئاوێنەم لێ هاتووە و دڵم تەنیا بـە تەماشـاکردنت قـانیع بـووە. بـە ئاوێنـەبوون واتـە خـۆ بـە فـەزاکردن بـۆ دەرکـەوتنی ئـەوی تـر و دڵ کـە سـیفەتی ئاوێنەی وەرگرت ئیدی خۆی بێ رەنگ دەبێت وەکو خودی ئاوێنە و ئەوەی کە بـە دیار دەکەوێت و لەم کاتەدا دەبینرێت تەنیا وێنەی مەعـشووقە، بۆیـە عـاریف لـەم رێگەیەوە بە جۆرێك خۆی و وێنە و سیفەتی خۆی نەبوو دەکات و وێنە و سـیفەتی مەعشووق دەخاتە روو کە لە راستیدا وێنە و سیفەتی ئەسڵی خۆیـەتی واتـە خـۆی تیادا دەبینێتەوە، هەڵبەتـە ئەمـە پەیوەندییـەکی دوو لایەنەیـە جارێك عاشـق لـە ئاوێنەی دڵی دەڕوانێت و لە بـری خـۆی وێنـەی مەعـشووق دەبینێـت و مەعـشووق ناسین یەکسان دەبێـت بـە خۆناسـین یـان بـە پێـچەوانەوە و لەلایـەکی تریـشەوە مەعشووقیش دەیەوێت لە شـوێنێکدا جـوانی رووی خـۆی ببینێـت و ئاوێنـەی دڵـی عاشق ئەم کارەی بۆ دەسازێنێت:

**بە ئیخلاصی ئەوم ئاوێنەکەی دڵ وا جەلا داوە**

**کە چیهرەی شاهیدی مەقصودمی تێدا نموودارە**[٤٥]

لە هەمان کاتیشدا ئەو ئاوێنەیە دەتوانێت وێنەی یار وەکو خۆی بخاتـەوە روو تاوەکو یار جوانی رووی خۆی تیادا بەدی بکات:

**دەبێ چاو و دڵێکی پاك و بێ غەش میثلی ئاوێنە**

**ببێ، ئەو صورەت و مەعنایە بنوێنێ (کما کان)**[٤٦]

بەم پێیە هەموو دڵێـك شـیاوی ئـەوە نییـە کـە ببێتـە ئاوێنـەی مەعـشووق گەرچـی هـەموو دڵێـك لـە بنەڕەتـدا ئاوێنەئاسـایە بـەڵام هـەر ئاوێنەیـەك ژەنـگ و تەمگرتی ئیدی واتایەك بۆ ئاوێنەبوونی خۆی ناهێڵێتـەوە. ئـەو دڵـەی کـە بیـەوێت

بەو پلە و پایەیە بگات پێویستە هەردەم ئاگاداری چۆنیەتی ڕاگرتنی ئاوێنەکەی بێت. لێرەدا هەرسێ چەمکی دڵ و ئاگر و ئاوێنە بە یەکەوە پەیوەست دەبن. لە گرنگترین کێشەکانی ئاوێنە بریتییە لە ژەنگ گرتن و لێڵ و تەڵخ بوون و بە تووشهاتنی هەریەك لەمانە ئاوێنە تواناداری خۆی لە گواستنەوەی شتەکان وەکو خۆیان لە دەست دەدات، ئاوێنەی دڵیش بە هەمان شێوەیە و لە کاتی تووشهاتنی بە ژەنگی رق و کینە و ناپاکی و...هتد ئیتر دەرکەوتنی مەعشووق (حەق)ی تیادا مەحاڵ دەبێت و بۆیە مەحوی پەڵەی سەر ئاوێنە بە حەرام دادەنێت بۆ ڕێبوارانی ئەم ڕێگەیە:

**برسینه عاشق اثر کینه حرام است**

**در کیش صفا لکهء آیینه حرام است**[٤٧]

واتە شوێنەواری رق و کینە لە دڵی عاشقدا حەرامە، و لە مەزهەبی سەفا و پاکیدا پەڵەی سەر رووی ئاوێنە حەرامە. هەموو شتێك جگە لە وێنەی مەعشووق لە دڵ، بە پەڵە و خەوش و گەرد دادەنرێت لە عیرفاندا بۆیە مەحوی لە پێناو پاك ڕاگرتنی دڵ و پاراستنی باری یەکێتی داوا دەکات ((غەیر)) واتە هەموو شتێك جگە مەعشووق لە دڵدا جێ نەکرێتەوە و دەرگای ماڵی ئاوێنەی دڵ تەنیا بە رووی یاردا بکرێتەوە:

**غەیر را در دل مده ره خانەء آیینه را**

**وامکن الا بروی جلوه دلدار در**[٤٨]

واتە غەیر ((بێگانە)) لە دڵدا جێ مەکەرەوە و دەرگای ماڵی ئاوێنە تەنیا بەڕووی جیلوە و دەرکەوتنی دڵداردا بکەرەوە. لەم کاتەدا وەك چۆن ئاوێنە پاك دەکرێتەوە و جەلا دەدرێت دڵیش بە ئاگری عەشق خاوێن دەکرێتەوە و لە هەموو شت و گەردێك جگە لە مەعشووق دادەماڵرێت:

**بە تابی عەکسی ئەو دیدارە دڵ سووتا، موزەککایە**

**کەتانت ڕاگرە سازوو بە جیلوەی ماهتابێ زوو**[٤٩]

عەشق سیفەتی ئاگر و سووتێنەریی دراوەتە پاڵ و ئاگریش خاسیەتی دژی میکرۆبی و سووتاندنی خەوشەکانی هەیە و لە کاتی ژەنگ گرتنی ئاوێنەدا بۆ درەوشاندنەوەی بە کار هێنراوە و مەحوی دەڵێت کە عەشق دڵ لە هەموو ڕەنگ و

رووەکـان پاکـژ و سـاف بکاتــەوە دەبـا بـەو ئـاگرە ئاوێنـەی دڵ لـە ژەنـگ پـاك بکەینەوە و بدرەوشێنینەوە:

**بعشق از نقشها دل صاف گردد**

**بآتش ده جلا آیینه از زنگ** [50]

واتە بە عەشق دڵ پاك و بێگەرد دەبێتەوە بۆیە بەو ئاگرە، واتە ئاگری عەشق ئاوێنـەی دڵ لـە ژەنـگ پـاك بکـەرەوە. کـۆی پەیامەکـەی مـەحوی لـەم بارەیـەوە دەکرێت لەم دێڕە شیعرەدا کۆ بکەینـەوە کـە لـە بـارەی خۆیـەوە وتوویـەتی و لـە راسـتیدا جێبـەجێکردنی ئـەو تیۆرەیـە کـە لەسـەرەوە سـەبارەت بـە دڵ و ئـاگر و ئاوێنە باسی لێوە کرا:

**بعشق از ماسوا خالی نمودم سینهء خودرا**

**بآتش من جلا دادم رخ آیینهء خودرا** [51]

واتە بە عەشق دڵی خۆم لە هەموو بـوونێکی بێگانـە بـەتاڵ کردووەتـەوە و بـە ئـاگر رووی ئاوێنەکـەی خـۆمم درەوشـاندووەتەوە. دەبیـنین دووبـارە عەشـق لـە رێگەی پەیوەندی ئاگر و ئاوێنەوە عاشق دەباتەوە سەر خاڵی یەکێتی کە ئامانجی کۆتایی عیرفانە و بنەڕەتی مەعریفەناسیی عیرفانییە.

## ئه نجام

مەعریفەناسی عیرفانی لەسەر بنەمای بەرەو یەکێتی چوون دامەزراوە  کە بە هـۆی عەشقەوە بەدی دێت، عەشقی مەحویش هەڵگری هەمان واتا و نـاوەرۆکی عەشـقی عیرفانییە.

مەحوی عاریفانە لە یار دەڕوانێت و یار لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا هێمای حەقیقەتە و عاریف لە هەوڵی گەیشتنە بەو حەقیقەتە چونکە بە جێگیربـوونی لـە دڵـی عاریفـدا حەقیقەت بە بوونی ئەویش دەبەخشێت.

دڵ و ئاگر و ئاوێنە سـێ چـەمکن کـە لـە شـیعر و ئـەدەبیاتی عیرفانیـدا بـە پـشت بەستن بە دەق و تێڕوانینی ئـاینی لێکدانـەوەیان بـۆ کـراوە و هـەمان بۆچـوون لـە شیعرەکانی مەحویدا بەرچاو دەکەوێت، واتە مەحوی ئەو سێ چەمکە لە واتایـەکی بەرزتردا بە کار دەهێنێـت و مەبەسـتگەلێکی عیرفـانیی وەکـو پاکبوونـەوەی دڵ و نـاخ و دەربـازبوون لـە تـەمی فرەیـی و هەڵبـژاردنی ڕێگـەی یـەکتاییان پێـوە دەبەستێت.

## سەرچاوەکان

**سەرچاوە کوردییەکان:**

– دیوانی مەحوی ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم ، ئینتیشاراتی کوردستان ، چاپی یەکەم (لە رووی چاپەکەی کۆڕی زانیاری کوردی _ بەغدا ١٩٧٧)، سنە ، ١٣٨١.

– سۆفیگەری _ شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا ، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠٠١.

– فەرهەنگی سۆفییانەی دیوانی جزیری و مەحوی ، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان ، بلاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠١٠.

**سەرچاوە عەرەبییەکان:**

- المعجم الصوفي _الحكمة في حدود الكلمة، د. سعاد الحكيم ، دندرة للطباعة والنشر، الطبعة الاولى ، بيروت ، ١٩٨١.
- المعرفة وحدودها عند محي الدين بن عربي ، هيفرو محمد علي ديركي، التكوين للطباعة والنشر والتوزيع ، دمشق ، ٢٠٠٦.

**سەرچاوە فارسییەکان:**

– ارزش میراث صوفیه ، دکتر عبدالحسین زرین کوب ، انتشارات امیر کبیر ، چاپ دوازدهم ، تهران ، ١٣٨٥.

– تاریخ فلسفه در جهان اسلامی ، حنا الفاخوری و خلیل الجر ، ترجمه عبدالمحمد ایتی ، جلد اول ، کتاب نان ، چاپ دوم ، تهران ، ١٣٥٨.

– تصوف ایرانی در منظر تاریخی ان ، دکتر عبدالحسین زرین کوب ، ترجمه دکتر مجدالدین کیوانی ، انتشارات سخن ، چاپ اول ، تهران ، ١٣٨٣.
– چهار گزارش از تذکرة الاولیاء عطار ، بابك احمدی ، نشر مرکز ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٨٦.
– در امدی بر نظریه‌های معرفت شناسی در اندیشه اسلامی ، مرتضی خاکیان ، انتشارات سروش هدایت ، چاپ اول ، قم ، ١٣٧٨.
– در امدی بر معرفت شناسی و مبانی معرفت دینی ، محمد حسین زاده ، انتشارات مؤسسه اموزشی و پژوهشی امام خمینی ، چاپ اول ، قم ، ١٣٨٨.
– فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ، دکتر سید جعفر سجادی ، انتشارات طهوری ، چاپ هشتم ، تهران ، ١٣٨٦.
– فلسفه عرفان –تحلیلی از اصول و مبانی و مسائل عرفان ، دکتر سید یحیی یثربی ، مؤسسه بوستان کتاب ، چاپ ششم ، قم ، ١٣٨٧.
– عرفان نظری تحقیقی در سیر تکاملی و اصول ومسائل تصوف ، دکتر سید یحیی یثربی ، مؤسسه بوستان کتاب ، چاپ ششم ، تهران،١٣٨٧.
– عرفان و معرفت قدسی ، استاد یحیی کبیر ، مطبوعات دینی ، چاپ اول ، قم ، ١٣٨٦.
– کارنامه تصوف ، دکتر نصرالله فروهر ، نشر افکار ، چاپ اول ، تهران ، ١٣٨٧.
– مبانی عرفان و تصوف ، دکتر قاسم انصاری ، انتشارات طهوری ، چاپ ششم ، تهران ، ١٣٨٦.
– مدخلی بر رمزشناسی عرفانی ، جلال ستاری ، نشر مرکز ، چاپ سوم ، تهران، ١٣٨٦.

— معرفت شناسی در عرفان ، سید حسین ابراهیمیان ، مؤسسه بوستان کتاب ، چاپ دوم ، قم ، ۱۳۸۷.
— محی الدین ابن عربی و نقش خیال قدسی در شهود حق ، مریم صانع پور ، نشر علم ، چاپ اول ، تهران ، ۱۳۸۵.
—نگرشی بر تاریخ فلسفه اسلامی ، ادوارد کریك ، ترجمه محمود زارعی بلشتی ، انتشارات امیر کبیر ، تهران، ۱۳۸۵.

**گۆڤارەکان:**

— ارتباط خودشناسی با خوداشناسی در عرفان ابن عربی ، سعید رحیمیان ، فصلنامه علمی پژوهشی انجمن معارف اسلامی ایران ، سال اول ، شماره سوم ، تابستان ۱۳۸٤.

## پەراوێزەکانی

١– نگرشی بر تاریخ فلسفه اسلامی ، ادوارد کریك ، ترجمه محمود زارعی بلشتی ، انتشارات امیر کبیر ، تهران ، ١٣٨٥، ص ٩٦.
٢– در امدی بر نظریەهای معرفت شناسی در اندیشه اسلامی ، مرتضی خاکیان ، انتشارات سروش هدایت ، چاپ اول ، قم ، ١٣٨٧، ص٦٩.
٣– تاریخ فلسفه در جهان اسلامی ، حنا الفاخوری و خلیل الجر ، ترجمه عبدالمحمد ایتی ، جلد اول ، کتاب نان ، چاپ دوم ، تهران ، ١٣٥٨، ص ٢٩٦.
٤– در امدی بر معرفت شناسی و مبانی معرفت دینی ، محمد حسین زاده ، انتشارات موسسه اموزشی و پژوهشی امام خمینی ، چاپ اول ، قم ، ١٣٨٨، ص ٣٩.
٥– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٤.
٦– معرفت شناسی در عرفان ، سید حسین ابراهیمیان ، موسسه بوستان کتاب ، چاپ دوم ، قم ، ١٣٨٧، ص ٢٠.
٧– در امدی بر نظریەهای معرفت شناسی در اندیشه اسلامی ، مرتضی خاکیان ، ص ٨٠.
٨– فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی جزیری و مەحوی ، د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان ، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠١٠، ل ١٠٧.
٩– کارنامه تصوف ، دکتر نصرالله فروهر ، نشر افکار ، چاپ اول ، تهران ، ١٣٨٧، ص ٢٤٥.
١٠– عرفان نظری تحقیقی در سیر تکاملی و اصول ومسائل تصوف ، دکتر سید یحیی یثربی ، موسسه بوستان کتاب ، چاپ ششم ، تهران،١٣٨٧، ص٤٨١.
١١– ارزش میراث صوفیه ، دکتر عبدالحسین زرین کوب ، انتشارات امیر کبیر ، چاپ دوازدهم ، تهران، ١٣٨٥، ص ١٠.
١٢– عرفان و معرفت قدسی ، استاد یحیی کبیر ، مطبوعات دینی ، چاپ اول ، قم ، ١٣٨٦، ص ٥٨.
١٣– تاریخ فلسفه در جهان اسلامی ، حنا الفاخوری و خلیل الجر ، ترجمه عبدالمحمد ایتی ، جلد اول ، ص ٢٩٦.
١٤– ارتباط خودشناسی با خوداشناسی در عرفان ابن عربی ، سعید رحیمیان ، فصلنامه علمی پژوهشی انجمن معارف اسلامی ایران ، سال اول ، شماره سوم ، تابستان ١٣٨٤، ص ١٥.
١٥– در امدی بر نظریەهای معرفت شناسی در اندیشه اسلامی ، مرتضی خاکیان ، ص ٨٦. والمعرفة وحدودها عند محی الدین بن عربی ، هیفرو محمد علی دیرکی ، ص ١٢٣.
١٦– محی الدین ابن عربی و نقش خیال قدسی در شهود حق ، مریم صانع پور ، نشر علم ، چاپ اول ، تهران ، ١٣٨٥، ص ٢.

١٧– چهار گزارش از تذکرة الاولیاء عطار ، بابك احمدی ، نشر مرکز ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٨٦، ص ١٨١.
١٨– معرفت شناسی در عرفان ، سید حسین ابراهیمیان ، ص ٢٠.
١٩– تصوف ایرانی در منظر تاریخی ان ، دکتر عبدالحسین زرین کوب ، ترجمه دکتر مجدالدین کیوانی، انتشارات سخن ، چاپ اول ، تهران ، ١٣٨٣، ص ٨٣.
٢٠– مبانی عرفان و تصوف ، دکتر قاسم انصاری ، ص ١٩.
٢١– فلسفه عرفان–تحلیلی از اصول و مبانی و مسائل عرفان ، دکتر سید یحیی یثربی ، موسسه بوستان کتاب ، چاپ ششم ، قم ، ١٣٨٧، ص ٣٣.
٢٢– المعجم الصوفي_الحكمة في حدود الكلمة، د.سعاد الحكيم ، دندرة للطباعة والنشر ، الطبعة الاولى ، بيروت ، ١٩٨١، ص ٩١٨.
٢٣– دیوانی مەحوی ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالكريمی مدرس و محمدی مەلا کریم ، ئینتیشاراتی کوردستان ، چاپی یەکەم (لە رووی چاپەکەی کۆڕی زانیاری کوردی_بەغدا ١٩٧٧)، سنە ، ١٣٨١. ، ل ٤٣٨.
٢٤– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣١٠.
٢٥– سۆفیگەری _ شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا ، د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠٠١، ل ٣٩٥.
٢٦– دیوانی مەحوی ، ل ٣٠٣.
٢٧– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٨.
٢٨– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧.
٢٩– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٧٨.
٣٠– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٦١.
٣١– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٩.
٣٢– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١.
٣٣– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤١.
٣٤– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٨.
٣٥– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٩٢.
٣٦– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨٨.
٣٧– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤٨.

٣٨- فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ، دكتر سید جعفر سجادی، انتشارات طهوری ، چاپ هشتم، تهران ، ١٣٨٦ ، ص ٤.
٣٩- دیوانی مەحوی ، ل ١٧١.
٤٠- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٩.
٤١- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢١٣.
٤٢- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٢٥؟
٤٣- مدخلی بر رمزشناسی عرفانی ، جلال ستاری ، نشر مرکز ، چاپ سوم ، تهران ، ١٣٨٦، ص ١٣٨.
٤٤- دیوانی مەحوی ، ل ٥٠٩.
٤٥- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٦٧.
٤٦- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٣٩.
٤٧- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨٣.
٤٨- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٠٢.
٤٩- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٥٦.
٥٠- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١٤.
٥١- سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧٤.

## خلاصة

## مثلث القلب والنار والمرآة في شعر محوي

ان محوي هو احد الشعراء الكرد والذى يعكس الاعتقاد العرفاني من خلال شعره. اغلب الباحثين في شعره يتفقون على تصنيفه كأحد الشعراء العرفانية. في هذا البحث نتناول اولا علم المعرفة العرفانية وثانيا تحليل شعر محوي من منظور عدة مفردات مثل ((القلب)) و((النار)) و((المرآة)) ودراستهم بشكل معرفي في سبيل اظهار العلاقة التى تربط بينهم من جهة وعلاقتهم مع اساسيات المعرفة العرفانية.

((القلب)) فى الادب العرفاني يعني بيت الله وقناة الاتصال بين البشر وخالقهم. في الجانب الثانى وبكلمات اخرى، هو المرآة التي توضح الحق نفسه فيه ومن ناحية اخرى فهو يعطى صفات الخالق الى البشر لتحقيق الذات. يمكن تحقيق هذا فقط عندما يكون الخالق في قلب الانسان. ان الحب الذى يقرر نوع العلاقة بين الخالق والانسان يأخذ على عاتقه هذه المسؤلية واستعمال ناره يصفي مرآة القلب وبالنهاية يصل الى معرفة الحق.

## Abstract

**The Triangle of the Heart, Fire , and Mirror in Mahwi's Poems**

Mahwi is one of the Kurdish poets whose poems reflect sophitic beliefs. Most of researchers of his poems agree that he should be classified as one of the Kurdish sophistic poets. In the research, first, we introduce the epistemology of sophism and, second, analyse Mahwi's poems from the view of severa words such as "heart", "fire", and "mirror". These words are analysed epistemologically in order to find their relations with each other and with the basics of sophism. In Kurdish literature "heart" is considered as the house of God and the communication chnnal between humankind and the God. In other words, on one hand, it is seen as a miorror in which, "right" can manifest itself and, on the other hand, it can give God's characreristics to humankind and make him/her like Himself. This can be acieved when there is only God in humankind's heart. Love, which determines the type of relation between God and humankind, takes this respopnsibility and using its fire puryfies the mirror of heart, and eventually humankind reaches a bieng similar to God's being.

# هونەری ژیاننامەی خودی لە ئەدەبی کوردیدا (پاکیزە رەفیق حلمی) وەك نموونە

پ. ی. د. نوزاد وقاص سعید م. نعمه قرنی اسماعیل

## پێشەکی

ژیاننامەی خودی هونەرێکە لە هونەرەکانی پەخشانی ئەدەبی و جۆرێکە لە ژیاننامە، نووسەر ژیان و ئەزموونە تایبەت و گرنگەکانی خۆی بە شێوازێکی هونەری بەیەکەوە بەستراو و لە سەر بنیاتێکی بەهێز وێنە دەکێشێ و بە شێوەیەکی تایبەت تیشك دەخاتە سەر ژیانی تاکەکەس و مێژووی کەسایەتی خۆی، بە شێوەیەکی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بە جۆرێك دەقەکە ئاماژە بەوە بکات کە ژیاننامەی خودییە. ئەم هونەرە وەکو جۆرەکانی دیکەی ئەدەب، خاڵێك لە لاپەڕەکانی مێژووی هەر میللەتێك داگیر دەکات و لەگەڵ بوونی مرۆڤدا هەبووە.

لەبەر گرنگی بابەتەکە و لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی زانستی و تێر و تەسەل تیشکی نەخراوەتە سەر و لێی نەکۆڵراوەتەوە. و سەرەڕای ئەمەش پاکیزە رەفیق حلمی، کەسایەتییەکی دیاری رۆشنبیری کوردییە و رۆڵی بەرچاوی لەم بوارەدا هەبووە، ئەوا ئەم فاکتەرانە هاندەر بوون بۆ ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بە شێوەیەکی گشتی لەسەر رێبازی وەسفییە و بۆ پێویستی نەبێ بابەتەکە ئەم سنوورەی نەبەزاندووە، نەبوونی سەرچاوەی سەرەکی بەزمانی کوردی و هەژاری زاراوەسازی کوردی گرفتی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوو، لە پێشەکی و دوو تەوەر و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و کورتەی لێکۆڵینەوە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی پێکهاتووە.

لە تەوەری یەکەمدا : باسی زاراوە و چەمك و پێناسە و جۆرەکانی ژیاننامە و ژیاننامەی خودی و مێژووی سەرهەڵدانی لە ئەدەبی کوردیدا کراوە. لە تەوەری دووەمیشدا : باسی رەگەزە هونەرییەکانی ژیاننامەی خودی لە بنیاتی دەقی (کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە) ی پاکیزە رەفیق حلمی کراوە.

**یەکەم :**

**زاراوەو چەمك و پێناسەو جۆرەکانی ژیاننامەو مێژووی سەرهەڵدانی لە ئەدەبی کوردیدا :**

**ژیاننامە وەك زاراوە :**

ژیاننامە ژانرێکی ئەدەبی سەربەخۆیە، تیایدا نووسەر هەڵدەستێ بە نووسینەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی ژیانی خۆی و کەسەکانی تر. لە رووی زاراوەوە وشەیەکی لێکدراوە لە (ژیان + نامە) پێکهاتووە، واتە نامەی ژیانی تاکێك. لە زمانی عەرەبیدا وشەی (السیرة) یە. لە فەرهەنگی (المنجد في اللغة و الاعلام) بە واتای (شێوە– رێرەو– رێگە – رێبان)[١] هاتووە، و لە فەرهەنگی کوردیدا بە واتای (ژیاننامە– ناوبانگ– چیرۆك – راز – داستان – بەسەرهات – سەرگوزشتە – سەربووردنامە – مێژوو – باس و خواسی ژیانی یەکێك یان کۆمەڵ و گرۆهێك – مەزهەب و رێگە)یە[٢]. لە زمانی ئینگلیزیشدا وشەی ( Biography) یە. (کە لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە و پێکهاتووە لە ( Bios)، بە واتای (ژیان)، ( graph in) بە واتای (نووسین) دێ)[٣]. وشەی (Biography) بۆ یەکەم جار لە زمانی ئینگلیزیدا، لەلایەن درایدن لە ساڵی (١٦٨٣) دا بۆ (الحیات المتقابلة) (ژیانی ناوداران) ی بلو تارك بەکار هاتووە[٤].

**پێناسەی ژیاننامە :**

هونەری ژیاننامە (مێژووی ژیانی کەسێکە لە کاتی لەدایکبوونییەوە تا کاتی نووسینەوەی ژیاننامەکەی)[٥] واتە ئەو کەسەی ژیاننامەکەی دەنووسرێتەوە، جا چ خۆی بینووسێتەوە یان لەلایەن کەسێکی دیکەوە نووسینەوەی ئەنجام بدرێ، پێویستە لە ژیاندا مابێ.

لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرددا، بەم شێوەیە پێناسەی ژیاننامە کراوە (مێژووی ژیانی مرۆڤەکانەو جۆرێکە لە ئەدەب)[٦] لێرەدا جەخت لەسەر مێژوو و ژیانی تایبەتی و ئەدەب دەکاتەوە. مەبەستی لەوەیە کە هەر چەندە ژیاننامە پەیوەندی بە مێژووەوە هەیە، کە مێژووی ژیانی کەسەکان دەنووسێتەوە، بەڵام نووسینەوەی ئەو مێژووەش بە شێوەیەکی ئەدەبی پێشکەش دەکات.

به شێوەیەکی گشتی، ژیاننامە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئـەدەب (لێکۆڵینـەوەی مێژوویی و چێژ وەرگرتنی چیرۆکی بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، بۆ دیراسەکردنی ژیانی کەسێك و وێنە کێشانێکی وردی ئـەو کەسـایەتییە)[٧]. واتـا مێـژووی ژیـانی تـاك و چۆنێتی هەڵسوکەوتی لە نێوان خەڵکدا، هەروەها گێڕانەوەی رووداو و بەسـەرهاتی ژیانی تاکێکە، یاخود دووبارە ژیانەوەی مرۆڤە لەسەر رووی لاپەڕەکاندا.

**چەمکی ژیاننامە :**

وشەی ژیاننامە لەرووی چەمکەوە، بەواتای مێژووی ژیان دێ، کە بریتییـە لـە (مێـژووی تۆمـارکراوی ژیـانی کەسـێك، هونـەری نووسـینەوەی ژیـانی یـەکێك، رەگەزێکی ئەدەبییە، بۆ سەربردەی ژیانی کەسانێك، تەرخان کراوە. [٨]

**جۆرەکانی ژیاننامە :**

لێکۆڵەران و رەخنەکاران بە چەند جۆرێك ژیاننامەیان دابەش کردووە، بۆ نموونە (انیس المقدسی) دابەشی کردۆتە سەر دوو جۆر :

١– ژیاننامەی گشتی : ئەو جۆرەی ژیاننامە کەسانێکی زۆر لـە خـۆ دەگـرێ، واتـە نووسـەر هەڵدەسـتێ بـە نووسـینەوەی ژیـانی کۆمەڵـە کەسـێك کـە خـۆی دەستنیشانی کردوون، بە پێی ئەو پێوەرەی کە خۆی دایناوە. ژیاننامـەی گشتی هونەری ناساندن (فن التراجم) دەگرێتەوە و بریتییە لە کورتـەیێکی ژیـانی تاکێـك، واتە وەکو ناسنامەیێکە، یان پێناسەیێکە بـۆ نـاودارانی (مێـژوویی، یـان ئـەدەبی، یان زانستی ... هتد) .

٢– ژیاننامـەی تایبـەتی : تـەنیا بـە دەوری یـەك کەسدا دەخولێتـەوە، واتـە هەموو بابەتی ژیاننامەکە تایبەتە بە کەسێکی دیاریکراو و دیارکردنی رووداوەکانی سەردەمی ژیانی ئەو کەسە لە ماوەیێکی دیاریکراودا لـە خـۆ دەگـرێ . ژیاننامـەی تایبەتیش دوو لقی لێ دەبێتەوە :

أ– ژیاننامەی خودی : کە نووسەر هەڵدەستێ بە گێڕانەوەی تەواوی بەسەرهات و رووداوەکانی ژیانی خۆی .

ژیاننامەی بابەتی : لەم جۆرەدا نووسەر گێڕانەوەییێکی تێروتەسەل لە بارەی ژیانی کەسێکی تر ئەنجام دەدا [9]٠لـــە

لایەکی ترەوە، هەندێ لە لێکۆڵەران و رەخنەگران پەنا بۆ دابەشکردنێکی تر دەبەن، کە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا تەنیا دوو جۆری هونەری ژیاننامە دەستنیشان دەکەن [10]

١– ژیاننامەی خودی ٠

٢–ژیاننامەی بابەتی ٠

لەگەڵ ئەو جۆرانەی هونەری ژیاننامەدا، جۆرێکی تری ژیاننامە هەیە کە لە ئەدەبی عەرەبیدا سەری هەڵداوە، ئەویش ژیاننامەی میللییە (السيرة الشعبية)، کە زیاتر باسی قارەمان و پاڵەوانە گەورەکانی کۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی دەکا و (گیانی سەرکێشی و پەیوەندی خێڵەکی و خۆشەویستییەکی سەخت، ئەو وێنە قووڵەیە کە لە بارەی ئەو پاڵەوانانە لە هزرماندا چەسپاوە، وەکو (سيرة الهمة، عنتر بن شداد) [11] ٠

بەشێوەییێکی گشتی هەموو جۆرەکانی ژیاننامە لە بنیاتدا باسی ژیانی راستەقینەی تاك دەکەن، بەلام لە شێوەی دەربڕین و پێشەشکردنی کەسایەتییەکان و ئەو ئەرکەی مەبەستیانە و ئەو پلانەی دەیگرنەبەر جیاوازییان هەیە ٠

**ژیاننامەی خودی وەك چەمك و زاراوە :**

زاراوەی (Autobiography) لە زمانی ئینگلیزیدا، بەرامبەر ژیاننامەی خودی لە کوردیدا دەوەستێ، (لە بنەڕەتدا وشەییێکی یۆنانییە و لە (Auto – خود، Bios – ژیان و Graphein – نووسین پێکهاتووە، کە بە واتای (نووسینی ژیانی خودی دێ).[12]

**پێناسەی ژیاننامەی خودی :**

سەبارەت بە پێناسەکردنی ژیاننامەی خودی، وەکو زۆربەی ژانرەکانی دیکە ناکرێ بە ئاسانی بخرێتە چوارچێوەییێکی تۆکمە و نەگۆڕاوەوە، لەبەر ئەوەی (ئەم هونەرە تا رادەییێك لە رووی پەیدابوون و سەرهەڵدانیەوە هێشتا نوێیە، بەڵکو

به نوێترین جۆری ئەدەبی دادەندرێ، بۆیە ناتوانرێ پێناسەیێکی دیاریکراوی بۆ بکرێ) [١٣] . هەر چەندە ئەم هۆیە نابێتە هۆکاری سەرەکی نەبوونی پێناسەیێکی تەواو بۆ ژیاننامەی خودی، لەبەر ئەوەی ئەم هونەرە هەر لە زووەوە هەبووە و سەرەتای سەرهەڵدانی بۆ مێژوویێکی دوور دەگەڕێتەوە . بەڵام نەبوونی پێناسە، لەوانەیە بۆ هۆکاری نزیکی ژیاننامەی خودی و جۆرەکانی تری ئەدەب بگەڕێتەوە، واتە لەبەر (نەرمی ئەم جۆرەی ئەدەب (ژیاننامەی خودی) و لاوازی سنووری لێك جیاکەرەوەی نێوان ئەو جۆرە و جۆرەکانی تری ئەدەب بێ، کە دەتوانێ بە ئازادانە تیایدا بخولێتەوە)[١٤] . لێرەدا مەبەست ئەوەیە، لەبەر نزیکی واتای وشەکانی وەك (بیرەوەری و رۆژانە و دانپیانان)، کە هەموویان باس لە کەسایەتی مرۆڤ دەکەن . بۆیە گەیشتن بە شێوەیێکی گشتگیری دیاریکراو بۆ پێناسەکردنی ژیاننامەی خودی، کارێکی ئەستەمە.

هەندێ لەو پێناسانە جەختیان لەسەر خودی کەسەکە و مێژووی ژیانی کەسایەتییەکە کردۆتەوە، بۆنموونە ژیاننامەی خودی بریتییە لە (نووسینەوەی ژیانی کەسی لەلایەن خودی کەسەکەوە)[١٥]. یان (ژیاننامەی خودی بە واتایەکی حەرفی، وەرگێڕانی ژیانی مرۆڤە، هەروەکو خۆی دەیبینێ)[١٦].

لە هەندێ پێناسەی تردا نووسەر جەخت لەسەر مێژووی رابردووی کەسایەتییەکە دەکاتەوە و بەشێوەیێکی رێکوپێك و زنجیرەی ساڵانی ژیانی بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانەوە تۆمار دەکات، واتە (ژیاننامەی خودی بریتییە لەوەی کە مرۆڤ بە خۆی مێژووی ژیانی خۆی دەنووسێتەوە و گشت رووداو و هەواڵەکانی تۆمار دەکا، هەروەها کار و کاریگەرییەکانیشی دەگێڕێتەوە و باسی رۆژانی منداڵی و گەنجی و پیری خۆی دەکا لەگەڵ ئەو رووداوانەی کە روویانداوە بە گوێرەی بایەخ و گرنگی) [١٧] ،

هەندێ نووسەری تر بەم شێوەیە بیر و بۆچوونی خۆیان لەبارەی پێناسەکردنی ژیاننامەی خودی دەربڕیوە (ژیاننامەی خودی پەرتووکێکە کە سەربوردەی دانەرەکەی بە پێنووسی خۆی دەگێڕێتەوە و لە کەرەستە و بابەت و پرۆگرامدا جیاوازی لەگەڵ بیرەوەری و رۆژانەدا هەیە) [١٨].

هەروەها فابێر دەڵێ (ژیاننامەی خودی شوێنێکی فراوانی بۆ (وەهم)کـردن بەجێ دەهێڵێ و ئەوەی دەینووسێتەوە پابەندە بەوەوە کە رووداوەکـان بـە وردی بگێڕێتــەوە، وەکـو بـیرەوەری، یـاخود راسـتییە رەهاکـان بـدرکێنێ، هــەروەکو دانپیانانەکان)[١٩].

بەڵام فلیب لوجون یەکێکە لەو لێکۆڵەرانەی کە زۆر بەدوای وردی و راسـتی لە پێناسـەی ژیاننامـەی خودیـدا گـەڕاوەو دەڵێـت : (ژیاننامـەی خـودی گـۆتنێکی (گێڕانەوەی) پەخشان ئـامێزە، کـە کەسـێکی واقیعـی پێـی هەڵدەسـتێ، لـەبارەی بوونی تایبەتی خۆیەوە، لەو کاتەی کە جەخت لەسەر ژیانی تاکەکەسی و مێـژووی کەسـایەتییەکە دەکاتــەوە، بـە شـێوەیێکی تایبــەت)[٢٠]. بـە شـێوەیێکی گـشتی دەتوانین بڵێین : ژیاننامەی خودی هونەرێکە لە هونەرەکانی پەخـشانی ئـەدەبی، و جۆرێکە لە ژیاننامە، نووسەر ژیـان و ئەزموونـە تایبـەت و گرنگـەکانی خـۆی بـە شێوازێکی هونەری بەیەکەوە بەستراو و لەسەر بنیاتێکی بـەهێز، وێنـە دەکێـشێ و بە شێوەیێکی تایبەتی تیشك دەخاتە سەر ژیانی تاکەکەس و مێـژووی کەسـایەتی خۆی، بەشێوەیێکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بـەجۆرێك دەقەکـە ئامـاژە بـەوە بکا کە ژیاننامەی خودییە.

**ژیاننامەی خودی لە ئەدەبی کوردیدا :**

سەرەتای پەیـدابوونی هـەر جـۆرێکی ئـەدەبی لای هـەر میللـەتێك، بـە دوو رێگا سەرهەڵدەدا . یان بەهۆی ئەدەبیاتی بیانی، یان لەناو بەرهەمـە سـەرەتاییە کۆنەکان سەرە داوی دەدۆزرێتەوە. ئەو بارودۆخەی لە کۆتایی سـەدەی نـۆزدەم و تا سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم خەڵك تیایدا دەژیا، بـووە هـۆی ئـەوەی گۆڕانکارییێکی بەرچاو لە رووی سیاسی و ئەدەبی و رۆشنبیرییەوە لە نـاو میللـەتی کورد روویدات. گەشتکردن و تێکەڵبوونی لەگەڵ خەڵکانی تردا، بووە هۆی گـۆڕانی بیری تاك و زانینی زمانی نەتەوەکانی تر و ئاشـنابوونی تـاکی کـورد بـە ئـەدەب و رۆشنبیری گەلانی تر و خوێندنەوەی بەرهەمـەکانی ئـەدەبی جیهـانی و لـە رێگـەی خوێندنەوە و شارەزابوونیان بە چەند جۆرێکی تری نوێی ئەدەبی، وەکـو هونـەری

ژیاننامه، که به زمانی عەرەبی و ئەوروپییەکان نووسرابوون، وای کرد سەرنجیان رابکێشێ بۆ هێنانە کایەوەی بەرهەمی ئەو جۆرە لە ئەدەبی کوردیدا.

رێگای دووەمیش ئەوەیە کە دەستپێکی ئەدەبیاتی کوردی هەروەکو ئەدەبیاتی رۆژهەڵات، سەرەتا بە شیعر دەستیان پێکردووە و شانازییان بە نەژاد و رەچەڵەك و بنەماڵەکانی خۆیانەوە کردووە. ژیاننامە ئەگەر تەنیا بریتی بێ لەو چەند زانیارییە کورت و گشتییانە، ئەوا لە ئەدەبی کوردیدا، هەروەکو ئەدەبی عەرەبی، کاتێ سەیری یەکەمین تێکستە نووسراوە کوردییەکان دەکەین، کەوا لە شیعری هەندێ لە شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا رەگ و ریشەی ژیاننامەی خودی بەرچاو دەکەوێ. شیعر وەکو یەکەم دەقی نووسراوی شاعیران لە چەند شوێنێکدا، یان وەکو مەرجێك بۆ باشی شیعرەکانیان و شانازی بەخۆکردنیان، ناو و نازناو و ساڵی لەدایکبوون و مێژووی گەشتکردنیان لە دێرێك یا چەند دێرێکدا تۆمار دەکەن. ئەمەش بە سەرەتاییێکی سادە و ساکاری مێژووی سەرهەڵدانی هونەری ژیاننامەی خودی لە ئەدەبی کوردیدا دادەندرێ. بۆ نموونە سەبارەت بە مێژووی لەدایکبوونی باباتاهیری هەمەدانی (میرزا مەهدی خانی کەوکەب)، پەنا دەباتە بەر یەکێ لە دوو بەیتەکانی کە دەڵێ :

**مو ئان بەحروم کە دەر زەرف ئامە دەستوم**

**مو ئان نوقتە کە دەر حەرف ئامە دەستوم**

**بە هەر ئەلفی ئەلف قەددی بەر ئایو**

**ئەلف قەدووم کە دەر ئەلف ئامە دەستوم**

نووسەر رستەی (ئەلف قەد ئەلف)ی بە حسابی ئەبجەد لێکداوەتەوە و بەساڵی لە دایکبوونی باباتاهیری دادەنێ کە دەکاتە (٣٢٦ هـ – ٩٣٧ م)[٢١]. دواتر هەوڵیان داوە بە شێوەیێکی فراوانتر و پەخشان ئامێز، گوزارشت لە ژیانی خۆیان یان کەسانی تر بکەن. لەم تێڕوانینەوە کاتێ سەیری مێژووی گەلی کورد دەکەین، واتە ئەگەر لە روانگەیێکی مێژووییەوە، سەیری هونەری ژیاننامە بکەین لە ئەدەبی کوردیدا، یەکەم هەوڵ بۆ شەرەفخانی بەدلیسی دەگەڕێتەوە کاتێ لە ساڵی (١٥٩٦) دا (شەرەفنامە)ی نووسیوە و بە یەکەم سەرچاوە دادەندرێ کە

بریتییە لە تۆمارکردنی مێژووی خەباتی گەلی کورد و ڕۆڵی ئەو میرانەی کە فەرمانڕەوایی میرنشینە یەك لەدوای یەکەکانی گەلی کوردیان کردووە. نووسەر لە سەرەتای پەرتووکەکەیدا ئاماژەی بەوە کردووە، کە وەکو مێژوونووسێك دەیەوێ کارێك بکا کە بەر لەو دەستی مێژوونووسانی پێ نەگەیشتبێ. بۆیە ئەم پەرتووکەش دەچێتە خانەی مێژوو نەك ئەدەب ، بەلأم ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ژیاننامەی ئەدەبی (هونەری)یە کە خاوەنی پرەنسیب و تایبەتمەندی خۆیەتی. هەندێ لە شاعیران لە ئەدەبی کوردیدا بە چەند لاپەڕەیێك لە سەرەتای دیوانەکانیاندا کورتەییێکی ژیانیان تۆمار کردووە، ئەمەش هەوڵێکی باش بووە لە نێو ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد لە نووسینی ژیاننامەی خۆیاندا. بۆ نموونە (شێخ سەلام)ی شاعیر بە دەستخەتی خۆی بەشێکی کەمی لە ژیانی خۆی لە سەرەتای دیوانەکەی تۆمار کردووە. هەمووی بەسەر یەکەوە لە (١٢) لاپەرە تێناپەڕێ. هەرچی (هێمن)ی شاعیریش لە سەرەتای دیوانەکەی لە بەشی (لە کوێ وە بۆ کوێ)دا، ژیاننامەی خۆی نووسیوەتەوە، و زۆر بە وردی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی دەگێڕێتەوە، کە هەر لە سەرەتاوە باسی ساڵ و ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی دەکا. هەروەها پەردە لەسەر لایەنە شاراوەکانی ناخی خۆی هەڵدەداتەوە و باسی ناخۆشییەکانی سەردەمی منداڵی دەکات، کە کاریگەرییان لەسەر دڵ و دەروونیدا هەبووە و ئەمەش نزیکەی (٥٦) لاپەڕە دەبێت.

بەلأم ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە هونەری ژیاننامەی خودییە لە ئەدەبی کوردیدا، وەکو پەرتووکێکی سەربەخۆ کە نووسەر باس لە ژیان و کار و کردەوە و لایەنی دەروونی و ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی بە تێر و تەسەلی بکات

کۆنترین نموونەی ئەم جۆرە دەستنووسی یاداشتەکانی وەفایی (میرزا عبدالرحیمی مەلا غفوری سابلأغییە، کە لە ١٨٤٤– ١٩٠٢ ژیاوە. بە ناونیشانی (بیرەوەرییەکانی وەفایی – تحفة المریدین)ە، کە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەم دەگەڕێتەوە.

هەروەکو ئاشکرایە گوزارشتکردن و بیرکردنەوە و ڕامانی تاك لە خودی خۆی بۆ دەرخستنی لایەنەکانی ناوەوە و دەرەوەی، بوێرییەکی زۆری دەوێ، بۆ ئەوەی

نووسەر گەشتێك بەناو مێژووی ڕۆژانی خۆیدا بكات، لە هەمان كاتیشدا كەشێكی لەبار و گونجاوی دەبێ بۆ بڕەخسێ تا بتوانێ ئەم كارە ئەنجام بدات. هەموو هونەرێك لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا تووشی ململانێ و كێشە دەبێ، بەلاَم لە قۆناغی گەشەكردنیدا تووشی گیروگرفت و نەهامەتی گەورەتر دەبێت. هەموو نووسەرێكی ژیاننامەی خودیش ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی گوزارشت لە خودی خۆی بكات، و ڕاستییەكانی ژیانی بدركێنێ، لەبەر سانسۆری كۆمەڵگا و ئاین و سیاسەت و.... هتد. میللەتی كوردیش لەبەر ئەوەی میللەتێكی ژێردەست بووە و ناحەزانی نەیانهێشتووە لە هیچ ڕوویێكەوە بەرەو پێش بچێ. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی كە لایەنی ئەدەبی و هونەری و ڕۆشنبیریش لەم دەستبەسەر داگرتنە بێبەش نەبووە. سەرەڕای ئەمەش كۆمەڵگای كوردەواری سروشتێكی خێڵەكی هەبووە، كە زۆر شت دەكەنە عەیبە و مەكە و پەیوەستبوون بە داب و نەریتی كۆمەڵگاوە، كە بووەتە هۆی ڕێگە گرتنی نووسەران لە گوزارشتكردن لە بیر و رایان. واتە تاكی كورد بارودۆخێكی لەباری بۆ نەڕەخساوە، بۆ ئەوەی بتوانێ بیر و بۆچوونەكانی بدركێنێ و گوزارشت لە ڕەنج و مەینەتییەكانی بكا. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی بە پێچەوانەی میللەتانی تر، ئەدەبی كوردی بە بەراورد لەگەڵ ئەدەبیاتی جیهانی و جۆرەكانی تری ئەدەب، زۆر درەنگتر هونەری ژیاننامەی خودی ناسیوە. واتە (ژیاننامە ژانرێكی تازەیە و بەراییەكانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم. ڕەفیق حلمی و ئەحمەد خواجە بە دەستپێشخەر دادەندرێن لەم بوارەدا) [٢٢]. ئەوەی جێگای سەرنجە لە ئەدەبی كوردیدا كاتێ سەیری یەكەمین دەقەكانی ژیاننامە نووسراوەكان دەكەین، (یاداشت)ی ڕەفیق حلمی و (چیم دی)ی ئەحمەد خواجە لە باسی ڕۆڵ و هەڵسوكەوتیاندا لە ڕۆژانی شۆڕش و حوكمڕانی شێخ مەحمود تێناپەڕێ، دیارە ویستوویانە نووسراوەكانیان وەك پەیامێكی سیاسی و لەبیر نەكراو ئاڕاستەی گەلی كورد و نەوەی دواڕۆژ و خەڵكانی بیانی بكەن. واتە سەرەتاكانی هەبوونی ژیاننامەی خودی وەك پەرتووكێكی سەربەخۆ، بەهۆی كاریگەری لایەنی سیاسی بەسەریانەوە و بەشداربوونیان لەو ڕووداو و بارودۆخەی گەلی كوردی تیا دەژیا، و سەرەڕای سەرسامبوون و شانازیكردنیان بە كەسایەتی شێخ مەحمود، بوونەتە هۆی

تۆمارکردنی یاداشت و ڕووداوەکانی ئاقاری ژیانیان. لەم دوو نموونەی سەرەوەدا نووسەران کاتێ باسی ژیانی خۆیان دەکەن، ئاوێنەی ژیانی کەسێکی تری تیا دەدۆزنەوە. لە یاداشتی رەفیق حلمیدا راوەستانێك لە پێشکەشکردنی ژیاننامەی خۆیدا دروست دەکات و باسی ژیانی کەسایەتی شێخ مەحمود دەکا، هاوکات لەگەڵ گێرانەوەی ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمەی گەلی کورددا، توانیویەتی دوو خاڵی گرنگ لە ژیاننامە خودییەکەدا باس بکات، ئەوانیش باسی ژیانی کەسێکی تر و لایەنێکی نەتەوەیی کە نەتەوەی کوردە.

لە ئەنجامی خوێندنەوەی هەندێ دەقی ژیاننامەی خودیدا، دەبینین هەندێ نووسەر لەگەڵ دیارکردنی لایەنەکانی ژیاننامەی خودی خۆیدا، باسی هەندێ لایەنی ڕووداوی مێژووی گەلێك یان مێژووی ژیانی نەتەوەیێکی کردووە. بۆنموونە لە (چیم دی)ی ئەحمەد خواجە لایەنی مێژوویی زۆر باس کردووە، هەروەها باسی ڕووداو و ئەو گۆڕانکارییانەی کردووە کە بەسەر گەلی کورددا هاتووە، لە سەردەمی شێخ مەحموددا، وە لە هەمان کاتیشدا لایەنێکی لە ژیاننامەی بابەتی تێدایە. ئەگەرچی ئەم هونەرە بەسستی هەنگاوی ناوە، بەڵام بە سەرەتایەکی گەش و پێشینەیەکی باشی بۆ نووسینی کوردی تۆمار کردووە. پاشان ژیاننامەی خودی بەرە بەرە گەشەی سەند و بەرهەمەکانی زیاد بوون و نووسەر و شاعیران هەوڵیانداوە گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن و کاریگەری ئەو بارودۆخەی کە گەلەکەیان تیایدا دەژیا تۆمار بکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هونەرە لە ئەدەبی کوردیدا لە چەند دانەیێك تێپەڕ ناکا. ئەمانەی خوارەوە هەندێ نموونەی هونەری ژیاننامەی خودی کوردین :

١- رەفیق حلمی – یاداشت – ٧ بەرگ – لە ساڵانی (١٩٥٦ – ١٩٥٧) چاپ کراون.

٢- ئەحمەد خواجە – چیم دی – لەساڵی (١٩٦٨) چاپ کراوە.

٣- مەلا عەولای حاجی سمایل – سەربردەی ژیانی سیاسیم – لە ساڵی (١٩٩٠) چاپ کراوە.

٤- مەسعود محەمەد – گەشتی ژیانم – لە ساڵی (١٩٩٢) چاپ کراوە.

٥- جگەر خوێن – ژینا نیگارا من – لە ساڵی (١٩٩٥) چاپ کراوە.

٦– هەژار موکریانی – چێشتی مجێور – لە ساڵی (١٩٩٧) لەچاپ دراوە.
٧– پاکیزە رەفیق حلمی – کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە – لە ساڵی (٢٠٠٠) چاپ کراوە.
٨– هێمن – لە سەرەتای دیوانەکەیدا لە بەشی (لە کوێ وە بۆ کوێ)دا ژیاننامەی خۆی نووسیوە، لە ساڵی ٢٠٠١ چاپ کراوە.
٩– شاکر فەتاح – ئاوێنەی ژینم – هەموو دەستنووسەکانی لە لایەن (ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی) کۆکراوەتەوە و لە ساڵی (٢٠٠٣) چاپ کراوە.
١٠– هێدی – ئاوێنەی شکاو یان بیرەوەری هێدی – لە ساڵی (٢٠٠٤) چاپ کراوە.

**کورتەیەك لە ژیانی پاکیزە رەفیق حلمی :**

دکتۆرە پاکیزە کەسایەتییەکی رۆشنبیر و کوردپەروەر و بوێر بووە، لە رێکەوتی ٧ / ٥ / ١٩٢٤ لە سلێمانی لەدایك بووە. کچی (رەفیق حیلمی)یە. لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەر و ئەدیب و سیاسەتمەدار بووە، وەکو یەکەم کچە کورد توانیویەتی بچێتە دەرەوەی وڵات، بۆ خوێندن و پلە بەرزەکانی خوێندنی بە دەست هێناوە. هەروەکو خۆی لە یاداشتەکەی ئاماژەی پێدەکات، کەوا تەنیا ئەو بووە لەو کۆمەڵە کچەی لەگەڵیدا بوون لە قۆناغی سەرەتایی گەیشتۆتە پلەی هەرە باڵای خوێندن و لە سێ زانستگای زۆر بەناوبانگی جیهانی خوێندوویەتی و ماستەر و دکتۆرای وەرگرتووە و گەیشتۆتە پلەی پرۆفیسۆری و نزیکەی (٤٠) ساڵ مامۆستای زانیاری زمان بووە و لەگەڵ زانستگای ناوەوە و دەرەوەی عیراق وانەی وتۆتەوە.

لەساڵی (١٩٥٩)دا بۆ یەکەم جار لە مێژووی رۆشنبیری کوردیدا، بە پێنووسی ئەم ئافرەتە بەشی کوردی لە زانستگای بەغدا کردۆتەوە و لە دامەزراندنی (کۆڕی زانیاری کورد)دا وەك ئەندامێکی کارا دەستێکی باڵای هەبووە. زمانەکانی ئاشووری و ئەلمانی و ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی و فارسی باش زانیوە. وتار و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارەکانی (گەلاوێژ، هەتاو، معلم الجدید، الادیب، کۆڕی زانیاری کورد، رۆشنبیری نوێ) بلاّو کردۆتەوە. یەکەم ئافرەتی کوردە توانیویەتی بوێرانە ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوە و پەردە لەسەر نهێنییەکانی ژیانی هەڵماڵێ.

لە رێکەوتی ١٢ / ٨ / ٢٠٠٣ لە شاری سلێمانی دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت[٢٣].

**تەوەری دووەم :**

**ڕەگەزە هونەرییەکانی ژیاننامەی خودی لە بنیاتی دەقی ( کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ) ی پاکیزە ڕەفیق حلمی دا :**

**گێڕانەوە :**

ڕەگـەزی گێڕانــەوە بەشـێکی سـەرەکییە لـە بـەدیهێنانی ژانـرە گێڕانــەوە ئامێزەکـان. پـاکیزە لـە دەقـی (کـورد و ژیـانێکی پـڕ ئەندێـشە)دا توانیویـەتی ژیاننامـەی خـۆی بـە شـێوەیەکی زۆر پوخـت و چـڕ لـە دوتـوێی کتێبێکـی (٢٦٧) لاپەڕەییدا تۆمار بکات. کە لە پێشەکییەك و چوار بەش پێکدێ. بەشەکانی قۆنـاغ لەدوای قۆناغەکانی ژیانی بەگوێرەی بەدواییەکداهاتنی زنجیرەی ساڵەکانی تەمەنی هەر لەو کاتەی لەدایك بووە، تا ئەو کاتەی لە نووسینەوەی دەقەکە بۆتەوە تۆمـار کـردووە، هاوکـات لەگـەڵ ناوهێنـانی ئـەو شـوێنانەی لێـی نیـشتەجێ بـووە. لـە پێــشەکییەکەیدا تیـشك دەخاتــە ســەر ڕووداوەکــانی ئــەو ڕۆژانــەی کــەوا لــە تۆمارکردنی دەقەکەی بۆتەوە. پاکیزە کەسێکی ڕۆشنبیر و زمـانزان و زمانـەوان و دنیادیدە و کوردپەروەر بووە و زۆر شوێن گەڕاوە و خاوەن بڕوانامەی بەرز بـووە. ئەمانە هاندەر بوونە بۆئەوەی بەرهەمەکەی بە شێوەیێکی جوان و سەرنجڕاکێش و ئەدەبییانـە پێـشکەش بـە خوێنـەران بکـات. وەلەبـەر ئـەوەی ڕاسـتەوخۆ باسـی ژیاننامـەی خـۆی دەکـات، بۆیـە وەکـو کەسـایەتییەکی سـەرەکی نـاو دەقەکـە، هەســتاوە بــە کــاری گێڕانــەوەی ڕووداوەکــان بــە تێکــەڵبوونی هەڵــسوکەوت و ڕووداوەکـانی ژیـانی کەسـانی دەوروبـەری لەگـەڵ ژیاننامــەی خۆیـدا. وەك لـەم نموونانەی خوارەوە جۆرەکانی گێڕانەوە لە دەقەکەدا دیار دەکرێت :

**١- گێڕانەوەی بابەتی :**

((باوکم کە چووە کەرکوك لەبەر پێویستی ژیان ناچار بوو بـە مامۆسـتا لـە حکومەتەکەی عێراقدا...)) [٢٤]. وە لە نموونـەیێکی تـردا دەڵـێ ((بابـا گـەورە... بەیانیان پێش مەلا بانگدان هەڵ ئەستا و نوێژی ئەکرد و خـۆی بـە دەسـتی خـۆی قاوەیەکی تاڵی بۆ خۆی لێ ئەنا و ئەی خواردەوە))[٢٥]. گێڕەرەوە لـەم نموونانـەدا باسی ڕووداوێك دەکا کە هیچ پەیوەندییێکی پێوە نییە و کـار و کـرداری کەسـەکان

دەگێڕێتەوە، نەك وەك كەسێكە بەشدار لە رووداوەكە، بەڵكو وەكو كەسێكی چاودێر و ئاگاداری هەست و ناخی كەسەكانی تر رووداوەكان دەگێڕێتەوە.

٢ – گێڕانەوەی خودی :

لەم جۆرەدا گێڕەرەوە وەكو كەسایەتییەكی ناو دەقەكە هەڵسوكەوت دەكا : (لەمیانەی چاوی گێڕەرەوەكەوە بەدوای گێڕانەوەكە دەكەوین، یان پێویستمان بە روونكردنەوەی هەموو هەواڵێك نییە، كە چۆن و لەكوێ گێڕەرەوە یان گوێگر ئەمەیان زانیوە) [٢٦]، گێڕەرەوە بەشداری لە گێڕانەوەی رووداوەكان دەكا و راناوی قسەكەری (من) ی تیا بەكاردێنێ. بۆ نموونە : ((هاوسەریم لەگەڵ یەكێكدا گرت كە زۆر جیاواز بوو لە نەژادی من و زۆر دوور بوو لە بیر و باوەڕی من، ئەو هەڵە پەردەییێكی تاریكی هێنا بەسەر ژیانمدا هەمووی ئاڵۆزاند و تێكدا)) [٢٧].

لە نموونەییێكی تردا : ((من لە عمارە زمانم پژا و لەوێ لەگەڵ ئافرەتێكی معێدی كە ئیشی بۆ ئەكردین فێری عەرەبی بووم....)) [٢٨]. لەم نموونانە بۆمان دەردەكەوێ كە گێڕەرەوە یەكێكە لە كەسایەتییەكانی ناو رووداوەكان و لەبارەی ژیانی خۆیەوە قسە دەكات و لە كاتی گێڕانەوەكەدا راناوی (من) بەكاردێنێ.

رووداو :

رووداو بە یەكێك لە رەگەزە گرنگەكانی بنیاتی دەقی ژیاننامە دادەندرێ و كاریگەری لەسەر رەگەزەكانی دیكەی ژانری گێڕانەوە ئامێز هەیە و لە نێوان خۆیاندا كار لە یەكتر دەكەن بۆ بەرێوەبردنی پرۆسەكە (دەقەكە). بۆیە (رێكخستنی رووداوەكان لە ژیاننامەدا بە بەشێكی گرنگ و سەرەكی دادەندرێ، لە بنیات و دامەزراندنی دەقەكەدا و كاتێ بنیاتەكەی لەسەر بنەمایەكی هونەری پتەو و یەكگرتوو بێ و پشت بە توانا و لێهاتوویی نووسەر دەبەستێ لە بەیەكەوە بەستنەوەی رووداوەكان و ریزكردنیان) [٢٩]، و هەر نووسەرێك بە شێوازێكی تایبەت رووداوەكانی ژیانی خۆی پێشكەش دەكات.

لەدەقی ژیاننامەی خودیدا ڕووداو بریتییە لە کۆمەڵێك ڕووداوی ڕاستەقینەی ژیانی نووسەر، کە لەکاتی ڕابردوودا ڕوویانداوە. پاکیزە ڕەفیق حلمی لە دەقی ژیاننامەکەیدا ڕۆڵی کەسایەتی سەرەکی و گێڕەرەوە دەبینێ و هەستاوە بە گێڕانەوەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی، کە لە پێشەکییەك و چوار بەش پێکهاتووە. لەم چوار بەشەدا ڕووداوەکانی ژیانی قۆناغ بە قۆناغ تۆمار کردووە. هەرچی پێشەکییەکەیە وەك ڕوونکردنەوەیەکە یان دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو ژیاننامەکەی، کە دانی بە چەند ڕووداو و زانیارییەکی گرنگ لە نهێنییەکانی ژیانی خۆیدا ناوە. واتە هەر لە سەرەتای دەقەکەیدا مێژوو و ڕێکەوتی لەدایکبوونی خۆی تۆمار نەکردووە. هەروەکو خۆی دەڵێ : (بەم سەرەتایە دەستم کرد بە نووسینەوەی یاداشتەکانم واتە لە کلکەوە نەك لە سەرەوە، چونکە ئەوەی باسم کرد پێوەندی بەم دواڕۆژانەی ژیانمەوەیە بە پێویستم زانی باسی بکەم)[٣٠]. کۆتایی ژیاننامەکەش لە ڕووبەری لاپەڕەیەکدا بە چەند ڕووداوێك کۆتایی پێدێنێ. یەکێك لەوانە ڕووداوی دڵتەزێنی مردنی شەوقی برای بووە، بە هۆی پێکدادانی ئۆتۆمبێلەوە بووە و زۆر کاریگەری لەسەر کردووە. دواتر گەڕاوەتەوە ئەردەن و لە زانستگاکانی کاری کردووە و دوای ماوەیێك ئیستیقالەی داوە و گەڕاوەتەوە بەغدا و دواتر لەسەر داوای خۆی هاتووەتە زانستگای سەلاحەدین لە هەولێر و لە ساڵی (١٩٩٠)دا خانەنشین کراوە. دواتر دەستی کردووە بە نووسینی ئەم دەقە و چووەتە ئەمەریکا تا کاتی تەواوبوونی لە ساڵی (٢٠٠٠) دا.

پاکیزە مێژووی لەدایکبوونی خۆی بە ڕووداوێکی مێژوویی و ناخۆشی گەلی کورددا بەستۆتەوە، کەوا هەر لەو ڕۆژەوەی هاتووەتە ئەم دونیایە دوچاری ناخۆشی و دەردەسەری بووە. هەروەك دەڵێ ((ناوەڕۆکی سەرگوزشتەی ژیانم کە زۆر دوور و درێژ و تاڵ و تاریکە لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە هەتا ئێستە. لە ڕاستیدا هەر لەدایکبوونەکەم تراجێدیایەکی سەیرە. من لە سووررداش لە دایك بووم کە ناحیەیەکی شاری سلێمانییە.. لە ئەشکەوتەکەی سووررداش. ئەمە کارەساتێکی مێژووییە لە ژیانی من و کوردا... لەو ڕۆژەدا شاری سلێمانی بۆمباران کرا لە لایەن فڕۆکەی جەنگی بەریتانیا کە کوردستان بەشێك بوو لە میراتەکەی پاش ئیمبراتۆریەتی عوسمانی بەر ئینگلیز کەوت پاش جەنگی یەکەمی جیهانی)) [٣١].

پاکیزه وەکو کچە کوردێکی خوێندەوار و رۆشنبیر گەلێ شوێنی کردووە و رووداو و بەسەرهاتی هاتۆتە رێگا. لەم دەقەدا باسی رووداوەکانی ژیانی خۆی دەکات، کە هەندێکیان کاریگەرییان لەسەریدا هەبووە و بوونەتە هۆی گۆڕینی رێچکەی ژیانی و فێری ژیانێکی دیکەی کردووە. بۆنموونە کاتێ لە خێزانەکەی جیا دەبێتەوە و لە سالی (١٩٤٤) بۆخوێندن دەچێتە بەغدا و دەڵێ: ((کە چوومە (دار المعلمین العالیة) تاقیکردنەوەیەکی تازە بەسەر ژیانمدا هات و گۆڕانێکی تەواو... هەرچەند سالێك لەوە پێش من دوور کەوتبوومەوە لە مالی باوکم و فێری ژیانی تایبەتی و بە تەنیا بووبووم، بەلام ئەو سالە تەواو هەستم کرد بە سەربەخۆیی و تەنیایی، چونکە چوومە ناو کۆمەلێك کچ و کوڕ لەتەمەنی خۆم و هەندێکیشیان کورد، چونکە قوتابییەکان لە هەموو شارەکانی عیراقەوە هاتبوون بۆ پلەی یەکەمی خوێندنی بالا...))[٣٢]. لە خوێندنەوەی ئەم دەقەدا تێبینی ئەوە دەکەین، بەشێکی رووداوەکانی ئەو رووداوە گرنگانەن کە لە سەدەی رابردوودا رووبەڕووی گەلی کورد بوونەتەوە، کە زۆربەیان گێڕانەوەی رووداوی مێژوویی گەورەن. و گێڕەرەوە توانیویەتی رووداوە مێژووییەکانی سەردەمی خۆی بگێڕێتەوە وەکو کەسێکی بەشدار یاخود بینەر لە ئێش و ئازارەکانی میللەتی کورددا، هەروەکو دەگێڕێتەوە و دەلێ : ((بەیانی شەشی ئەیلول نە... باوکم زوو هەستا دەمانچەکەی بەستە پشتی و دوو سێ چرپەی کرد بە گوێی دایکما، دایکم رەنگی زەرد هەلگەرا بەلام ورتەی نەکرد... لەگەلێ تۆفیقی قەزاز و دوو ئەفەندی تر سواری ئۆتۆمبێلەکە بوو لەگەلیا و بەمنی وت خێرا بچۆرە ژوورەوەو دەرگاکە داخە نەیەیتە دەرەوە... بجێ چووە بەرقاپی سەیری کرد خەلقەکە رائەکەن و لەبەر دەرکی سەراوەیەنەوە... مالی ئێمە دوور بوو لەبەر دەرکی سەرا لەبەر ئەوە گوێمان لە تەقە و هۆر نەبوو.. بەلام خەلقەکە بەدەم راکردنەوە ئەیان زریکاند و ئەیان وت ئەی هاوار سلێمانی وێران بوو.. قڕی تێ کەوت و کەس نەما.. حکومەت خەلقی قەلاچۆ کرد. داییبنە بەر تۆپ و تفەنگ....)) [٣٣]. پاکیزە کارەساتە مێژووییەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی دەگێڕێتەوە کە لە رێکەوتی ١٩٣٠/٩/٦ دا کوردەکان راپەڕیبوون دژی حکومەتی ئینگلیز. کاتێ سەیری ناونیشانی دەقی ژیاننامەکە دەکەین، خۆی لەخۆیدا دەلالەت لە بوونی بەسەرهات و رووداوی ناخۆش و جەرگبڕ

و ژیانێکی پڕ لـە هـەوراز و نـشێو و دەردەسـەری و کاولکـاری دەکـا و لـە هەنـدێ شوێنی ژیاننامەکەدا، لـە ژیاننامـەی خـۆی دوور دەکەوێتـەوە و باسـی کێـشەکانی گەلی کورد یا باسی ژیان و ڕۆڵی کەسایەتی ناوداران یان دەوروبـەری دەکـا، وەکـو (ڕەفیق حلمی و شێخ مەحمود و پیرەمێردی شاعیر و مەلا مستەفا). هـەروەکو لـە لاپەڕە (١٤٧– ١٧٤) ی دەقی ژیاننامە خودیەکەیدا بەرچاو دەکەوێ.

ژیـانی پـاکیزە چـەندین ڕووداوی خـۆش و ناخۆشـی تیـا بـەدی دەکـرێ. یەکـەم ڕووداوی نـاخۆش لەسـەرەتای ژیانیـدا هەسـتی پێـدەکرێ و کاریگـەری لـە سەری بەجێ هێشتبێ، مردنی حافیزەی خوشکی بووە بـە نەخۆشـی سـورێژە کـە دەڵێ : ((.. ئەم کارەساتە سـامناکەم یەشـتا لـە بـیرە و قـەت لـەبیر ناچـێتەوە.. یەکـەم جـار بـوو بـەرەنگاری مـەرگ بـبم))[٢٤]. ڕووداوێکـی دڵتـەزێنی تـری مردنـی گوزیدەی خوشـکی بـوو بەهـەمان نەخۆشـی و دەڵـێ : ((کـە نیـوەڕۆ هاتمـەوە... هێشتا نەگەیشتبوومەماڵەوە لەسـەر کۆڵانەکـەوە گـوێم لـە قیـژە و هـاواری ژنـان بوو... ڕام کرد وەك شێت کە گەیشتمە بەر دەرگاکەی خۆمان سەیرم کـرد پیـاوان لەناو داڵانەکەدا ڕاوەسـتاون و بـاوکم لـەناویان بـە کـوڵ ئـەگری... ڕام کـرد بـچمە سەرێ... لـەو کاتـەدا سـەیرم کـرد خاڵـە مـەحمود گوزیـدەی بـە باوەشـەوەیە لـە قاڵدرمەکان بە شێنەیی دێتە خوارێ ملی گوزیـدەی بەسـەر قۆڵیـەوە لار بۆتـەوە و قژە زەرد و جوانەکەی بەسەر شانی خاڵـە مـەحمودەوە پـەرش و بـڵاو بۆتـەوە... جانتام فڕێ دا و خۆم دا بە ئەرزا لە حەوشەکەدا دەسم کرد بـە هـاوار و گریـان... کە ئیتر ئاگام لە خۆم نەما... کە چاوم کردەوە شەو بوو...))[٢٥]. مردنی ئـەم دوو خوشکەی هاندەرێك بووە بۆ ئەوەی لەدواڕۆژدا حەزبکات ببێتە پزیـشکی منـداڵان، هەروەکو خۆی دەڵێ : ((من هەر لە منداڵییەوە خۆم ئامادە کردبـوو بـۆ خوێنـدنی زانیـاری پزیـشکی منـداڵان، پـاش ئـەوەی مـەرگی دوو خوشـکە نـازدار و جوانـە بـچکۆلەکانم بـە چـاوی خـۆم دی و زانـیم کـە نـەفامی و نـەزانین بەگـشتی دەردی کوشـندەی کـوردە...))[٣٦]. بـەڵام ئـەم ئاواتـەی نەهاتۆتـە دی، لەبـەر ئـەوەی ئیمتیحانی بـەکالۆریای بەشـی ئـەدەبی داوەتـەوە، چـونکە (دار المعلمـات) بەشـی علمـی نـەبووە. بۆیـە بـۆی نەڕەخساوە بـچێتە بەشـی زانـستی و ببێتـە پزیـشکی منـداڵان. بـەم جـۆرە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە گێـڕەرەوە لـە ژیانیـدا زۆر ڕووداو و

بەسەرهاتی ناخۆشی بینیوەو تووشی کەم دەرامەتی و نەفیکردن و گوێزانەوە بووە بۆ زۆربەی شارەکانی عێراق، هاوکات لەگەڵ کاریگەری شەڕ و شۆڕ بەسەریانەوە. دوای شووکردنی بە دەست ئەو ژیانە ناخۆشە دەناڵێنێ کە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەسەری بردووە و زۆر پەشیمان بووە لەو هاوسەرگیرییە، بە دەردی سەر منالەکانی بەخێو کردووە و دواتر لێك جیا بوونەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش کۆڵی نەداوە و بەردەوامی بە خوێندن داوە و تا گەیشتۆتە پلەی پرۆفیسۆری.

سەبارەت بە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانی تایبەتی خۆی، توانیویەتی بە شێوەیێکی ڕێکوپێك و کاریگەر بیانگێڕێتەوە، وەك ئەوەی ڕووداوەکانی لەکاتی خۆیدا تۆمار کرابن، بۆیە گێڕەرەوە وەکو کەسێکی ئامادەبوو بەشدارە لە ڕووداوەکان و بە ڕاناوی قسەکەری (من) ڕووداوەکان بە شێوەیێکی سەرنجڕاکێش دەگێڕێتەوە.

**کەسایەتی :**

کەسایەتی وەك رەگەزێکی گرنگ کاریگەری هەیە لە کاری گێڕانەوەدا، چونکە لە ڕێگای ئەوەوە ڕووداوەکان دەخرێنە ڕوو، واتە ڕووداوەکانی ناو دەقەکە لە دەوری ئەودا دەسووڕێنەوە و ئەزموون و خەون و خەمەکانی بەرجەستە دەکات (دەقی هەموو ژیاننامەیەکیش پێویستی بە ژیانی کەسێکە کە خاوەن ئەزموون و هەست و سۆزێك بێ و شایەنی گێڕانەوە بێ، چونکە ناتوانرێ بیر لە ئەزموونێك بکرێتەوە بەبێ بوونی کەسێك کە خاوەن ئەزموونەکە بێ) [٣٧]. ئەم کەسایەتییەش لە کەسایەتییەکانی تر جیادەبێتەوە لە لایەنی هەست و سۆز و بیرو باوەڕیەوە، و پێویستە پەیوەندییەکی وردی لەگەڵ ڕووداوە گەورەکانی واقیعی ڕاستەقینەدا هەبێ کە ڕوویانداوە و خاوەن تێڕوانینێکی تایبەت بێ لە ژیاندا. ژیاننامەی خودی وەك هونەرێکی ئەدەبی، یەکێك لە مەرجەکانی نووسینی ئەوەیە، پێویستە نووسەر بەخۆی ڕووداوەکانی ژیانی بگێڕێتەوە. ئەوکاتە هاوتایی لە نێوان (گێڕەرەوە و نووسەر و کەسایەتی سەرەکی) دا جێبەجێ دەبێ. ئەمەش لە چەند ڕێگەیەکەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ، ئەوانیش گێڕانەوەی ڕووداوەکانە بە ڕاناوی کەسی یەکەم و ناوی نووسەر هەمان ناوی کەسایەتی سەرەکی ناو دەقەکەبێ و

وێنەی کەسایەتییەکە لەسەر بەرگ و ناو کتێبەکەدا هەبێ، یاخود لە پێشەکیدا ئاماژەی بۆ کرابێ و هەندێ جاریش ناونیشانی ژیاننامەکە ئاماژەیە بۆ ناوەرۆکی دەقەکە. لە دەقی ژیاننامەکەی پاکیزەدا ئەو خاڵانەی سەرەوە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بەرچاو دەکەون، و گێڕەرەوە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی ژیاننامەکە، رووداوەکانی ژیانی خۆی بە راناوی کەسی یەکەم دەگێڕێتەوە. بۆ نموونە کە دەڵێ : ((...منیش لەگەڵ بجیم چووم بۆ مەکتەبی زەهرا و لەوێ بجی بە تورکی قسەی لەگەڵ زەهرا خان کرد، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو کە من کچی رەفیق حلمی بووم...))[٣٨]. یان ((من لەو سەردەمەدا واتە یەشتا لە دارالمعلمین العالیە بووم دەستم کردبوو بە نووسین بە کوردی و عەرەبی)) [٣٩]. یان ((کۆتایی ساڵی ١٩٣٥ و سەرەتای ساڵی ١٩٣٦... باوکم دیسانەوە ئاوارە بوو بۆ بەسرا و ئێمە بەو زستانەی سەهۆڵبەندانە وەك بێچووی چۆلەکەی بێ پەڕ و باڵ ماینەوە بە دیار دایکمەوە))[٤٠]. لەم نموونانەی سەرەوەدا راناو و جێناوی کەسی یەکەم زۆر بە روونی بە دەقەکانەوە دیارە. وە لە کاتی خوێندنەوەی ژیاننامەکەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ناوی نووسەر هەمان ناوی کەسایەتی سەرەکی ناو دەقەکەیە و چەندین جار ناوی پاکیزە هاتووە و بەچەند شێوەیەك نووسراوە ئەوانیش (پاکیزە، پاکز، پەزە)، کە هەموویان مەبەستیان (پاکیزە رەفیق حلمی)یە. کە نووسەر و گێڕەرەوەی رووداوەکانە بۆ نموونە : ((باوکت کە رۆیشت وتی جەمیلە ئەگەر کچت بوو ناوی بنێ پاکیزە ! بۆیە ناوم نایت پاکیزە))[٤١]. یان ((باوکم لە فرۆکەخانە زۆر بە ماتییەوە دەسی کردە ملم و وتی پاکز، ئەمجارە ئیتر نامبینییەوە)) [٤٢]،

لەگەڵ ئەمانەشدا وێنەی کەسایەتی سەرەکی و کورتەی ژیاننامەکەی لەسەر بەرگی کتێبەکەیدا هەیە، لەگەڵ وێنەی چەند کەسانێك کە رۆڵی کاریگەریان هەبووە لەگەڵ کەسانی ناسراوی میللەتی کورد، لە کۆتایی کتێبەکە بەرچاو دەکەوێ. ئەمەش وەکو بەڵگەیەکە کە بۆ زیاتر دڵنیابوون و هاتنەدی مەرجی راستگۆیی و درکاندنی هەقیقەتی رووداوەکان. سەرەڕای ئەمانەش نووسەر لە پێشەکیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە یاداشتەکانی خۆی دەنووسێتەوە و دەڵێ: ((زۆرم بیر لەوە کردەوە ئەم یاداشتە بە چ زمانێك بنووسمەوە))[٤٣].

هەروەکو ئاشکرایە دەقی ژیاننامە رووداوێکی راستەقینە دەگێڕێتەوە، کە لە رابردوودا رووی داوە. بەمەش ئەو رەگەزانەی لە بنیات و پێکهاتەی دەقەکە بەشدارن دەبێ راستەقینە بن. دەقی ژیاننامەی پاکیزەش کۆمەڵێ کەسایەتی راستەقینە لە خۆ دەگرێ، هەندێکیان رۆڵی سەرەکی دەبینن و کاریگەرییان لە سەر دروستبوونی کەسایەتی هەبووە و هەندێکیان رۆڵی لاوەکی دەگێڕن، ناوهێنان و باسکردنیان لە چەند هەڵوێستێ تێناپەڕێ لەو کەسایەتیانەی هەر لە سەرەتای ژیانی پاکیزەوە کاریگەرییان لەسەری هەبووە (رەفیق حلمی) باوکی بووە. کە کەسایەتییەکی رۆشنبیر و کوردپەروەر و سیاسی بووە، کاریگەری نەك تەنیا لەسەر پاکیزە بەڵکو لەسەر زۆر کەسانی دیکە هەبووە. لەم بارەیەوە پاکیزە دەڵێ : ((بەڕاستی رەفیق حلمی یەکەم مامۆستای بە نرخ و بە رێزم بوو لە ژیاندا و چاوی کردمەوە بەرامبەر گەلێ راستی کە بەبێ ئەو بۆم نە ئەدۆزرایەوە.. کوردایەتی یەکەم دەرس و بە نرخترین دەرس بوو لە ژیانمدا کە ئەو پێی وتم ! ئەو خۆمی پێناسیم... رەفیق حلمی فێری کردم مێژوو بپشکنم، زمان لێبکۆڵمەوە.. شیعر و ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی شی بکەمەوە.. فێری فەلسەفەی کوردایەتی کردم...))[٤٤]. هەروەها کەسایەتییەکی تری وەك (حەبسە خانی نەقیب) کە ئامۆزای شێخ مەحمود و خێزانی قادری برای بوو، لە تەمەنی هەرزەکاری و گەنجیدا زۆر کاریگەری لەسەر پاکیزە هەبوو، کە دەڵێ : ((حەبسەخانی نەقیب زۆری کار کردە بیر و باوەڕم بەرامبەر کورد و ئافرەتی کورد))[٤٥]. جگە لەمانەش چەندین کەسایەتی دیکەی وەك (دایك، پووری، خوشك و براکانی، ئەو کەسانەی لەماڵیان بوون، کچەکانی، پیاوەکەی) رۆڵیان هەبووە و لە گێڕانەوەی رووداوەکان بەشدارییان کردووە.

پاکیزە لە ژیانیدا بەهۆی خوێندن زۆر شوێن گەڕاوە و تووشی جۆرەها تاقیکردنەوە بووە و دوورەوڵاتی دیوە و هەستی بە تەنیایی و غەریبی کردووە و ئاشنایەتی لەگەڵ چەندین کەسایەتیدا پەیدا کردووە. تووشی هەڵوێستێکی خراپ بووە. یەکێك لەوانە ئەو کاتەبووە کە چووە بەشی ناوخۆیی کچان لە بەغدا و دەڵێ : ((خۆم دیم بە چاوی خۆم کە لە ساڵی ١٩٤٢ دا لە دار المعلمات ئیبتیدایی بووم و لە داخلی ئەژیام جووت جووت کچە عەرەبەکانم ئەدی ئەچوونە ناو جێگە و بێ

شەرم پێکەوە ئەنوستن))[٤٦]. لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا دەتوانین دوو سیفاتی تایبەتی کەسایەتی پاکیزە بزانین کە لە دوو لایەن خۆی دەبینێتەوە :

١- کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر : پاکیزە لە بەشە سەرەتاییەکانی ژیاننامەکەی دا لـە قۆنـاغی پێکهـاتن و دروسـتبوونی کەسـایەتی بـوو لـە ڕووی ڕۆشـنبیرییەوە. هەرچی لە بەشەکانی ترە پێکهاتنی ئەم کەسایەتییە توانیویەتی بگاتە پێگەیـەکی ڕۆشنبیری بەرز و هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بالاّ ببڕێ و لە ساڵی ١٩٧٦ دا ببێتە پرۆفیسۆر لە زانستی زماندا.

٢- کەسایەتی سیاسی : هەر وەك لە ژیاننامەکەدا دیـارە هـەر لـە سـەرەتای ژیانیدا باوکی فێری کوردایەتی کردووە و ئاشنایەتی لەگەڵ زۆر لە پیاوانی سیاسی و بنەماڵەکانیانـەوە هـەبووە، هـەروەکو خـۆی دەڵـێ: ((پەیوەنـدیم لەگـەڵ مـەلا مـستەفا کـردووە و لـە نزیکـەوە ناسـیومە، هـەروەها پەیوەنـدیم لەگـەڵ پـارتی دیموکراتی کوردستان کردووە، هەرچـەندە نـەبووم بـە ئەنـدام)) [٤٧]. پـاکیزە ئـەم یاداشتەی پێشکەش بـە سـێ مرۆڤـی نـاودار و کوردپـەروەر کـردووە کـە هـەردەم هـەوڵیان داوە بـۆ ڕۆشـنکردنەوەی ڕێگـەی ئـازادی بـۆ میللـەتی کـورد، ئـەوانیش (پیرەمێرد و ڕەفیق حلمی و مەلا مـستەفا) بـوون. پـاکیزە وەك ئـافرەتێکی کـورد ڕۆڵی خۆی بینیوە لە بواری ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

**کات :**

ڕەگەزێکە لەو ڕەگەزە بنەڕەتییانەی کـە دەقـی گێڕانـەوەی لەسـەر بنیـات دەنرێ، و هەموو ڕەگەزەکانی دیکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لە ناو دەقدا گرنگی خۆی هەیە، چونکە (حەقیقەتێکی ڕەهای لاستیکییە، تـەنها لـە ڕێگـەی کاریگـەری لەسەر ڕەگەزەکانی تردا بەدەر دەکـەوێ)[٤٨]. یـان بـە شـێوەیێکی کـات نـابینرێ، بەڵکو هەست بە شوێنەواری دەکەین، کاتێ لەسەر بوونـەوەرەکانی دەوروبەرمانـدا بەرجەستە دەبێ. بـەم جـۆرە کـات وەکـو ڕەگـەزێکی بەشـدار، کاریگـەری لەسـەر ڕەگەزەکانی دیکەی دەقی گێڕانەوەییدا هەیە و گێڕەرەوەش لە کارەکەیـدا پـشتی پـێ دەبەسـتێ. پـاکیزە لـە ژیاننامەکەیـدا گـەلێ ڕووداوی تایبـەتی و مێـژوویی گێڕاوەتەوە، کە پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوخۆی بـە ڕەگـەزی کاتـەوە هەیـە، چـونکە

بوونی رووداو له دەقدا، دوو كات له خۆ دەگرێ، یەكێكیان كاتی روودانی رووداو و ئەویتریان كاتی گێڕانەوەیەتی.

ئــەم كاتانــەش لــەكاتی دووبــارە گێڕانــەوەیان لــەناو دەقێكــی ئەدەبیــدا پێویستییان بە چەند تەكنیكێك هەیە بـۆ رێكخستن و ریزكردنیـان بـە شـێوەیێكی پوخت و گونجـاو. هەرچـەندە پـاكیزە ویستوویەتی كاتـەكانی ژیـانی بەریزبەنـدی كاتی ریز بكا، هەروەكو لە لاپـەڕە (٧) دا خستوویەتیە روو، بـەلاّم لـە نـاوەرۆكی دەقەكەیدا نەیتوانیوە ئەمە بپارێزێ، چونكە لـە نووسـینی دەقێكـی ئـەدەبی وەك ژیاننامـە پێویـستی و سروشـتی ئـەم جـۆرە ئەدەبییـە وای لـێ كـردووە پـەنا بـۆ تەكنیكەكانی رێكخستنی كات ببات كە بەم شێوەیە خستوویەتە روو :

أ– سروشتی كات : مەبەست ئـەو كاتەیـە كـە مـرۆڤ لـە مـاوەی ژیانیـدا پێیـدا تێدەپەڕێ و پێوەری تایبەتی خۆی هەیە. كـات هـەر لـە بەردەوامیدایـە تاكۆتـایی ژیانی كەسەكە. نووسەری دەقی ئەدەبی لـەكاتی بنیاتنـانی دەقـە هونەرییەكەیـدا پەنا بۆ دوو جۆری سەرەكی كات دەبا ئەوانیش :

١– كاتی سروشتی : ئەم جۆرەی كات بە چەند زاراوەی تری وەك (دەرەكی، مێژوویی، بابەتی) دەناسرێ، پەیوەندییەكی بەتینی بـە مێـژووەوە هەیـە، چـونكە نووسەری دەقی گێڕانەوەیی رووداوە مێژووییـەكان دەگێڕێتـەوە و پەیوەنـدی بـە كاتێكی مێژووییەوە هەیە كە رووداوەكەی تیادا روویداوە. ئەو كاتانـەش (ئەوەیـە كە شەو و رۆژو مانگ و وەرز و ساڵ و سەدەكان، تخوبی بۆ دەكێشن و بە كاتژمێر دەپێـورێ)[٤٩]. پـاكیزە لـە دەقـی ژیاننامەكەیـدا ئـەم جـۆرەی كـاتی بـە هـەموو پێوەرەكانی بەكار هێناوە :

١–((ساڵی ١٩٣٠ بەسەرداهات لە جانوورەی ئەم سـاڵە شـەوقی بـرام لـەدایك بوو)).

٢–((... نزیك عەسر بوو لە دەرگایان دا ئێمە هەموو داخورپاین و بە پرتـاوە بجی رای كرد دەرگای كردەوە وامان زانی باوكم هاتەوە....)).

٣–((... من لە هـاوینی سـاڵی ١٩٤٨ بەكالۆریۆسـم وەرگـرت لـە دارالمعلمـین العالیة)).

٤- ((.... گەيشتينە پێشمەرگەکان... رايان گرتين و پرسيان ئێمە کێين... دە دەقيقەی پێ نەچوو سەيرم کرد دووسێ ئوتومبيلی موسەلەحە لە گردەکە هاتنە خوارەوە بەرەو ئێمە و مەلا مستەفا خۆی و حمايەکەی بوون هات بە پيرمەوە....)) [٥٠].

کاتی دەروونی : ئەو جۆرە کاتەيە پەيوەستە بە خودی مرۆڤەوە و پێوەرەکانی بريتين لە هەستەکانی مرۆڤ لە کاتەکانی خۆشی و ناخۆشی و دڵتەنگی و بێزاريدا. پاکيزە لە ژياننامەی پێوەرەکانی کاتی دەروونی بە پێی گۆڕانی باری دەروونی خۆی دەگۆڕێ و بەم شێوەيە گوزارشتی لە کاتی دەروونی کردووە :

أ- کاتی خۆشی :

١- ((... بەڕاستی ئەو چەند مانگەی لە سووورداش رامان بوارد خۆشترين رۆژی ژيانم بوو جارێکی کە ئەو بەهەشتەم نەدييەوە)).

٢-.... ((خۆشترين ساڵی مەکتەبی سەرەتاييم ئەو دوو ساڵەی دوايی بوو کە لە پۆلی پێنج و شەشدا بووم و لە خانووە تازەکەی خۆماندا ژياين)) [٥١].

ب- کاتی ناخۆشی :

١- ((ئەو چەند رۆژەی گوزيدە نەخۆش بوو تيا من ئەوەندە خەفەتم خوارد و مەراقم کرد و رووم کردە ئاسمان لە خوا پاڕامەوە و گريام و زۆر هيلاك بووم)).

٢- ((ئەو شەوە لە ژووری داخليدا بە هەزار شەڕە شەق بردمە سەر... يەکەم شەو بوو بە تەنيا دوور لە دايکم و خوشك و براکانم دوورکەومەوە و لە شوێنێکی غەريبيدا)) [٥٢].

پاکيزە لە دەقی ژياننامەکەيدا لە سەرەتاوە بە رووداوێکی ناخۆش دەستی پێکردووە، ئەويش بۆمبارانکردنی شاری سلێمانی بوو لە لايەن فڕۆکە جەنگييەکانی بەريتانيا و پەڕاگەندە بوونی خەڵکەکەی بەرەو شاخ و ئەشکەوتەکان. لەو دەمەدا لە دايك بووە، واتە کاتی لەدايکبوونی ناخۆش بووە. دواتر کۆتايی بە چەند رووداوێك دێنێ. يەکێك لەوانە رووداوی مردنی شەوقی

برایەتی. بۆیە لە سەرتاسەری ئەم دەقەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، کاتە خۆشەکانی ژیانی لە چاو ناخۆشەکان کەمترن و ماوەی کاتە خۆشەکان تەنها لە سەرەتای ژیانیدا بەرچاو دەکەون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی پاکیزە وەکو ئافرەتێکی کوردپەروەر، لەناو ئێش و ئازاری گەلەکەی ژیاوە و بێبەش نەبووە لە بەسەرهاتی ناخۆش و دەربەدەری. سەرەڕای ئەمەش لە ژیانی هاوسەریدا سەرکەوتوو نەبووە و تووشی گەلێ ناخۆشی هاتووە.

**تەکنیکی کات :**

**١– ریکخستنی کات : رێکخستنی دەمکاتەکانی ناو دەقی ژیاننامەی پاکیزە لە رێگەی دوو تەکنیکەوە رێکدەخرێن:**

**أ– وەبیرهێنانەوە (الاستذکار)** : بریتییە لە (هێنانەوەی رووداوێکی رابردوو کە دەکەوێتە پێش ئەو خاڵە زەمەنییەی گێڕانەوەکە پێی گەیشتووە)[٥٣] لەم دەقەدا چەندین جار ئەم تەکنیکە بەکارهاتووە، لە بەر ئەوەی لە ناو دەقی گێڕانەوەییدا وا رێکدەکەوێ کە چەندین رووداو لەیەك کاتدا روودەدەن و گێڕەرەوە لە توانایدا نابێ لە یەك کاتدا بیانخاتە روو، بۆیە ئەو رووداو و بابەتانەی کە پێشتر ئاماژەی پێ نەکرابێ، دواتر بە هۆی تەکنیکی دواخراو دەیانخاتەوە بیر و پێش چاو. پاکیزە کاتێ باسی هەر کەسایەتییەك دەکا، رێڕەوی گێڕانەوە رادەگرێ و پێناسەیەکی دەکا بۆ ئەوەی بە خوێنەری بناسێنێ، بۆ نموونە کاتێ باسی یەکەم ماموستای دەکا لە حوجرە بەناوی (مەلا ئامینە) دەڵێ : ((... یەشتا نەچووبوومە مەکتەب بەڵام.. بۆ ماوەیەکی کەم چوومە حوجرە.. بۆ قورئان خوێندن.. ئەو رۆژانە حوجرە هەبوو کە کچ و کوڕ ئەچوون فێری قورئانیان دەکردن ! من بجی بردمیە حوجرەی مەلا ئامینە.. مەلا ئامینەش ئافرەتێکی کورد بوو.. چاوی کوێر بوو بوو بە ئاوڵە، دەموچاوی ئاوڵە لێی دابوو.. زۆر ناشیرن و ئێسك قورس بوو هەر لە یەکەم رۆژەوە حەزم لە چارەی نەکرد))[٥٤]. بەم جۆرە لە چەند شوێنێکی دیکەدا لەکاتی گێڕانەوەی ژیاننامەی خۆی دەوەستێ و وەسفی چەندین کەسایەتی و شوێن و رووداوی مێژوویی کە بەسەر گەلی کوردا هاتووە دەگێڕێتەوە و بە پێویستی دەزانێ خوێنەر ئاگاداری ئەم زانیارییانە بێ. لە شوێنێکی تردا

گێڕەرەوە زۆر بە ئاشکرایی کاتی ئێستای رادەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ رۆژانی پێشوو و باسی گوزیدەی خوشکی دەکا و دەڵێ : ((ئێستا من کە شەستساڵی تەواو بەسەر ئەو رۆژانەدا تێپەڕیوە یادی ئەو زستانە هاتەوە بیرم و گوزیدەی نازدار هاتەوە بەرچاوم. لەو ساتەدا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو لە سەر تەختە بچکۆلانەکەی هەڵووژەی پاك ئەکرد. ناو جەرگم ئاگری تێ بەربوو بەبێ ئاگا فرمێسکە گەرمەکانم هاتە خوارێ بە دەموچاوما قەڵەمەکەمی وەستان ! سوریێژە عزرائیلی دووەمی منالآن بوو لە کوردستاندا.. ساڵ نەبوو ماڵی منالێك دووانی نەقۆزێتەوە و جگەری دایك و باوکی نەسووتێنێ))[55]. لێرەدا خوێنەر هەست بە تێکەڵکردنی دوو کات دەکا (ئێستا و رابردوو)، مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە کە رووداوی رابردوو کاریگەری لەسەر ئێستای کردووە. ئەم نموونانە و لە چەندین نموونەی دیکەدا ئەم تەکنیکە بەروون و ئاشکرایی لە لایەن نووسەرەوە بەکار هاتوون و ئەرکەکانی خۆی بە جێ هێناوە.

ب- پێشخراو : ئەم تەکنیکە بریتییە لە (گێڕانەوەی، یان ورووژاندنی ئەو رووداوانەی کە جارێ روویان نەداوە یان پێشبینی رووداندنیان دەکرێ) [56]. لە دەقی (کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە)دا لەو کاتەی کوردەکانی سلێمانی راپەڕیون لەبەر دەرکی سەرا دژی ئینگلیز، رەفیق حلمی بەیانییەکەی دەچێتە دەرەوە و دواتر ئینگلیز پەلاماری کوردەکان دەدەن و ژمارەیەکیان دەکوژن و ئەوانی تر دەستگیر دەکرێن. لەو کاتەدا هەموو ئەندامانی خێزانەکە شپرزە دەبن و دایکی پاکیزە پێشبینی رووداوی خراپ و ناخۆش دەکا و دەڵێ: ((.. بەخوا تیا چوو.. ئیتر نایبینمەوە، لەو چاوەڕوانییەدا بوون بە بێ هیچ سۆراغێکی رەفیق تا نزیك عەسر خەبەر دەدەن کەوا گیراوە))[57]. هەروەها پاکیزە سەبارەت بە کردنەوەی بەشی کوردی چووەتە سەردانی لێپرسراوی کاروباری خوێندنی بالآ (د. عبداللە سلوم السامرائي) و یاداشتی پێشکەش کردووە، ئەویش وتوویەتی ئەو یاداشتە سیاسییە، پاکیزەش بوێرانە وەلآمی داوەتەوە کەوا دانپیانانێکە بە مافی رۆشنبیری و بوونی گەلی کورد، بەلآم لەو کاتەدا هەست بە تووڕەبوونی عبداللە سلوم دەکا و پێشبینی دەکا و دەڵێ : ((... کە سەیرم کرد ناوچەوانی گرژ کرد

هەندێك راوەستا، من لە دڵی خۆم وتم ئێستە یەكێك لە حەرەسەكان بانگ ئەكا بمگرێ و بمبەنە حەبسخانە و خوا ئەزانێ چیم لێ ئەكەن))[٥٨].

**٢– كات لە رووی خێرایی و سستییەوە :**

**أ– خێراكردنی كات :** یەكێكە لە تەكنیكە هونەرییەكانی جوولەی كات لە دەقی گێڕانەوەدا، بەواتای (رێژەی نێوان درێژی دەق و كاتی رووداو دێ) [٥٩]. ئەمەش لە رێگەی دوو تەكنیكەوە ئەنجام دەدرێ :

١– كورتكردنەوە : واتە (گێڕەرەوە هەڵدەستێ بە كورتكردنەوەی ئەو رووداوانەی لە چەند رۆژ یان مانگ یان ساڵێكدا روویانداوە و لە چەند كۆپلەیەك یان چەند لاپەڕەیەكی كەم، بە بێ چوونە ناو وردەكارییەكانی وتە و شتەكان دەخرێتە روو)[٦٠]. پاكیزە هەر لە لاپەڕەی یەكەمی ژیاننامەكەیدا، ژیانی خۆی لەسەر بنچینەی كات و شوێن دابەش كردووە بۆ چوار بەش، وە كاتێ سەیری بەشی چوارەم دەكەین، ماوەی (٤٢) ساڵی تەمەنی لە (٦٠) لاپەڕەدا گێڕاوەتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ بوون و بەكارهێنانی ئەم تەكنیكە، چونكە لەم تەكنیكەدا كاتێكی زۆر بە دەربڕینێكی كەم دەخرێتە روو. بۆ نموونە : ((...باوكت شێخ مەحمود ناردبووی بۆ ناو كوردەكانی ئێران و روسیا و توركیا ساڵ و نیوێكی پێ چوو، كە هاتەوە تۆ پێت گرتبوو)) [٦١]. یان ((... ساڵەكانی بەینی ١٩٣٠ – ١٩٤٠ زۆر گرنگ و پڕ بزووتنەوە بوو لە كوردستانی عیراقدا بە تایبەتی بۆ شاری سلێمانی و باوكم... كە لە بزووتنەوەی رۆژی رەشی شەشی ئەیلولەوە دەستی پێكرد))[٦٢].

**٢– لابردن :**

تەكنیكێكی ترە بۆ خێراكردنی كات لە گێڕانەوەی دەقدا بەكاردێ، كە بریتییە لەوەی (تەكنیكێكی كاتییە و هەڵدەستێ بە لابردنی ماوەیەكی درێژ یان كورت لە كاتی چیرۆكەكە، بێ ئەوەی بچێتە ناوەرۆك و باسی رووداوی رووداوەكان بكا)[٦٣]. ئەم تەكنیكەش دوو جۆری هەیە :

**أ- لابردنی راگەیەنراو :** لەم جۆرەدا گێڕەرەوە ماوە لابراوەکانمان بۆ دیاری دەکا و ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەو رووداوە لە ماوەی چەند رۆژ یان چەند مانگ و ساڵێك روویانداوە و ئەمەشیان دوو جۆرە :

١- لابردنی دیاریکراو : لەم جۆرەدا ماوە لابراوەکە زۆر بە وردی دەخرێتە روو. بۆ نموونە :

((... لە یەکەم هەفتەی ژیانیا لەبەرئەوە دەرزییان ئەکرد بە بەرۆکی کۆرپەکەدا شەوەی پێ بترسێنن... حەوت شەو و حەوت رۆژ بە دیاریا دائەنیشتن))[٦٤]. یان ((... شەش مانگ بەتەنها دانیشتم لەگەڵ ئەو رۆشنبیرانەی داواکران کۆئەبووینەوە و بەرنامەمان ئامادە کرد))[٦٥].

٢- لابردنی دیارینەکراو : لەم جۆرەدا ماوە لابراوەکە بە وردی سنووردار ناکرێ، بەڵکو بە شێوەیەکی نزیك لێیەوە دەتوانرێ دیاری بکرێ. بۆ نموونە :

((چەند مانگێك لەو خانووەداماینەوە تا تەعتیل تەواو بوو هاوین بوو))[٦٦].
یان ((... وەستا عەلیش یەکێ بوو لەو تابلۆ پڕ رەنگ و ئاوازانەی ئەو رۆژانەم کە دیمەنە رەنگینەکەی ساڵانی منداڵیم پڕ ئەکاتەوە لە سلێمانیدا))[٦٧].

لابردنی رانەگەیەنراو : یەکێکە لە تەکنیکەکانی لابردن و پێچەوانەی لابردنی راگەیەنراوە، لەبەر ئەوەی لەم تەکنیکەدا (گێڕەرەوە ماوە لابراوەکە ئاشکرا ناکات، بەڵکو خوێنەر لە رێگەی وردبینی و تێبینیکردن و بەستنەوەی رووداوەکانی پێشتر و دواتر بەیەکەوە درکیان پێ دەکا) [٦٨]. لە دەقی (کوردو ژیانێکی پڕ ئەندێشە)، ئەم تەکنیکە هەستی پێ دەکرێ. هەروەك دەڵێ : ((باوکم لە کەرکوك کرا بە موعەلم ئەو کەرکوکەی کە ئەوسا شارێکی کورد بوو، قوتابییەکانی هەموو کورد بوون، خەڵکەکەشی هەمو کوردن، تەنها ژمارەیەکی کەم تورکمان و فەلە کە لە قەڵا دائەنیشتن. لەوێ دەستی کرد بە پەروەردەی قوتابییەکانی و بزواندنی هەستی کوردایەتی))[٦٩]. گێڕەرەوە لێرەدا مەبەستی ئەو ساڵە بوو کە باوکی لە کەرکوك بووەتە مامۆستا، بەڵام ئاشکرای نەکردووە تەنها کە دەڵێ (ئەوسا) واتە خوێنەر دەزانێ باس لە رابردوو دەکا.

**ب– کات لەرووی سستییەوە :**

ئەم تەکنیکە بە پێچەوانەی تەکنیکی خێراکردنی کاتە، تیایدا نووسەر هەڵدەستێ بە سستکردنەوە یان وەستانی کاتی گێڕانەوەی دەق، ئەمەش لە رێگەی دوو تەکنیکەوە ئەنجام دەدرێ :

**١– دیمەن :** کە بریتییە لەو (تەکنیکەی کە گێڕەرەوە تیایدا هەڵدەستێ بە هەڵبژاردنی هەڵوێستە گرنگەکانی ناو رووداوەکان و بە شێوەی نمایشێکی شانۆیی چڕی تەواو و راستەوخۆ پیشانی دەدات) [٧٠]. ئەم تەکنیکە لە دەقی ژیاننامەی پاکیزەدا لە سێ شێوەدا خراوەتە روو :

أ– دیالۆگی راستەوخۆ : مەبەست لەم جۆرە دیالۆگە (گفتوگۆیەکە لە نێوان دوو کەس یان زیاتر لە چوارچێوەی دیمەنێکی ناو کارە چیرۆکییەکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئەنجام درێ) [٧١]. بۆنموونە دیالۆگی نێوان پاکیزە و دایکی، ئەو رۆژەی بۆ دەگێڕێتەوە کە پاکیزە لەدایك بووە و باسی ناخۆشی ئەو کاتە دەکاو پاکیزەش هەموو شەو داوای لێ دەکا بۆ ئەوەی بۆی بگێڕێتەوە و بەم شێوەیە :

– پاکیزە : دایە بۆم بگێڕەوە لە سەرەوە چۆن لە ئەشکەوتی سووورداش لە دایك بووم ؟ دوێنێ خەوم لێ کەوت گوێم لێ نەبوو.

– دایکی : رۆڵە ئەزانی چیمان بەسەر هات، باوکت رۆیشتبوو بێ سەر و شوێن.. تۆ دوو مانگ بووی لە سکما بێ پوول و پارە بە جێی هێشتین، شێخ مەحمود رەوانەی کرد بۆ تورکیا بۆ لای مستەفا کەمال.. تا تۆ بووی بە ساڵە وەخت و پێت گرت نەهاتەوە..

پاکیزە : دایە گیان، توخوا باسی بکە... بۆم

– دایکی : راوەستە رۆڵە با وردە وردە بێتەوە بیرم دەردم زۆر لە دڵدایە !

– پاکیزە : دەی دایکە، دایکەش چاوەکانی پڕ ئەبوو لە فرمێسك و تك تك بە دەم و چاویا ئەهاتە خوارێ.

– دایکی : رۆڵە کە باوکت هاتەوە... دڵمان خۆش بوو... وامان زانی مردبوو زیندوو بۆوە.. [٧٢].

ب– دیالۆگی ناڕاستەوخۆ : لەم جۆرەدا گێڕەرەوە گفتوگۆی نێوان کەسایەتییەکان دەگێڕێتەوە و خۆی بەشداری تیا ناکا، بەلام کەسێکە ئاگاداری هەموو شتێکە و دەتوانێ بچێتە ناخی کەسایەتییەکانی تر و هەڵوێست و بیر و ڕا و هەستەکانیان بخاتە ڕوو. بۆ نموونە پاکیزە دیالۆگی نێوان خاڵی و دایکی و پووری بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە :

– خاڵە ئاوڕەحمان وتی : جەمیلە مزگێنیم بەرێ ڕەفیق بەربوو

– دایکم (جەمیلە) : زۆر نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو.. بە شێنەیی وتی توخوا (ئۆخەی)

– بجێ (پوورم) وتی : توخوا کاکم بەربوو کەی و کوا بۆ نەهات لە کوێیە.

– خاڵە ئاوڕەحمان وتی : لە ماڵی خۆمانە[٧٣]

ج– مۆنۆلۆگ : گێڕانەوەیەکی خودییە و کەسایەتییەکە لە بارەی خۆیەوە دەدوێ بەبێ بەشداربوونی کەسێکی تر. بۆ نموونە پاکیزە دەڵێ : ((... تەنها من بووم لەو پۆلە کچەی لەگەڵما بوون لە خوێندنی سەرەتاییدا.. گەیشتمە پلەی هەرە باڵای خوێندن و لە سێ زانستگای زۆر بەناوبانگی جیهانیدا خوێندم و دکتۆرام وەرگرت و گەیشتمە پلەی پرۆفیسۆر کە بە خەویش بە خەیاڵی هاوڕێکانیشمدا نە هاتووە...)) [٧٤].

٣–وەسف : مەبەست لە وەسف (تەکنیکێکی کاتییە و کار لەسەر وەستاندن یان سستکردنەوەی جوولەی گێڕانەوە و بەرەو پێشەوە دەکا بە مەبەستی پێشکەشکردنی دیمەنێك بە نیازی ڕامان یان شتێکی تر) [٧٥]. لە دەقی ژیاننامەی پاکیزەدا ئەم جۆرە وەسفانە بەرچاو دەکەون :

أ– وەسفی شوێن : لەم جۆرەدا گێڕەرەوە هەڵدەستێ بە وەسفکردنی شوێنێك و لە جوولەی کاتی گێڕانەوەکە دادەبڕێ. پاکیزە کاتێ وەسفی سووورداشمان بۆ دەکا وەك نیگارکێشێك وایە کە تابلۆیەکی ڕەنگینمان بۆ بکێشێ، و بە شێوەیەکی زۆر جوان و ئەدەبیانە و لە چەند شوێنێکدا وەسفی دەکا و دەڵێ : ((سووورداش دێیەکی بچووك بوو، ئەوسا بەقەد شاخەکەوە لە پەنای شاخێکی بەرزدا خۆی شاردبۆوە، زۆر خۆش بوو... یەکەم جار بوو ئێمە بچینە

سووورداش... خانووەکانی بە ریز لە قەد شاخەکە دروست کراون، یەك لە سەر یەك سەربانی چینێکیان حەوشەی چینێکی ترە ئەتوت شارێکی بەهەشتە لام و هاتۆتە سەر دونیا، قەد شاخەکە لە هەر چوار لای خانووەکانەوە هەمووی رەزی ترێ و میوە بوو... من ئەوەندە ئەو دیمەنە جوانەم حەز لێ کرد ئێستەش لە بیرم ناچێتەوە و بە حەسرەتی ئەو رۆژانەم کە لەو جەنەتەدا رام بوارد)) [٧٦].

ب– وەسفی کەسایەتی : لە وەسفی کەسایەتییەکاندا هەندێ جار گێڕەرەوە پێش ئەوەی کەسێتییەکی نوێ بێنێتە ناو دەقەکە، رێڕەوی گێڕانەوەکە رادەگرێ و وەسفێکی کورتی یان درێژی بۆ دەکا، یاخود لە دوای هاتنە ناو دەقدا یان رێگە بە کەسایەتییەکان دەدا خۆیان لە رێگەی کردەوەو هەڵوێست و دیالۆگەوە خۆیان بناسێنن. بۆ نموونە پاکیزە کاتێ وەسفی گوزیدەی خوشکی دەکا و دەڵێ : ((...گوزیدەش کە پێی نابووە چوارساڵی یەشتا هەر پێی نەگرتبوو... بەلام زۆر جوان بوو، قژە زەردەکەی وەك تەلیسمی ئاڵتون درێژ هاتبووە خوارێ بە سەریا خاو ئەبریسکایەوە چاوەکانی کاڵ.. دەم و لووتی ورد و پێستەکەی سپی و ناسك ئەتوت بێچووە پەرییە..........)) [٧٧].

ج– وەسفی خواردن : گێڕەرەوە باسی ئەو خواردنانە دەکا کە تایبەتن بە نەتەوەی کورد. پاکیزەش زۆر شوێن گەڕاوە بەلام هیچ جێگایەك وەك کورد بایەخ بە خواردن نادەن و لە هی زۆر شوێن بەتامترە. پاکیزە لە دەقی ژیاننامەکەیدا وەسفی خواردنە کوردییەکان دەکات و دەڵێ : ((... کفتە کە لە وردە برنج ئەکرێ کە لەگەڵ گۆشتی سووری بێ چەوری برنجەکە ئەکوترێ یا ئەشێلرێ جوان تا پیز ئەداتەوە، ئینجا قیمە و پیاز و کەرەوز و کاکڵە گوێزی بۆ سوور ئەکرێتەوە لەگەڵ دارچین و مێخەك و زیرەی کوتراو و برنج شێلراوەکە خڕ هەڵ ئەدرێ و لە ناوەڕاستا چاڵ ئەکرێ و پڕ ئەکرێ لەو قیمە بۆن خۆشە... شۆربایەکەش پیازی بۆ سوور ئەکرێتەوە و لە پێشدا هەندێ نۆکی خڕی بۆ ئەکوڵێ لەگەڵ هەندێ برنج و ئێسقانی قاورمە تێی ئەکرێ لەگەڵ زەردەچەوەو ئالەت لەسەر ئاگر دائەنرێ تا ئەکوڵێ، ئینجا کفتەکەی تێ ئەخرێ ئەویش ئەکوڵێ تا سەرئەکەوێ و دائەگیرێ و تێ ئەکرێ...)) [٧٨].

**شوێن :**

لەهەر دەقێکی گێڕانەوەییدا، ئەگەر کەسی سەرەکی بتوانێ لـە کـاتێکی دیاریکراودا رووداو دروست بکـا و جوولـە بخاتـە نـاو دەقەکـە، ئـەوا پێویـستی بـە گۆڕەپانێك دەبێ تا ئەم کارەی تیادا ئەنجام دا، کە ئەویش شـوێنە، وەکـو یـەکێك لـە رەگـەزە سـەرەکییەکانی دەقـی ژیاننامـەی خـودی پەیوەندییـەکی پتـەوی بـە رەگەزەکانی دیکەی دەقەکەوە هەیە و لێك جیا ناکرێنەوە و یەکتر تـەواو دەکـەن. بۆیـە نووسـەری ژیاننامـە پێویـستە ئـەو شـوێنانە هەڵبـژێرێ کـە تیـای ژیـاوە و بینیویـەتی و لەوانەیـە پەیوەندییـەکی گیـانی لەگەڵـدا دروسـتکردبێ. پـاکیزەش گرنگییەکی زۆری بە شوێن داوە، هەر لە لاپەڕەی یەکەمدا، ساڵانی تەمـەنی خـۆی هەر لەو کاتەی لەدایك بووە تا ئەو کاتەی لە نووسینی ژیاننامەکەی بووەتـەوە لـە سەر بنەمای کات و شوێن بۆ چوار قۆنـاغ دابـەش کـردووە، وەك دیـارە شـوێنێکی زۆر گـەڕاوە لـە نـاوەوە و دەرەوەی عـیراق. سـەرەتا بـەهۆی ئـەوەی کـە بـاوکی مامۆستا بووە و لە هەمان کاتدا وەکو کوردێك هەردەم لە هەوڵی خەباتی سیاسیدا بووە و حکومەت و ناحەزانی نەیان هێشتووە بۆ ماوەی ساڵێك لـە هـیچ شـوێنێکدا بمێنێتەوە. دواتریش بەهۆی خوێندن و تەواوکردنی پلە بەرزەکانی خوێندن چـوّتە شارەکانی دیکە و ولاّتانی دەرەوەی عیراق. بـەو شـێوەیەی خـوارەوە جۆرەکـانی شوێن لە دەقەکەی پاکیزەدا بە نموونە دەخەینە روو :

شوێنی نیشتەجێبوون : ئەویش دەبێتە دوو لق :

**١- شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی :** شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیـشەیی لای پاکیزە شـاری سـلێمانی بـووە، کـە سـەرەتای تەمـەنی لـەوێ ژیـاوە و تیایـدا هەستی بـە ئـارامی و دڵخۆشـی کـردووە و کاریگـەری لەسـەر دڵ و دەروونـی جـێ هێشتووە. لەوێ چەند خانوویەکیان بە کرێ گرتووە و تیایدا ژیاون، بەلاّم لە ساڵی (١٩٣٦)دا دایکی بیر لە خانوو کڕین دەکاتەوە و بۆ ئەم مەبەسـتە خـشڵی خـۆی و پاکیزە و بجێ دەفرۆشێ و کەرەستەی دروستکردنی خـانووی پـێ دەکـرێ و دوای گەڕانەوەی رەفیق حلمی لە پشووی هاوینەدا دەست دەکا بە خانوو دروسـتکردن. گێڕەرەوە بەم شێوەیە وەسفی خانووەکەیان دەکا : ((... خانووەکە بە گـوێرەی ئەو رۆژانە زۆر خۆش بوو.. دوو بەر بوو، بەری سەرەوەی کە بە دوو قاڵدرمە بـۆی

سەرئەکەوتین، هەیوانێکی گەورە بوو بەرامبەر گوێژە و گڵە زەردە، لە هەیوانەکەوە دوو ژووری گەورەی خۆش و فەراح، یەکی پەنجەرەیەکی گەورەی بەرزی تیا بوو لە سەر هەیوانەکە... یەکێکیان کەلەگی بوو... لەسەر جادەکە بوو، کە ئەچووین بۆ مەیدان و بەردەرکی سەرا دوو پەنجەرەش لە سەر جادەکە بۆ ژوورەکەی تر پشتەیوان بوو.. ژوورێکی تری گەورە هەبوو ناوی عروسی بوو... پێشەکەی کە لەسەر هەیوانەکە بوو هەمووی جامخانە بوو.. ئەو ژوورە لە پشتەوە ژوورێکی زۆر بچووکی لە سەر بوو من کردم بە ژووری خۆم.. لە بەری خوارەوەش لای دەرگا و دالآنەکەوە... ژوورێکی گەورەی کرد بۆ دیوەخان لە تەنیشتییەوە ژوورێکی بچووکی کرد بۆ نان خواردن، لەو بەریشەوە سەر تەنوور و چێشتخانە و حەمام و ئاودەس.. ئەو پایزەی گواستمانەوە دایکم دڵی فەرامۆش بوو))[٧٩].

پاکیزە لە چەند شوێنێکی دەقەکەیدا باسی کوردستان دەکات و بە بەهەشتی سەر زەمینی دەچوێنێ و وەسفێکی ئەدەبییانەی جوان و قەشەنگی کردووە و دەڵێ : ((... بە شاخ و داخ و دارستان و هەرد و دۆڵەکانیەوە بە تاڤگە و رووبارە دێرین و کانی و ئاوە بلوورییەکانیەوە بە بەفر و باران و شەستە رەهێڵەی زستانی و بەهارانیەوە. بە رەشەبا و خاك و خۆڵە پیرۆزەکەیەوە کە پڕە لە گەوهەر و زێڕی بەپیت و بەرەکەت و مەڕ و ماڵاتیەوە بە جل و بەرگی رازاوە نازی ئافرەتی ناسك و نازداریەوە، بە قەد و باڵای گەنج و لاوە شۆخەکانی پاڵەوانی شاخانیەوە. بە هەموو دەنکە لمێك، بە هەموو گەلآ دارێك، بە هەموو گوڵ و گوڵزارێك بە هەموو کەو و قومری و مار و مێرووییەك، بە هەموو گیان لەبەرێکەوە، بە هەموو لووتکە شاخێك و دەشت و دۆڵێکەوە خۆشەویستە و نازدارە، کە وێنەی ئەو بەهەشتەی سەر زەمینەم نەدیوەتەوە تا ئێستا لەگەڵ ئەوەی کە زۆر گەڕاوم و شوێنی خۆشم دیوە و وێنەی کوردستانم نەدیوە)) [٨٠].

**٢- شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی :** لە دەقی ژیاننامەی پاکیزەدا هەندێ شوێن هەن کە بە شێوەیەکی کاتی و بۆ ماوەیەکی کورت تیای ژیاوە، لە هەندێکیشیان ماوەیەکی زیاتر ماوەتەوە، بەلآم هەستی بە ئارامی و هۆگری نەکردووە لەو شوێنانەدا، و هەر بە هیوای گەڕانەوە بووە بۆ زێدی خۆی. لە

شارەکانی ناوەوەی عیراق، شارەکانی وەك (عمارە، کەرکوك، موسڵ، هەولێر، بەعقوبە، بەغدا)ی دیوە. بۆنموونە لە ساڵی (١٩٢٦)دا باوکی لەبەر بیر و باوەڕی کوردایەتی بۆ ماوەی ساڵێك بۆ (عمارە) نەفی کراوە و هەموو ئەندامانی خێزانی بردۆتە ئەوێ، کە بەلایانەوە شوێنێکی زۆر ناخۆش بووە و دەڵێ : ((... دایکم و بجێ لە عمارە فێری جگەرە کێشان بوون... خەم و خەفەتی خۆیان پێ سارێژ دەکرد لە دووری وڵات و کار و تەنیایی و ئاوارەیی و دڵی بریندارو پڕ لە ئازار، باوکیشم پەست و بێ ئارام و نائومێد...))[٨١]. هەروەها لە شارەکانی دەرەوەی عیراقیش پاکیزە لەبەر حەز و ئارەزووی تەواوکردنی خوێندنی باڵا و نەبوونی کۆلێژ و کادری پێویست لە ناوەوەی وڵاتدا، ناچار رووی لە وڵاتانی دەرەوە کردووە، وەك (ئەمریکا، بەریتانیا، میسر). لەکاتی سەفەری بۆ ئەم وڵاتانە لە رێگادا بە چەند وڵاتێکی تردا تێپەڕیوە و بۆ ماوەیەکی کاتی لە ئوتێل دابەزیوە و چەند رۆژێك ماوەتەوە، وەك (ئیتالیا، ئیسپانیا، پورتوگال). هەروەکو بەم شێوەیە باسی گەشتەکەی دەکا و دەڵێ : ((لە دوای بەرشەلۆنە چووین بۆ جبل تارق و لەوێ پەڕینەوە چوینە محیتی ئەتڵەسی کە ئەوێشم نەدیبوو و لە وێدا بە راستی زەندەقم چوو، قووڵ و بێ بن لە قووڵیدا، ئاوەکەی ئێواران رەش دائەگەڕێ و پاپۆڕەکە وەك پەپوولە بە سەریەوە، ئەوی لە هەمووی سەیرترە ئەوەیە محیتی بێ سنوور و بێ بن پڕە لە (حووت) کە ئەویش شتێکی عەجایبە... لە سەرەتادا زۆر لێی دەترسام بەلاَم لە دواییدا کە لە رەوشتی هێمنی و بێ زیانی گەیشتم حەزم ئەکرد سەیری بکەم))[٨٢]. هەندێ جاریش پاکیزە بە ناچاری و لەبەر نالەباری و نەبوونی ئاساییش لە وڵات و نە سووڕانی گوزەرانی ژیان لەلایەنی ئابوورییەوە، چۆتە دەرەوەی وڵات هەروەکو خۆی دەڵێ : ((من لە هاوینی ١٩٣٦ دا کە میهرای کچم شەش مانگ بوو بە ناچاری چوومەوە لەندەن... لەبەر حاڵ و ئەحواڵی نالەباری لە عیراقدا و مەترسییەکی زۆر کە هیچ ئەمن و ئاساییش نەمابوو لە عیراقدا و لەبەر دەس کورتی خۆم کە معاشەکەم هیچ بەشی نە ئەکردم و ناچار ئەبووم پەنا بەرمە بەر دایکم بۆ یارمەتی...))[٨٣]. جگە لەم وڵاتانە پاکیزە لە (ئەلمانیا و ئوردن) ژیاوە، وەکو مامۆستای میوان وانەی زمانەوانی لە چەند زانستگا وتۆتەوە. هەروەکو خۆی دەڵێ : ((... سەرەڕای ئەوە قوماربازی

ماموّستاکانی من دامەزراندن لە بەشی کوردیدا و نالەباری حـالّ و ئـەحوالّی کـوّڕی زانیاری و بە شێوەیەکی گشتی حالّی کورد بێزاری کردبووم و ئەمویست لە هـەموو عیراق راکەم و سەرم رەحەت کەم. دوای سالّێك تەفەرغی علمیم کرد و کاغـەزم بـوّ دکتـوّر عبـدالعزیز الـدوری نووسـی کـە ئەوسـا لـە عـەمان لـە زانـستگای ئـەردەنی ماموّستای مێژووی ئیسلام بوو... داوای کرد بچم بوّ عەمان بە ماموّستای میـوان و زمانەوانی بلّێمەوە...)) [٨٤].

## ئەنجام

لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەماندا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە :

١- ژیاننامەی خودی لە ئەدەبی کوردیدا، تا رادەیەك بە درەنگی وەکو ژانرێکی ئەدەبی ناسراوە و زیاتر باسی لایەنی رامیاری تێدایە، نەك لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی، چونکە کۆمەڵگای کوردی سروشتێکی خێڵەکی هەبووە و سانسۆر و دابونەریتی کۆمەڵگاکە رێگەی لە نووسەران گرتووە گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن، کە زیاتر رووداوە مێژووییەکانیان تۆمار کردووە و لایەنی نەتەوەیی بە سەریاندا زاڵە.

٢- هونەری ژیاننامەی خودی خاوەن تایبەتمەندی و پرەنسیپی خۆیەتی و لە جۆرەکانی تری ئەدەبی جیای دەکاتەوە، بەڵام ناتوانرێ بە شێوەیەکی زۆر ورد دەستنیشان بکرێن، چونکە هونەرێکی خودییە و پەیوەندی بەخود و ناخی مرۆڤەوە هەیە و هەر نووسەرێك بە شێوازی تایبەتی خۆی، چیرۆکی ژیانی رابردووی دەگێڕێتەوە.

٣- تا ئێستا پاکیزە رەفیق حلمی یەکەم ئافرەتی کوردە ژیاننامەی خۆی نووسیوەتەوە.

٤- لە ژیاننامەکەدا تێکەڵکردنی رووداوی مێژوویی بە رووداوی تایبەتی ژیان هەستی پێ دەکرێت.

٥- دەقــی ژیاننامەکــە چــڕوپڕە، بــەڵام کــەمتر شــێوازی ئەدەبییانــەی وەرگرتووە.

٦- پاکیزە لە نووسینەوەی ژیاننامەی خۆیدا کۆمەڵێ لایەنی شاراوە و نهێنی خودی تایبەتی خۆی بە شێوەیەکی بوێرانە دەربڕیوە.

## بیبلۆگرافیای سەرچاوەکان

**أ– سەرچاوە کوردییەکان :**

**١– کتێبەکان :**

١– پاکیزە رەفیق حلمی (د)، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە، چ ١، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٠.

٢– کۆمەڵێك نووسەری بیانی، تیۆری رۆمان، وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد کەریم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٣– مارف خەزنەدار (د)، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب ١، چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

**٢– گۆڤارەکان :**

٤– عبداللە سەراج، بەرەو ئاستانەی رۆمانی نوێ، گ (رامان)، ژ (٥٤)، ٢٠٠٠/١٢/٥.

٥– موحسین ئەحمەد عومەر، ئەدەب و بایۆگرافی، گ (رامان)، ژ (١١٢)، ٢٠٠٦/٩/٥.

**٣– فەرهەنگ :**

٦– رزگار کەریم، فەرهەنگی دەریا (عەرەبی – کوردی)، بەشی یەکەم لە سەرەتای (هەمزە) وە تا کۆتایی (غەین)، چ ٢، چاپخانەی مەهارەت، ٢٠٠٧.

**٤– چاوپێکەوتن :**

٧– چاوپێکەوتن لەگەڵ خاتوو یەسنا شێرکۆ عمر، کچی نەجاتی خوشکی پاکیزە رەفیق حلمی، لە رێکەوتی ٢٠١٠/٢/١٢.

**ب– سەرچاوە عەرەبییەکان :**

**١– کتێبەکان :**

٨– انیس المقدسی، الفنون الادبیة وأعلامها في النهضة العربیة الحدیثة، ط ١، دار العلم للملایین، بیروت، ١٩٧٨

٩– تهانی عبدالفتاح شاکر، السیرة الذاتیة في الادب العربي، فدوى طوقان و جبرا ابراهیم جبرا و احسان عباس نموذجا، ط ١، بیروت، ٢٠٠٢.

١٠ – حسن بحراوي، بنية الشكل الروائي، ط ١، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٠.
١١– خليل شكرى هياس، سيرة جبرا الذاتية في البئر الاولى وشارع الاميرات، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق، ٢٠٠١.
١٢– سيزا قاسم (د)، بناء الرواية، دراسة مقارنة في ثلاثية نجيب محفوظ، ط ١، دار التنوير للطباعة والنشر بيروت، لبنان، ١٩٨٥.
١٣– شكرى المبخوت، سيرة الغائب – السيرة الاتي : السيرة الذاتية في كتاب الايام لطه حسين، ط ١، دار الجنوب للنشر، تونس، ١٩٩٢.
١٤– عبدالعزيز شرف، أدب السيرة الذاتية، ط ١، مكتبة لبنان، الشركة المصرية العالمية للنشر، لونجمان، ١٩٩٢.
١٥– عبدالله ابراهيم العلاوي، بناء الفني في رواية الحرب العربية في العراق، ط ١، وزارة الثقافة والاعلام، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، ١٩٨٨.
١٦– عبدالملك مرتاض، في نظرية الرواية (بحث في تقنيات السرد)، سلسلة عالم المعرفة (٢٤٠)، الكويت، ١٩٩٨
١٧– عزالدين اسماعيل، الادب وفنونه، دراسة ونقد، ط ٦، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٧٦.
١٨– فليب لوجون، السيرة الذاتية – الميثاق وتأريخ الادب، ت– عمر حلى، المركز الثقافي العربي، ط ١، بيروت، لبنان، ١٩٩٤.
١٩– محمد حسن عبدالله، فنون الادب (اصول، نصوص، قراءات)، دار الكتب الثقافية، الكويت، ١٩٧٨.
٢٠– محمود عبدالغني، فن الذات – دراسة في السيرة الذاتية لابن خلدون، ط ١، مجلس الاعلى للثقافة، القاهرة ٢٠٠٨.
٢١– مؤيد عبدالستار، السيرة الذاتية، ط ١، دار المنفى، لبنان، بيروت، ١٩٩٦.
٢٢– ميرى ورنوك، الذاكرة في فلسفة الادب، ت– فلاح رحيم، ط ١، دار الكتاب الجديد المتحدة، بيروت، لبنان، ٢٠٠٧
٢٣– ناصر الحاني (د)، المصطلح في الادب الغربي، منشورات المكتبة العصرية، بيروت، ١٩٦٨.

**٢– گۆڤارەكان :**

٢٤– فاروق خورشيد، اضواء على السيرة الشعبية، مج– التراث الشعبي، ع– ٥، ٦، دار الحرية للطباعة، بغداد، مجلة شهرية يصدرها المركز الفولكلوري في وزارة الاعلام، ١٩٧٦.

٢٥– محمد راتب الحلاق، الترجمة الذاتية محاولة في مقاربة المصطلح، مج– الموقف الادبي، مجلة ادبية شهرية تصدر عن اتحاد الكتاب العرب بدمشق، ع – ٣٤٢، تشرين الاول ١٩٩٩

**٣– نامەی ماستەر و دكتۆرا :**

٢٦– جنان عبدالله يونس الزبيدي، الفنون النثرية في كتاب ابن الجوزي (صيد الخاطر)، دراسة تحليلية، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٥.

**٤– فەرهەنگ :**

٢٧– جبور عبدالنور، المعجم الادبي، ط ١، بيروت، ١٩٧٩.

٢٨– لويس معلوف، المنجد في اللغة والاعلام، دار الشرق، بيروت، ١٩٨٦.

٢٩– مجدي وهبه وكامل المهندس، معجم المصطلحات العربية في اللغة والادب، ط ٢، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٨٤

**٥– ئينتەرنێت :**

٣٠– السيرة الذاتية والخوف من المستور، وكالة الصحافة العربية.
www.Addustou .com.

**٤– سەرچاوە ئينگليزييەكان :**

٣١- J.A. Cuddon , Dictionary of Literary Terms & Literary Theory , fourth edition , Penguin Books, England, ١٩٩٩

## پەراوێزەکان


(١)– لويس معلوف ، المنجد في اللغة و الاعلام ، دار الشرق ، بيروت ، ١٩٨٦ ، ص ٣٦٨

(٢)– رزگار کەریم ، فەرهەنگی دەریا ( عەرەبی– کوردی ) ، بەشی یەکەم لە سەرەتای (هەمزە) وە تا کۆتایی ( غەین ) ، چ ٢ ، چاپخانەی مەهارەت ، ٢٠٠٧، ل٤٦٣

(٣)– ناصر الحاني ، المصطلح في الادب الغربي ، منشورات مكتبة العصرية ، بيروت ، ١٩٦٨ ، ص ٧٦

(٤) – عبدالعزيز شرف ،ادب السيرة الذاتية،ط١،مكتبة لبنان، الشركة المصرية العالمية للنشر،لونجمان ١٩٩٢، ص٣٠.

(٥) . www. Alawsat. Com – سلطان سعد القحطانى، بين الرواية والسيرة الذاتية (انترنيت)

(٦)– مؤيد عبدالستار ، السيرة الذاتية ، ط١ ، دار المنفى ، لبنان ، بيروت ، ١٩٩٦ ، ص ١٣

(٧)– انيس المقدسي ، الفنون الادبية واعلامها فى النهضة العربية الحديثة ، ط٢ ، دار العلم للملايين ، بيروت ، ١٩٧٨ ، ص ٥٤٧

(٨) - مجدى وهبة وكامل المهندس ، معجم المصطلحات العربية فى اللغة والادب ، ط ٢، مكتبة لبنان ، بيروت ، ١٩٨٤، ص١١٥

(٩)– انيس المقدسي ، الفنون الادبية واعلامها في النهضة العربية الحديثة ، ص ٥٤٧

(١٠) – عبدالعزيز شرف ، ادب والسيرة الذاتية ، ص ٣

(١١) – فاروق خورشيد ، اضواء على السيرة الشعبية ، مج ( التراث الشعبي ) ، ع ٥–٦ ، دار الحرية للطباعة ، بغداد ، ١٩٧٦ ، ص ١٩٥

(١٢)– مؤيد عبدالستار ، السيرة الذاتية ، ص ٢٩.

(١٣) – شكرى المبخوت ، سيرة الغائب ، سيرة الاتى : السيرة الذاتية في كتاب الايام لطه حسين، ط١ ، دار الجنوب للنشر ، تونس ، ١٩٩٢ ، ص ١٠

(١٤)– تهانى عبدالفتاح شاكر ، السيرة الذاتية في الادب العربي ، فدوى طوقان و جبرا ابراهيم جبرا و احسان عبدالقدوس نموذجا، ط١ ، بيروت ، ٢٠٠٢ ، ص ٩

(١٥)-J . A . Cuddon , Dictionary of Literary terms & Literary theory , fourth edition , Penguim Books , England , ١٩٩٩ , P٦٣ -

(١٦)– عبدالعزيز الشرف ، ادب السيرة الذاتية ، ص ٢٧

(١٧)– محمد عبدالغنى حسن ، التراجم والسير ، ط٣ ، دار المعارف ، القاهرة ، ١٩٨٠ ، ص٢٣

(١٨) – جبور عبدالنور ، المعجم الادبى ، ط ١ ، بيروت ، ١٩٧٩ ، ص ١٤٣

(١٩) محمد راتب الحلاق ، ( الترجمة الذاتية محاولة في مقاربة المصطلح ) مج (الموقف الادبى )، دمشق ، ع (٣٤٢) ،ت١ ، ١٩٩٩ www. awu _ dam . org

(٢٠) – فليب لوجون ، السيرة الذاتية ، الميثاق والتاريخ الادبي ، ت– عمر حلي ، المركز الثقافي العربي ، ط ١ ، بيروت ، لبنان ، ١٩٩٤ ، ص ٢٢

(٢١)– مارف خەزنەدار ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، ب ١ ، چ ١ ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ٢٠٠١ ، ل ١٨٦

(٢٢) – موحسین ئەحمەد عومەر ، ئەدەب و بایۆگرافی ، گ ( رامان ) ، ژ– ١١٢ ، ٥/ ٩ / ٢٠٠٦، ل ١١١

(٢٣)– چاوپێکەوتن لەگەڵ خاتو یەسنا شێرکۆ عمر کچی نەجاتی خوشکی پاکیزە رەفیق حیلمی ، لە رێکەوتی ١٢/ ٢/ ٢٠١٠ .

هەروەها بە سوود وەرگرتن لە ، شوکریە رەسول ، یادی ئازیزان ، چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ ، هەولێر ، ٢٠٠٩ ، ل ٢٤

(٢٤)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، چ ١ ، چاپخانەی رۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠٠٠ ، ل ٢٢

(٢٥)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣

(٢٦)– عبدالله ابراهيم العلاوي ، البناء الفني في رواية الحرب العربية في العراق ، ط١ ، وزارة الثقافة والاعلام ، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص١٦٨

(٢٧)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٨

(٢٨)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٥

(٢٩)– جنان عبدالله يونس الزبيدي ، الفنون النثرية في كتاب ابن الجوزي ( صيد خاط) ، دراسة تحليلية ، رسالة ماجستير، كلية الاداب ، جامعة الموصل ،٢٠٠٥ ، ص٧٢

(٣٠)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کوردو ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ١٥

(٣١)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥

(٣٢)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤٣

(٣٣)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠

(٣٤)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨

(٣٥)- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦١

(٣٦) – سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤٤

(٣٧)– میری ورنوك ، الذاكرة في الفلسفة والادب ، ت: فلاح رحيم ، ط١ ، دار الكتاب الجديد ، المتحدة ، بيروت ، لبنان ، ٢٠٠٧ ، ص ١٩٤– ١٩٥

(٣٨)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٤٢

(٣٩)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨٨

(٤٠)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٥–٦٦

(٤١)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦

(٤٢) – سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٢
(٤٣)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨
(٤٤)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٤– ٧٥
(٤٥)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٩
(٤٦)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٥
(٤٧)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧
(٤٨)– سيزا قاسم (د) ، بناء الرواية ، دراسة مقارنة في ثلاثية نجيب محفوظ ، ط ١ ، دار التنوير للطباعة و النشر ، بيروت، لبنان ، ١٩٨٥ ، ص ٣٤
(٤٩)– عبدالله سەراج ، بەرەو ئاستانەی رۆمانی نوێ ، گ ( رامان ) ، ژ– ٥٤ ، ١٢/٥ / ٢٠٠٠، ل ٢٣
(٥٠)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٢٧، ٣١ ، ١٨١ ، ٢٤٦
(٥١)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣ ، ٧٤
(٥٢)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٠ ، ١١٨
(٥٣)– کۆمەڵێك نووسەری بیانی ، تیۆری رۆمان ، وەرگێڕانی فارسی (حسن پاینده)– وەرگێڕانی کوردی (محەمەد کەریم) ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٣، ل٢٨ .
(٥٤)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ١٧
(٥٥)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٥
(٥٦)– حسن بحراوي ، بنية الشكل الروائي ، ط ١ ، المركز الثقافي العربي ، بيروت ، ١٩٩٠ ، ص ١٣٢
(٥٧)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٣٠– ٣١
(٥٨)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٤٥
(٥٩)– سيزا قاسم (د) ، بناء الرواية ، دراسة مقارنة في ثلاثية نجيب محفوظ ، ط١ ، دار التنوير للطباعة والنشر ، بيروت ، لبنان ، ١٩٨٥ ، ص٧٣
(٦٠)– امنة يوسف ، تقنيات السرد ، فى النظرية والتطبيق ، ط ١ ، دار الحوار للنشر والتوزيع، سورية ، ١٩٧٧ ، ص ٨٢
(٦١) – پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٣٢
(٦٢)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٥
(٦٣) – حسن بحراوي ، بنية الشكل الروائي ، ص ١٥٦
(٦٤) – پاکیزە رەفیق حلمی ، کوردو ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٢٩
(٦٥)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٥٧
(٦٦)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٦

(٦٧)– سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٩
(٦٨)– امنة یوسف ، تقنیات السرد – فی النظریة والتطبیق ، ص ٨٦
(٦٩)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٣٦
(٧٠)– امنة یوسف ، تقنیات السرد – في النظرية والتطبيق ، ص ٨٩
(٧١)– خلیل شکری هیاس ، سيرة الجبرا الذاتية في البئر الاولى وشارع الاميرات ، منشورات اتحاد الكتاب العرب ، دمشق ، ٢٠٠١ ، ص١٩٣
(٧٢) – پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ١٥– ١٦
(٧٣)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٦
(٧٤)– سەچاوەی پێشوو ، ل ١٤٥– ١٤٦
(٧٥) – خلیل شکری هیاس ، سيرة الجبرا الذاتية في البئر الاولى و شارع الاميرات ، ص ٢٦٨
(٧٦)– پاکیزە رەفیق حلمی ، کورد و ژیانێکی پڕ ئەندێشە ، ل ٣٢
(٧٧)– سەرچاوەی پێشوو ل ٥٢
(٧٨)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٣– ٦٤
(٧٩)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٢
(٨٠)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٦
(٨١)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٥
(٨٢)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩١– ١٩٢
(٨٣)– سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٣٢
(٨٤) – سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٦٣– ٢٦٤

**ملخص البحث**

السيرة الذاتية نوع من انواع النثر الادبي، حيث يسجل الكاتب الاحداث التي مرت به، ويصور تجاربه الخاصة و المهمة في بنية متينة يلقى من خلالها الضوء على حياته الخاصة وتأريخه بشكل مباشر او غير مباشر، في نص ادبي يعرف بالسيرة الذاتية. وكغيره من الاداب يحتل فن السيرة الذاتية صفحة مهمة في صفحات تأريخ الامم وهي موجودة منذ ان وجدت البشرية.

عنوان هذه الدراسة هو (فن السيرة الذاتية في الادب الكردي – پاكزه رفيق حلمى – انمودجا). وهو موضوع لم يدرس دراسة اكاديمية وافية ولما كانت پاكزه رفيق حلمى شخصية بارزة في الثقافة الكردية ولها دور متميز في هذا المجال فقد وقع الاختيار عليها لاجراء هذه الدراسة وهي في صورتها العامة دراسة وصفية، تتكون من مقدمة ومحورين فضلا عن النتائج وثبت بالمصادر المعتمدة الى جانب كتابة ملخصين باللغة العربية والانجليزية.

المحور الاول : يتناول مصطلح السيرة ومفهوها وانواعها وتأريخ ظهورها في الادب الكردي. بينما يبحث المحور الثاني في العناصر الفنية للسيرة الذاتية في بنية نص (الكورد وحياة مليئة بالمعانات لپاكزه رفيق حلمي).

## Absratct

Autobiography is one of the forms of prose in the Literature, and a branch of Biography. The writer records and visualizes his personal experiences in a solid structure. He directly or indirectly sheds light on his history and personal life to produce what is called Autobiography. Like other arts, autobiography occupies an important section in the history of the nations.It existed with the existence of humanity.

Since autobiography is not dealt with academically and perfectly, therefore, this reason motivated me for handling this subject (the art of Autobiography in Kurdish Literature). Pakeeza Rafiq Hilmy is referred to in this research. She is a remarkable figure in Kurdish Culture, and she has a distinctive role in this field.

The study is analytical and descriptive. It contains an Introduction, two sections, conclusions, references, and the abstract in both languages Arabic and English.

The first, section deals with biography as a term, its kinds, and emergence in Kurdish Literature. The second section sheds light on the literary elements of autobiography in the structure of the text (Kurd and a Life Full of Imagination – by Pakeeza Rafiq Hilmy).

# ئەم کتێبەم خوێندەوە
# "دیوانا نەفعی"

**محەممەد عەلی قەرەداغی**
**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی**

ئاواتێکی دێرین و بەردەوامم بووە کە خۆم یان کەسانێکی دیکە بە کۆمەڵ یان تاك تاك بە کتێبخانەکانی تورکیا و سعوودییە و تاران و میسر و ... دا بگەڕایەن و سۆراخی شوێنەواری مامۆستایانی کوردیان لەو شوێنانەدا بکردایەت، ئەم ئاواتەیشم چەندین جار بە نووسین دەربڕیوە بۆ نموونە:

"خۆزگە یەکێکی کارامە، یان ئەگەر بکرێ، کۆمەڵێکی پسپۆڕ و شارەزا کێوماڵێکی ناو کتێبەکانی کتێبخانە گەورە و بچووکەکانی تورکیایان بکردایە و سۆراخی پاشماوە و شوێنەواری مەلایانی کوردیان بکردایە و بە شوێن قوڵاخیاندا بگەڕایەن و ئەنجامی هەوڵ و کۆششەکەیشیان بکردایە بە دیارییەکی گەورە. کە بێگومان کەلێنێکی گەورەی لە کتێبخانەی مێژوو و ئەدەبی کوردیدا پڕ دەکردەوە"[(1)]

**هەروەها نووسیومە:**

"خۆزگە کۆمەڵ و کۆڕێك یان چەند کەسێکی جیاجیا دەکەوتنە کێوماڵ و پشکنینی کتێبخانەکانی تورکیا و شوێنەوار و بەرهەمی مامۆستایانی کوردیان بۆ دەدۆزینەوە!"[(1)]

ئەم خۆزگە و ئاواتەم بۆ خۆم بە نووسین دا بە ئەکادیمیای کوردی، کە ئەندامی کارام تیایدا و یەکێکیش لە ئامانج و مەبەستە سەرەکییەکانی ئەو ئەکادیمیایە ئەو خۆزگەی منە، بەڵام داواکەم پشتگوێ خراو سێ کەس لە لیژنەی دەستخەت ـ کە من خۆم ئەندامم تیایدا و یەکێکیش لەو سیانە لاوەکیی بوو ـ لە

ڕێگەی ئەکادیمیاوە نێرران بۆ تورکیا بۆ ئەو مەبەستە. بە هەر حاڵ لیژنەکە چوون و گەڕانەوە و چەند کتێبی چاپی کۆن و وێنەی چەند دەستخەتیان لە تەك خۆیاندا هێنابووەوە.

دوای گەڕانەوەیان د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا هەواڵی (نەفعی) لێ پرسیم و وتی: دیوانی نەفعیمان هێناوەتەوە کە خەڵکی سلێمانییەو، دیوانەکەی بە کوردی و فارسی و تورکییە، من بێ گوێدان بە هیچ وتم: ئامادەم کار لە بەشە کوردییەکەیدا بکەم.

دوای ماوەیەك زانیم ئەو دیوانەیان داوە بە مامۆستا تەحسین دۆسکی بۆ لێکۆڵینەوەی. دووبارە لە خەمخۆریی خۆم و دڵسۆزیم بۆ کەلەپوورەوە، بە نووسین د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیام ئاگادار کردەوە کە ئەو کارە کاری مامۆستا تەحسین نییە و ناتوانێ وەك پێویست ئەنجامی بدات. کەچی زۆری پێ نەچوو ڕۆژێك لە کۆبوونەوەدا (دیوانا نەفعی) لە تەك دوو کتێبی دیدا بەسەر ئەندامانی ئەکادیمیادا دابەش کرا.

بەڵێ منیش نوسخەی خۆم وەرگرت و دەستم کرد بە لاپەڕە هەڵدانەوە، بەداخەوە وەك چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت دیوانێکی وا نایاب بەشێوەیەکی شیاو بخرێتە کتێبخانەی کوردییەوە وا نەبوو!

بۆیە بە پێویستم زانی زۆر بە کورتی ئەو کارەی بۆ ئەو دیوانە کراوە هەڵبسەنگێنم و سەرنجی خۆمی لەسەر دەرببڕم.

## دیوانا نەفعی

ئەم دیوانە لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردییە ساڵی ٢٠١٠ چاپ بووە، لە چاپخانەی (سپیرێز) لە دهۆك چاپ کراوە، قەوارەی دیوانەکە ئێرەتی ـ عادەتییە.

لەسەر بەرگەکەی نووسراوە:

دیوانا نەفعی، ساخکرن و بەرهەڤکرن تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، مەسعوود خالد گولی، هەولێر ٢٠١٠، ٢٦٠ لاپەڕەیە.

بەشی کوردی ـ بە سۆرانی و گۆرانی ـ یەوە، لە سەرەتاوە دانراوە، دوای ئەوە پشکا عەرەبی هاتووە کە (٩) پارچەیە بە روباعی و پارچەوە، لەم بەشەیشدا وەك بەشی پێشوو پەیڕەوی ڕێبازێکی دیاریی نەکراوە و، ژمارەیش بۆ پارچە شیعرەکان دانەنراوە.

دوای ئەمەیش لە لاپەڕە (٥٩)وە (پشکا فارسی) دانراوە، ئەم بەشە تا ل: (١٨٩) دەگرێتەوە. ئەم بەشەیش پەیڕەوی هیچ ڕێبازێکی باوی لێکۆڵینەوەی دیوانی شاعیرانی کلاسیکی تێدا نەکراوە، نە پارچەکان بەپێی پیتی هیجا پۆلین کراون، نە بابەتەکانی ستایش و، پیاهەڵدان و، نامە و.... جیاکراونەتەوە. نە ژمارەیش بۆ پارچە شیعرەکان دانراوە.

دوای ئەمەیش (پشکا تورکی) دێت و تا لاپەڕە (٢٣٢) دەگرێتەوە و، ئەمیش وەك سێ بەشەکەی پێشوو پەیڕەویی ڕێبازێکی ناسراو و دیاری تێدا نەکراوە.

دوا بەشیش (چەند وێنە ژ دەستنڤیسا دیوانا نەفعی)یە، ئەم بەشەیش لە (٢٥٠)دا تەواو دەبێت.

وابزانم ئەوەندە بەسە بۆ ئەوە کە بزانین ئەو کارەی بۆ دیوانی نەفعی کراوە کارێکی ئەکادیمی و زانستییانە نییە و، پێویستە جارێکی دی و بە باشی کار بۆ لێکۆڵینەوەی سەرجەمی دیوانەکە بکرێت.

هەروەها وا دەزانم بەم هەڵسەنگاندنە کورتەی بەشی کوردییەکە دەردەکەوێ کە ئەوانەی کاریان بۆ دیوانەکە کردووە پەیڕەویی ڕێبازی زانستیی و لێکۆڵینەوەی دروست و بە بەرنامەیان نەکردووە و، ئەوەیش بەسە بۆ ئەوەی لەو چاوەوە بۆ

بەشەکانی: عەرەبی و فارسی و تورکیش بڕوانرێت و، بەو پێودانە مامەڵەیان لە تەکدا بکرێت.

هەر بەو چەند نموونەیش هێنامنەوە دەردەکەوێ ـ بە ئارەزوو یان بە نەزانیی ـ دەسکاریی دەقەکە کراوە و بە ئەمانەتەوە نەهێنراوەتەوە سەر ڕێنووسی کوردی و، دەبێ بە گومانەوە بۆ ئەو لایەنەیش لەکاری لێکۆڵینەوەی دیوانی نەفعی بڕوانرێت.

لێرەوە لاپەڕە هەڵدەدەمەوە و دەچمە ناو دیوانەکە ـ وەك وتم ـ تا بە کورتیی بەشە کوردییەکەی هەڵبسەنگێنم:

- سەرەتا بەڵگەی ئەوەی کە مامۆستا تەحسین و مەسعوود خالید پیاوی ئەو کارە نەبوون، لەسەر بەرگی کتێبەکە دەردەکەوێ، چونکە بێگومان مامۆستایەکی ئەدیبی خەڵکی سلێمانی بە دیوانی شیعری خۆی ناڵێ (دیوانا نەفعی). کە بەرگەکە هەڵدەدەیتەوە دەبینین پێشەکی دیوانەکە بە زاراوەی کرمانجی ژووروو نووسراوە. مەبەستم لەم قسەم ئەوە نییە کە ـ خوا نەخواستە ـ بە چاوێکی دی یان بە جۆرێك بۆ زاراوەی کرمانجی ژووروو یان هەر زاراوەیەکی تر بڕوانم. بەڵکو بوونی ئەو زاراوانە جێگەی خۆشحاڵی و مایەی دەوڵەمەندیی زمانی کوردییە و، زاراوەکانی کرمانجی و گۆرانی و زازایی و لوڕی و فەیلی و .... سەرچاوەگەلی دەوڵەمەندی زمانەکەمانن، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە هەر کەس بەپێی توانای خۆی و لەبواری هێزی خۆیدا کار بکات و، کارگەلی شیاو ئەنجام بدرێت و، بەتایبەتی لە کاری ئەکادیمی و کتێبگەلێکدا کە لە ئەکادیمیا دەرچن شپرزەیی و هەڵپڕووکاوییان پێوە دیار نەبێت و، بەرهەمەکان لە ئاستی ئەو ناو و شوێنەدا بن لێیەوە دەردەچن.

بەداخەوە دیوانی نەفعی هیچکام لەو مەرجانەی تێدا نییە و وەك لەمەولا روونی دەکەمەوە کارێکی نابەکام و هەڵپرووزاوو بێ نرخە. بەڵکو من وای بۆ دەچم ئەگەر پێشتر پێم بزانیایە ڕێگەی بڵاوبوونەوەیم نەدەدا و، بڵاوبوونەوەکەی زۆر لە پلە و ڕێزی ئەکادیمیا دێنێتە خوارەوە کە ڕێگەی تێدا دراوە شتی بەو شێوە بەرەو چاپخانە بەڕێ بکرێت.

- خەبیر، پسپۆڕ:

ئەوەی من ئاگادارم و لیژنەی کتێب لە ئەکادیمیای کوردی پەیڕەوی دەکات، دەبێ هەر کتێبێك بێتە ئەکادیمیا بۆ چاپکردن یان یارمەتیدان، پێش هەموو شتێك ـ بەلای کەمییەوە ـ بدرێت بە دوو خەبیر و رای خۆیانی لەسەر بدەن. جا ئەگەر رای هەردووکیان ئەرێ و (بەڵێ) بوو بۆ چاپکردنی، ئەوا کتێبەکە رێگەی چاپ دەگرێتەبەر، ئەگەر (نەء) بوو ئەوە دەدرێتە دواوە، خۆ ئەگەر راکانیش جیاواز بوون ـ ئەرێ و نەرێ بوون ـ ئەوە کتێبەکە دەدرێ بە خەبیری سێیەم و رای ئەو بەهەر لایەکیاندا بوو ئەوە پەسەند دەکرێت.

بۆ کتێبێکی وەك دیوانی نەفعی ئەم پرسیارانە دێنە پێشەوە: ئایا ئەم کتێبە دراوە بە خەبیر؟ ئایا ئەو خەبیرە خوێندوویەتیەوە؟ ئەگەر ئەو خەبیرە خوێندوویەتیەوە رای لەسەری چی بووە؟ چەند پرسیاری دیش. بەڕای من ئەم کتێبە یان نەدراوە بە خەبیر یان خەبیرەکە نەخوێندەوار بووە، یان هەر نەیخوێندوەتەوە و تەماشای نەکردووە و بێ سێ و دوو (ئەرێ)ی چاپیان داوەتێ! ئەگەر وانەبێ چۆن ئەم کتێبە بەم شێوە کە لەم کورتە هەڵسەنگاندنەدا دەیبینی رێگەی چاپی پێدراوە؟

**پێشەکیی کتێبەکە:**

پێشەکیی ئەم کتێبە بەو زاراوەی پێی نووسراوە ناتەوانایی مامۆستایان تەحسین دۆسکی و مەسعوود خالید گولی بەسەر ئەم کارە و ئەم کتێبەدا نیشان دەدات، چونکە ئەم کتێبە بە کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبییە، کوردییەکەیش زاراوەکانی گۆرانی و سۆرانی. ئەگەر مەبەست لە پێشەکی دەستگرتنی خوێنەر بێت بۆ رێنوماییکردنی بۆ لای ناوەرۆکی کتێبەکە دەبێ بە زمان و زاراوەیەك بێت کە خوێنەر لێی تێبگات، کە ئەمەی ئێرە وانییە.

ئەگەر لەوە بگوێزمەوە بۆ خاڵێکی دی دەڵێم: کە ئەم دیوانە ـ هەر چەند لەسەر بەرگەکەی نووسراوە (ساخکرن و بەرهەڤکرن) ـ لێکۆڵینەوەی بۆ نەکراوە و، بابەتەکانی بە پەراوێز دەوڵەمەند نەکراون و، جێگەی باس و مەبەستەکانیان

تێدا روون نەکراوەتەوە .... دەبوو هیچ نەبێ پێشەکییەکی دەوڵەمەندی بۆ بنووسرایەت و ئەو لایەن و مەبەستانەی تێدا روون بکراینەتەوە.

بۆ نموونە دەبوو لە پێشەکییەکەدا ئەوە روون بکرایەتەوە کە ئەوان چییان بۆ لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی ئەم دیوانە کردووە.

بەهۆی ئەوەیشەوە کە ئەمەیان نەکردووە کۆمەڵێك رەخنە و سەرنجیان لەسەر خۆیان بار کردووە لەوانە:

١ـ دەبوو بەرنامەیەکی دیاریان هەبوایەت بۆ رێکخستنی پارچە شیعرەکان، بۆ ئەمەیش لە دیوانە کلاسیکییەکاندا پەیرەویی پیتی هیجای عەرەبی (أ، ب، ت) دەکرێت. بەڵام ئەمان نەیانکردووە.

٢ـ ناوی چەندین کەس لە پێشەکییەکە و خودی دیوانەکەدا هاتووە دەبوو بە پەراوێز روون بکرایەنەوە، بۆ نموونە خوێنەر چووزانێ عەلی رەزا، عیصمەتی، فایەق، صەفوەتی، شاکیر... کێن؟

٣ـ شاکیر بە دوو قۆلیی لە تەك (نەفعی)دا شیعریان وتووە دەبێ کورد و هاوچەرخی نەفعی بووبێت، باسی نەکراوە.

٤ـ کە لە لاپەڕە ١٦٦دا باسی (خضر ذو فنون) دەکات کە پارچەیەك شیعری بە ناوی (فەتحییە) یان (سوورنامە) نووسیوە وا دیارە بۆ مەحموود خانێکی نووسیوە. گومانی زۆر بۆ ئەوە دەچێت ئەو (خضر ذو فنون) مەلا خدر ـ خضر ـ ی نالی بێت. دەبوو ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکرایەت و بەڵکو لەمەولا ئەو فەتحییە نایابە بدۆزرێتەوە.

٥ـ کە باسی ئەوە دەکەن پارچەیەك شیعری فارسیی بڵاونەکراوەی نالی لە دەستخەتەکەدا هەیە، ئەوە هەلێکی باش بوو ئەو پارچە شیعرەیان لە شوێنێکی دیوانەکەدا ـ با بە پەراوێزیش بێت ـ بڵاو بکردایەتەوە.

٦ـ روباعی عەرەبی ل: ٥٤ لەوانەیە بۆ شاعیرێك نووسرابێت کە نازناوی (روحی) بووە، ئەمەیش پێویستی بە ئیشارەیە.

٧ـ هەروەها روباعی ل:٥٣ دیارە بە بۆنەی لەدایکبوونی کوڕێکەوە گوتراوە کە ناوی (محمد الراشد) یان (سعود محمد الراشد)ی بۆ دانراوە دەبوو ئاماژەی بۆ بکرایەت.

٨ـ پارچەی ل:٣٢ کە لەسەری نووسراوە (جەوابا نالی) لـە دەسـتخەتەکە ئـەوە وەرناگیرێ کە ئەو پارچە شیعرە وەڵامی نالی بۆ نـەفعی بێـت و نـاوی (نـەفعی) لـە پارچە شیعرەکەدا نەهاتووە، لەوانەیە بۆ کەسێکی دی وتبێت و، لەوەیش دەچـێت نالی لەو کاتەدا لە شام بووبێت و کەسێکی کورد زوبان هاتبێت بۆ لای و دڵـی پێـی کرابێتەوە. هەروەها دەبوو ئەو پارچە شیعرە لە پـەراوێزی دیـوانی (نـەفعی)دا لـە تەك روونکردنەوەی ئەم مەبەستەدا بنووسرایەت.

٩ـ کە دیوانی مەولانا خالید لە دەستدایە و باسی شـیعری مـەولانا کـراوە بـاش وابوو ئاماژە بۆ دیوانەکەی بکرایەت.

جگـە لـە تێبینییانـەی پێـشوویش سـەرنج لەسـەر کـاری لێکۆڵینـەوەی دیـوانی نەفعی زۆرە و، دەگونجێ چەند خاڵی دی ریز بکەم، بەڵام بە کورتی ئـەم خاڵانـەی خوارەوە دەخەمە روو:

١ــ ئـەو کەسـانەی خوێندنـەوە و هێنانـەوە سـەر رێنووسـی دەقـی دیوانەکـە ـ دەستخەتەکەــیان گرتووەتـە ئەسـتۆ شـارەزایییان لـە خوێندنـەوەی دەسـتخەتی کۆندا نەبووە. لەتەك ئەوەیشدا ئەم دەستخەتە بە نووسـینێکی تـا ئەنـدازێکی زۆر جـوان و روون نووسـراوەتەوە و، خـەتی شکـستەی تێـدا بەکارنـەهێنراوە، ئـەو بەرێزانە کەوتوونەتە هەڵەی زۆر زەق و ئاشکراوە، بـۆ نموونـە لـە هەنـدێ جێگـەی دەسـتخەتەکەدا وشـەی (دل) تۆزێـك بـە تێکـەڵاویی لـەنێوان (د) و (ل)ەکـەدا نووسـراوە، کەچـی ئـەوان ئەمـەیان لێ ئـاڵۆزاوە و هــەرجارەی بەشـێوەیەك خوێندوویانەتـەوە و ـ بـەزۆریی ـ کردوویانـە بـە (مـن) و، لـە پارچـەکەی (نـالی)دا (ذەوقم)یان لێ تێکچووە و کردوویانە بە (خۆ "قوم").

هەروەها لە نووسینی کۆندا کاتێك بنووس پـاش و پێـشێکی لـە نووسـینەکەیدا کردبێت هاتووە بۆ سەر گرتنەوەی ئەو هەڵەیـە دوو پیتـی (م) و (خ)ی دانـاوە (م) بـۆ (مقـدم = پێـشکەوتوو)، (خ) بـۆ (مـؤخر = دواکـەوتوو)، ئـەمان ئەوەشـیان نەزانیوە و، خۆیشیان پێیان لەو نەزانینە ناوە و لە ل: ١٥٨دا ئەمە روونە.

٢ـ لە دیوانی شاعیرانی کلاسیکیدا ـ بـەزۆریی ـ بـاو وایـە شـاعیر لـە چـامەکەدا لــەدوا بەیتــدا نــاوی یــان نازنــاوی خــۆی دەنووســێ، کــاتی لێکۆڵینــەوە یــان

بڵاوکردنەوەی دیوانی ئەو شاعیرانە ئەو نازناوە دەخرێتە نێو دوو کەوانەوە، بۆ دیوانی نەفعی ئەمە نەکراوە.

٣ـ نیشانەکانی تەرقیم و فاریزە - وێرگول - و سەرسووڕمان و پرسیار و جووتخاڵ... زۆر کەم پەیڕەویی کراون.

٤ـ چەند کەم سوود لە سەرچاوە بۆ کاری ئەم دیوانە بینراوە. ئەو سەرچاوە کەمانەیش لە کۆتایی دیوانەکەوە دیاریی نەکراون و، خوێنەر نازانێ بۆ ئەم لێکۆڵینەوە سوود لە چ سەرچاوەیەك وەرگیراوە.

٥ـ ئەم دیوانە بە چوار زمانە، بۆ هیچ کام لەو زمانانە لێکدانەوە و ماناکردن دیار نییە، هەروەها فەرهەنگۆکیش بۆ هیچ زمانێکیان نەکراوە.

٦ـ کە باسی دەستخەتی دیوانی نەفعی کراوە دەبوو باسەکە دەوڵەمەندتر و تێر و تەسەل بوایەت و، فیهرەستی دەستخەتەکە بنووسرایەت و، بەرهەمی چەند شاعیری تێدایە باس بکرایەن و، تەنانەت سەرەتای پارچە شیعرەکانیان دیاریی بکردایەت، بەمە یارمەتیی کەسانی دییان دەدا کە دەیانەوێ لە سەر بەرهەمی یەکێك لەو شاعیرانەی شیعریان لەو دەستخەتەدا هەیە کار بکەن.

٧ـ لە بابەتەکانی شیعری نەفعی دا باسی شیعری نیشتمانییان نەکردووە کەچی نەفعی شیعری ئەو بابەتەیشی هەیە و، دووری وڵات دڵ و دەروونی سووتاندووە:

دڵ وەکو پەروانە سووتاوە لەبەر دووری وڵات
ڕۆژ و شەو ئیشم هەموو گریانە غەم نادا نەجات

